خاوەنی ئیمتیاز

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم



سەرنووسەر هیوا قادر

گرافیك دیزاینر ئارام عەلی

ساڵی دووەم

ژمارە

6

adabiserdam@yahoo.se

نرخ 3000 دینار



## دوو چیرۆك دوو چیرۆكنووس

شێرزاد حەسەن و ئۆ. هێنری

## شیعر

داستان بەرزان



## ئەزموون

سەباح ڕەنجدەر



## گفتوگۆ

نەجیب مەحفوز

## لێكۆڵینەوە

بەیان سەلمان

## چیرۆك

ئارام کاکەی فەلاح

ڕەووف بێگەرد

توانا ئەمین

جلال ئال ئەحمەد

باران

فەرهاد موستەفا

پشتیوان هەڵەبجەیی

مارگرێتا ئێکستروێم

## ئەدەبی سویدیی

کەتەرینا فرێستینسۆن

## ئەدەبی فارسی

مەحمود مۆتەقیدی

## شاعیران و نووسەرانی دوای ڕاپەڕین

ڕێبین ئەحمەد خدر

## ئەدەبی نامە

لازۆ



# دوو چیرۆك و
# دوو چیرۆكنووس

**بۆ دوو چیرۆك و دوو چیرۆكنووس؟**

لە ژمارە دووی گۆڤاری ئەدەبی سەردەمەوە و دواتریش تا رادەیەك بەشێوەیەكی بەردەوام بۆ هەر ژمارەیەك داوامان لەیەكێك لە چیرۆكنووسە دیارەكانی ناو دنیای ئەدەبی كوردی كردووە، كە یەكێك لە باشترین و خۆشەویسترین چیرۆكی خۆیمان بۆ بنێرێت، لەگەڵ چیرۆكی چیرۆكنووسێكی تردا كە لە یەكێك لە هەستیارترین قۆناغەكانی نووسینیدا كاریگەری گەورەی لەسەر بیركردنەوە و ئەزموونی داناوە؛ لە هەمان كاتدا داواشمان لەو چیرۆكنووسە كوردە كردووە بۆمان بنووسێت بۆچی ئەو چیرۆكەی خۆی لەناو هەموو چیرۆكەكانی تردا بەتایبەت و سەركەوتوو ئەزانێت، لەهەمانكاتیشدا هۆكاری هەڵبژاردنی چیرۆكی ئەو چیرۆكنووسەی تریشمان بۆ باسبكات. ڕەنگە ئەم باسكردنە هەندێك نهێنی لەگەڵ خۆی بهێنێت و هەندێك جاریش لەگەڵ تێڕوانینی ڕەخنەگراندا یەكنەگرێتەوە، بەڵام دیدێكی ئینسانی تر و خوێندنەوەیەكی ترمان ئەخاتە بەردەم كە ڕەنگبێت ئێمەش وەك خوێنەر لە كاتی خوێندنەوەی ئەو بابەتانەدا دركی پێنەكەین؛ دیارە ئەم پڕۆسەی بەقسەخستنەش هەم ئێمە زیاتر ئاشنای ئەزمونی هونەریی و ئینسانی ئەو چیرۆكنووسە ئەكات، هەم ئەم كارەش ڕەنگە هێندەی خودی بەرهەمە نووسراوەكە سود بە پڕۆسەی نووسین و خوێندنەوە بگەیەنێت.





# دونیای داهۆڵەکان.. بۆ؟

شێرزاد حەسەن

*دوو جۆر نووسین بۆ من وەك یەك گرنگییان هەیە. یەکەمیان نووسین لە دەرەوە، واتا لەسەر کاغەز، دووەمیان کە دەکرێت قۆناغێکی زۆر دوور و درێژتری بوێت: چەندین ڕۆژ و مانگ و ساڵ، نووسینێکە لە ناوەوەڕا، کە جۆرێکە لە تێڕامان لە ڕۆحی ئەو دەقەی کە نیازە بینووسین، پتر لەو کۆرپەیە دەچێت کە ژنەی دووگیان نۆ مانگی دەوێت تاوەکو دوای بەرە ژانێکی کوشندە دێتە دونیاوە.





کەم چیرۆك و رۆمان هەیە نووسەرەکانی شەونخونییان پێوە نەچەشتبێت، گینگڵ و ژان و ژوری زۆر، چاوەڕوانی و دالغەی بەردەوام، وردبوونەوە و تێڕامان لە ڕەگەزە پێکهاتووەکانی: سەرەتا و کۆتایی، تێما، ململانێ، کارەکتەرەکان، پاڵەوان و دژە پاڵەوان، گرێچن و تانوپۆ، کات و شوێن...هتد.

"گەڕەکی داهۆڵەکان" لە بنەرەتدا کەڵکەڵەی من بوو بە نیازی ئەوەی تابلۆی ولاتێك، خاکێك.. بگرە دونیایەك رەسم بکەم کە پڕ بووە لە داهۆڵ، کە ئەویش هەر جۆرێکە لە بە دەعەجانی بوون، ئەو خەیاڵەی بە داهۆڵبوونی مەملەکەتی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی هەشتاکان، بە واتا پێش راپەرین، کە وا مەزەندە دەکەم نەگۆڕاوە، هەر بۆیە دواتر و پاش راپەڕین چیرۆکی "تووتیستان" لە دایك دەبێت.

"گەڕەکی داهۆڵەکان" هەرگیز لە چیرۆکەکانی دیکەم خۆشەویستتر نییە.. بەڵام تایبەتمەندی خۆی هەیە لای من، گەرچی ئەوەش بەو مانایە نایەت کە چیرۆکەکانی دیکە تایبەتمەندی خۆیان نییە، ڕەنگە تەنها خاڵێکی گرنگ ئەوە بێت دوای کۆمەڵە چیرۆکی " تەنیایی" و " گوڵی رەش" قۆناغێکیتر هاتە پێش کە ئەویش بازدانێك بوو بەرەو فانتازیا، پەنابردن بۆ خەیاڵ و فانتازیا بۆ هەمیشە لە واقیعێکەوە سەرچاوە دەگرێت کە کوشندە و ئاڵۆزە، ساختمانی چیرۆکەکە نوقمی فانتازیایە، سەرباری رەهەندێکی رەمزی و شیعرئامێز، یەکێك لە هۆکاری بەخشینی فەزایەکی ئەفسانەئامێز بەو دەقە نیازێك بووە بە شاردنەوەی مانایەکی پەیوەست بە جەنگەوە، بەڵام وێنەی یەکەمی ئەم چیرۆکە بۆ یادەوەری سەردەمی منداڵی خۆم دەگەڕایەوە، یادێکی تاڵ و جەرگبڕ، کە دواتر وێنەی دووەمی هاتە سەر کە پەیوەندیدار بوو بە جەنگی هەشت ساڵەی "ئێران ـ عێراق"ەوە، بە واتا لێکدانی دوو وێنە تا وێنەیەکی سەربەخۆ دروست بکەم

که هەر دوو وێنەکەی لە خۆیدا بەرجەستە کردبێت.
چیرۆکی "گەڕەکی داهۆڵەکان" سەرەتا ناوی داهۆڵەکان بوو. ڕەنگە وەختی نووسینەکەی چەند سەعاتێکی خایاندبێت، بەڵام قۆناغی نووسینی لە ناوەوەڕا ساڵانێکی زۆرتری ویست، ڕەنگە یەکێك بووبێت لەو چیرۆکانەی کە لە دوای خوێندنەوەی چیرۆك و ڕۆمانی میللەتانی دیکە خەونم بووبێت بینووسمەوە، زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێم لە تافی لاویدا بووم، واتا ناوەراستی حەفتاکان.
بۆچی گەرەکمە باس لە ناوەرۆك بکەم؟ چونکە رۆحی دەقەکانی من وێنەیەکە، ڕووداوێکە، تێمایەکە یان بابەتێکە، جار هەبووە ڕستەیەك بووە کە ڕاگوزەری گوێم لێبووە، یان ڕووخسارێکە، بەڵام رۆحی چیرۆك وا لە ناو وردەکارییەکانی گێڕانەوەدا کە بۆ نووسین و خوێندنەوە کەمەندگیرمان دەکات. هەمیشە خەونم بەوەوە دەبینی کە بتوانم رۆژێك بێت ئەو ئازارەی بۆ چەند رۆژێك چەشتم بینووسمەوە، ئایا چ چێژێك لەوەدایە کە دیسانەوە ئەو ئازارە بنووسمەوە کە ژانی خستۆتە دڵمەوە؟ بۆ من نووسین نزیکترین شتێکە کە لە خوێن بەربوون دەچێت، برینێك کە خوێن لێ چۆڕانەکەت پێرانەگیرێت، بۆ من هەمیشە منداڵی چاوگە بووە، هێمنگوای واتەنی: منداڵییەکی بەدبەخت بۆ نووسەر جێگەی بایەخە. دەکرێت وەك رامبۆ و بۆدلێر بۆی دەچوون: بلیمەتی بۆ خۆی گەڕاندنەوەی منداڵییە بە دەستی ئەنقەست یان بە زۆر، دەکرێت هەمان ئەم ڕستەیە هەڵگێڕینەوە بەم شێوەیە کە منداڵی بۆ خۆی گەڕاندنەوەی بلیمەتییە بەزۆر یان بە دەستی ئەنقەست.
من لە زۆربەی چیرۆکەکاندا هەوڵێکی لەو چەشنەم داوە، بەڵام تاوەکو هەنووکە هەر وەك ئەزموونکارێك ئەو ڕەنجەم داوە بێ هیچ بانگەشەیەك بۆ بلیمەتی یان هەتا سەرکەوتنێك لە گەڕاندنەوەی ئەو قۆناغە خۆش یان ناخۆشەی منداڵی، دیارە هەقایەتە ناخۆشەکان منیان پتر هانداوە کە مکوڕ بم لەسەر ئەوەی ئەو سەرگوزشتە تاڵانە ڕاو بکەم.
هەشت.. یان نۆ ساڵ دەبووم بیرم لەوە دەکردەوە کە چۆن دایکم دڵخۆش بکەم و کەمێك پارەی بۆ پەیدا بکەم، چونکە بابم بە گەمەی دۆمینە و تاوڵە یان بیست و یەك بۆ هەمیشە بێ پووڵ بوو، هەمیشە وشەی "نیمە یان نیتم" وەڵامێکی کورت و رۆژانەی ئەو بوو بۆ داواکانی دایکم تاوەکو لە ژەمەکاندا پاروویەکی گەرم بخاتە ناو زاری کچەکان و کوڕەکانی.
راستی کزۆڵەیی خۆم و شەڕی بەردەوامی هەردووکیان هانی دام







که دوو عانه پەیدا بکەم، زۆربەی کوڕیژگەکانی گەڕەك کە لە من گەورەتر و هەندێکیان هاوزام بوون جۆرەها ئیش و کاریان دەدۆزییەوە، منیش سایلی ئەوان حەزم بوو کارێکم دەست بکەوێت، بە تایبەتی هاوینان کە سێ مانگ پشوومان هەبوو.. خۆشی لە خۆمان کە نەدەچووینەوە قوتابخانە.

کوڕەکانی دەرودراوسێ زانییان کە مەراقمە ببم بە پیاو و ئیشێك بکەم: قاپشۆری لۆقنتەکان هەبوو، قوڕکاری، شوانی، فرۆشتنی چلورە یان شرووب لە تەك شاگردی هەموو جۆرە پیشەکانی دیکە، وەك سەرتاشین، دارتاشی، ئاسنگەری...هتد.

گەرچی من سالانێك دواتر خۆم لە قەرەی هەموویان دا، بەڵام یەکەمین کارم کردمی بە داهۆڵ یان داوەڵ یان داوەر کە هەندێك جار ناوی دیکەشی لێدەنرێت.. هەتا لە هەندێك ناوچەدا بووکەسەماکەرەشی پێدەوترێت کە زۆر جیاوازە. بۆ هەمیشە خۆم لە تەمەنێك کە هێشتا فەراقە نەبووم "داهۆڵەکان" ناو باخ و بێستان و کێڵگەکان سەرسامی دەکردم، زۆر درەنگتر زانیم کە بۆ ترساندنی چۆلەکەکان و گشت مەلەکان چەقێندراون. ئەی من خۆم بۆ بووم بە داهۆڵ .. ئەوەیان چۆن ڕوویدا؟

لە سنووری ڕۆژهەڵات و باشووری گەڕەکەکەی ئێمەدا کە کەوتبووە دەرەوە و دووری شار هەر هەمووی باخ و بێستان بوو، وەختی تۆوکردن باڵندە زۆر و زەبەندەکانی ئاسمان پۆل بە پۆل دەهاتن و جۆرەها دانەوێڵەیان دەخوارد، بێجگە لە هەڵاڵە و چرۆ و گوڵی دار و درەختەکان تا دەگات بە جوزەرەی بن پەردوو. کوڕێکی دراوسێمان بە تەنگەتاوی هات و هەواڵی بۆ هێنام کە یەکێك لە خاوەن باخ و بێستانەکان بە دوای چەند کوڕیژگەیەکدا دەگەڕێت کە بتوانن باخ و بێستانەکەی بۆ پاس بکەن تاوەکو مەلەکان توخنی نەکەون و ماڵوێرانی نەکەن، چ وەختی تۆوکردن چ ئەو کاتەشی کە هەندێك لە درەختە بەردارەکان چرۆ دەردەکەن، ئیدی من و چەند کوڕێکی لە خۆم جیقنتر خۆمان ئازا کرد و بە خۆ کەوتین... یەڵلا با بڕۆین.

سەرەتا ئاسان بوو.. خاوەنی باخ و بێستان ئێمەی بردە سەر کێڵگەیەك کە چەندین

قوتووی بەتاڵی پێ پڕ کردین لە وردە بەرد، رینمایی کردین کە تا دەمەو پاش نیوەڕۆ لە تەك داهۆڵەکاندا کە بۆ ترساندنی چۆلەکە و جۆرەها باڵندەی دیکە چەقێندرابوون، وەستاین، دیار بوو مەلەکان شەرمیان لە داهۆڵەکان نەدەکرد، ئێمەی مێرمنداڵ ببووین بە جێگرەوەی داهۆڵەکان، هەر واش بوو تا بانگی عەسر بە دەم قاو و قیژەوە قوتووە پڕ لە بەردەکانمان هەڵدەشەقاند تاوەکو هیچ یەکێك لە مەلەکان زات ناکات بنیشێتەوەو زیان بە خاوەن باخ و بێستانەکە بگەیێنێت. رۆژی یەکەم تێپەڕی و هەر یەکەمان نیو درهەمی خستە گیرفانی، دووەم رۆژ ژمارەیەکمان بەزین و هەڵاتن، لە سێیەمدا هەندێکمان بوورانەوە، چونکە هەم برسی و هەم ڕیوەڵە بووین، یەکێك لە هۆشخۆچووەکان من بووم، بەڵام نیو درهەمەکەم هەر حەڵاڵ کرد چونکە لە دوا سەعاتدا و لە ئەنجامی راشەقاندنی قوتووەکان، لە ژێر هەتاوێکدا کە پێستی سەرمانی دەبرژاند من و یەك دوانێك بووراینەوە، وەلێ بە هەق دۆزەخمان بە چاوی خۆمان بینی، ئەوەی منی جیر و راوەستاو هێشتەوە ئەو کرێ و دەستهەقە بوو کە دڵی دایکم پێخۆش دەکرد، لەو لاوە ئاسوودە بووم کە دایکم و ژنان و کچان و هەندێك لە پیاوانی دەر و دراوسێ دانیان پێدا نا کە من بووم بە پیاو.

کەچی ڕاستی هەستم کرد من و هاوڕێکانم ببووین بە داهۆڵ، چونکە جومگەکانی لەشمان لەوەدا بوو لێکدی بترازێن، سەر و سیما و سیپاڵی هەلاهەلامان شێوەی داهۆڵێکی بێ گیانی بە ئێمە بەخشیبوو. بگرە من خۆم بەغیلیم بەو داهۆڵەی تەنیشت خۆم دەبرد کە هەستی بە برسییەتی و گەرما نەدەکرد، لە چوارەمین رۆژدا تەنها ژمارەیەکی هەراشتر لە ئێمە مانەوە کە ئێواران دەهاتنەوە بە تەواوی خۆیان ببوون بە داهۆڵ. پتر لە "**30**" سی ساڵ خەونم بوو کە ئەو بە "داهۆڵبوون"ە بکەم بە چیرۆکێك، بە تایبەتی کە دواتر ورد بوومەوەو لە پەروەردەکردنی خۆمان ڕامام لە ناو خێزان و مەکتەب و مزگەوت و سەربازخانە و حیزبدا دەرکم بەوە کرد کە هەر بە ڕاستی ئێمە وەك داهۆڵ و تووتی پەروەردە دەبین، هەرچی خەسڵەتی مرۆڤی ڕەسەن و ڕاستەقینە هەیە لە ئێمەی دادەماڵن.

کەچی بیرم لەوە دەکردەوە کە هەقە چاوەڕێ بم تا خۆی وەك خەونمە لە دایك دەبێت، لە دواتردا ئاشنا بووم بە رۆحی فانتازیا و هەستم کرد بۆ زەخمی ئەو بابەتە پێویستم بە خەیاڵێکی باڵا و فانتازیا هەیە کە لە گێڕانەوەی کۆپیکار و





مردووانەی ئەو واقیعە ناشیرینە رزگارم بکات.. هەر واش بوو.
بەڵام ئەوەی کە فریام کەوت ئەو چیرۆکە لە دایك بێت، دیمەنێکی دیکە بوو کە لە ناوەراستی ساڵانی هەشتاکاندا بینیم، لە گەرمەی جەنگی "ئێران ـ عێراق" دا، کە بە ڕێکەوت ڕێم کەوتە نزیك بە "خەستەخانەی رەشید" لە بەغدا کە بیمارستانێکی سەربازی بوو، ئێوارەیەکی درەنگ کە داڕژانی چڕی تاریکی مەردوومەکانی دەکرد بە تارمایی، بە درێژایی ئەو شەقامە کە دەچۆوە ناو خەستەخانەکە بە سەدەها سەربازی کەمئەندامم بینی کە سەر و گویلاکی بە خامی سپی پێچراویان چیرۆکی خوێناوی ئەو جەنگەیان دەگێڕایەوە، کە ئەو دیمەنەم بینی هەستم کرد کە دەکرێت ئەو زامدارانە لە هاوڕێ کوژراوەکانیان بەختەوەرتر بن، کە زۆر جاران لە ناو تابووتەکاندا چەند پارچە ئێسقان و گوشتی بۆگەن و چنراو ڕادەستی داك و باب و کەس و کاریان دەکرانەوە. ژمارەیەکی زۆرتر بەسەر چوارچەرخەوە، لارە مل، کەسانی نزیك بە خۆیان پاڵیان پێوە دەنان، بە سەدەهاش لەو ناوەدا بە یارمەتی دارشەقەکانەوە هەنگاوی سستیان دەنا، کە لە ناو تەم و تاریکیدا لە سەدەها داهۆڵ دەچوون، بە سەدەها دەست پەڕیو و لاق قرتاوم بینی، کە بمترسێنێت داوای دەستەکان و قاچەکان و چاوە ساغەکانی من بکەن، زۆر خێرا وەك ئەوەی بە ناو کۆمەڵێك داهۆڵدا ڕێگایەك بۆ خۆم بکەمەوە تا وەك ئەوان نەبوومەتە داهۆڵ.. خۆم دزییەوە. دەرحاڵ ئەو دیمەنە منی بردەوە ڕۆژگارێکی دێرینی منداڵی کە چۆن من و هاوزاکانم لە برسان بووین بە داهۆڵی ناو کێلگەکان، خەیاڵم پڕ بوو لە هەزارەها، بەڵکو ملیۆنەها داهۆڵ: لەسەر باخ و بێستانەکان، لە گۆڕەپانی جەنگ و گوشتارگەکان، لە ماڵەکان، لە مەکتەبەکان و پەرستگاکان و سەر جادەکان.. لە چاوی مندا لەو ساتەوەختەدا هەموو دونیام لێبوو بە کێلگەیەکی پڕ و سیخناخ لە ملیۆنەها داهۆڵ.
ئەو کاتەی خەیاڵی من بەو چەخماخەیە رۆشن بۆوە کە ئیدی سەروەختی زان و لە دایکبوونی چیرۆکەکەیە.. ئۆخژنێك بە دڵمدا داهات و لە نێوان ژیان و واقیعی

تاڵ و جوانی فانتازیادا پانتاییەکم دۆزییەوە بۆ گەمەی ڕەمزەکان و شاردنەوەی مەبەست و پەیامی چیرۆکەکە، چونکە مەحاڵ بوو بێ ئەو گەمەی ڕەمزکاری و فانتازیایە خۆم لە سانسۆری ئەو ڕۆژگارە بدزمەوە و چیرۆکەکە و داهۆڵەکان لەو سنوورە سوور و تەلبەندە دڕکاوییانە ئاودیو بکەم و بگەنە ناو ئاوایی و بەر چاوان...!

دوا گەلا و .. هونەری فریادرەس

ئۆ. هێنری وەك نووسەری کۆتاییە دژوار و بە ڕك و هێدمەگرتی و پێچیدەکان، خاوەنی دیدگایەکی تراژیك: کە لە هەموو چیرۆکەکانیدا دەیدۆزینەوە: وەك لە دوا گەلادا: مەرگ، ئازار و تلانەوە، هیوا و هونەر وەك دەرەتان و فریادرەس، نەخۆشی، قوربانی، سۆز هاوشان و لە پاڵ هەژاری، کارەکتەری بێدەرەتان، خۆشەویستی و ژیانێکی سادە و هاوڕێیەتی پیرۆزی نێوان مەردوومەکان، هەر هەمووی لە یەك چیرۆکی کورتدا، ئەوەی کە زانست نایتوانێت بیکات وەك موعجیزە و پەرجوو، هونەر وەك دوا سیحر و فریادرەسی تاقانە دەیکات، هونەر دەبێت بە "هاوشانی مەوزوعی/ بابەتگەرا" ی ژیان خۆی کە زیندەگی "جۆنسی" ڕزگار کرد. لەوەش سەیرتر چیرۆکی موعجیزە ئاسای ئاغای "بێرمان" وەك هونەرمەندێك دێتە دی، هونەرمەندێك کە بۆ ماوەی چل ساڵ خەون بە شاکارێکی ناوازەوە دەبینێت، کەچی مایەپووچ و دەستەپاچە چاوەڕوان دەبێت تاوەکو دوا ساتەوەختی مەرگی ناوادە و چاوەڕوانکراوی "جۆنسی".. بەڵام وای لە جوانی خۆنەویستی هونەرمەند کە بۆ ئەوەی مەرگێك ڕاو بنێت، ئامادەیە بەوەی کە خۆی بکات بە قوربانی تاوەکو لەسەر دیوارەکەی بەرامبەری جۆنسی دوا گەلا ڕەسم بکات تا پەرجووی هونەر بێتە دی و ژیانێکی تازە بە هونەرمەندێکی لاو ببەخشێت، واتا ژیان بۆ خۆی فەراهەم نابێت بێ قوربانی، مەرگی بێرمان مەرگی جۆنسی ڕاو دەنێت، پیری جێگا بۆ گەنجییەتی چۆل دەکات، دیسانەوە سروشتی دڵرەق بە خۆی و بە وەیشوومەکانییەوە دێت کە ڕۆحێك ببات، ئەوەی کە هێزی لە زانست و سروشت زیاتر و زاڵترە، دیسانەوە هەر هونەرە: هونەر وەك کانگای ژیان و موعجیزەکان. نیچە یان نیتشە واتەنی: هونەر نەبوایە.. ئێمە دەخنکاین.

دیارە ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا ئەو دوو دۆڕانەی سروشت و زانستە لە بەردەم هونەردا کە هەردووکیان بەرامبەر مەرگ هیچیان پێناکرێت، بەو مانایەی زانست وەك بەرهەمی سەردەمێکی عەقڵگەرا کە جێگا





بە هەموو سیحر و موعجیزەی پەیامبەران و جادووگەران لەق دەکات، کەچی لە بەرامبەر مەرگی کچۆڵەیەك دۆش داماوە، سروشتی هەمیشە گۆڕاو.. هەمیشە ئاوس بە جوانی و ناشیرینی و هەڕەشەکانی، پایز وەك ڕەمزی هەڵوەرین و مەرگ واز لە هەژمورنی خۆی ناهێنێت، دوا جار ئێمەش وەك درەختەکان گەڵا بە گەڵا و خانە بە خانە و موو بە موو دادەرزێین و دەپووکێینەوە و دەمرین، تەمەنی سەوز و جوانی کچەی هونەرمەندیش بەندە بە دوا گەڵای بنەمێوەکەوە، کە لە دوا چرکەدا پیرەمێردی هونەرمەند دوای چل ساڵ لە شکست و نەگەیشتن بە خەونی داهێنانی شاکارێك، کۆستی لە ناکاوی خانمە چکۆلە هانی دەدات کە مەرگی هونەرمەندێکی لاو رزگار بکات، بۆ من تێمای ئەم تێکستە لەوەدا سەرسامی کردم کە بە دەوری مەرگدا دەخولێتەوە، مەرگێك کە لە بەرامبەر هونەردا هیچی پێناکرێت.

کۆتایی چیرۆکەکانی ئۆ. هێنری زۆر لە ژیانی سەیر و ناماقووڵی خۆی دەچێت، ژیانێك پڕ لە مەرگی هێواش و پووکانەوە و داڕزان و شۆك و هێدمەگرتنی لە ناکاو و چاوەڕواننەکراو، ئەم نووسەرە بۆ خۆی لە ڕێگەی هونەرەوە بەرەنگاری ئەو هەموو چارەنووسە دەبێتەوە کە ژیانی ئەمیان گەمارۆ داوە، چارەنووسێکی رەش وەك ئەوەی ناو شانۆگەرییەکانی یۆنانی کە خوداوەندەکان بە کەیفی خۆیان و ستەمکارانە ژیانی جەهەننەم ئاسا بۆ کارەکتەرەکانی سەر شانۆ ڕەسم دەکەن. ئۆ.هێنری لەسەر گومانێکی بێ بنەما بۆ ماوەی سێ ساڵ دەخرێتە ناو زیندانەوە بە گومانی دیار نەمانی پارەیەکی کەم لە ژێر دەستی ئەودا ئەو کاتەی بۆ ماوەیەك دەبێت بە کارمەندی بانق، هەمیشە چاوەڕوانی موعجیزە بووە بۆ ئەستۆپاکی خۆی وەك فەرمانبەرێکی سادە و هەژاری بانقێك، وەلێ هەرگیزاو هەرگیز ئەو فریادرەسە نایەت. خودی ئەو ژیانە تاڵ و بێهوودەی خۆی کە لە پێچێکدا دەبێت بە مەرگەسات بەس بووە ئەو ڕۆحە ماتەمگێڕ و تراژیکە ببەخشێت بە ئۆ. هێنری کە کۆتایی چیرۆکەکانی پڕ بێت لە نائومێدی و جار و باریش گەڕان بە دوای

فریادرەسدا، ئەم بەناوبانگە بەو کۆتاییە زیرەکانە و تویست و لولدان و بادانێکی پڕ لە پێچ و لول کە پتر لە گەمەی گەردەلوول و گێژەنە دەچێت کە هەموو شتێك لە ناو خۆیدا هەڵدەگرێت و ڕایدەماڵێت.
ئۆ.هێنری لاسایی ناکرێتەوە، بەڵام نووسەرێکی لاو دەکرێت کەڵك لە تەکنیك و رۆحی شاعیرانە و روانگە تراژیدییەکەی ببینێت، سەرباری چڕبوونەوە لە زماندا، ئەم نیگارکێشێکە کە لە بری ڕەنگەکان بە"وشەکان" تابلۆکانی سیریالییەکانی ژیان رەسم دەکات، هەر لە سۆنگەی ئەو تابلۆیانەوە سینەمای ئەمریکی و ئەوروپی لە پێچێکدا قەرزارباری ئۆ. هێنری ـ ە.
ئەم تا هەنووکە لە هەموو ئەمریکا و جیهاندا شامۆدێلە و لە تەك "چیخۆف"ی ڕووسی و "گی. دی. مۆپاسان" ی فرەنسی وەك داهێنەر و مامۆستای کورتە چیرۆك هەژمار دەکرێن، سێکوچکەی تاقانەترین هونەری مینیماڵ کە ئەندازەسازییەکی تاقانەی گەرەکە بۆ مانەوە وەك هونەر، گەرچی هەر یەکێك لەو سێ داهێنەرە تایبەتمەندی و پەنجەمۆری خۆی هەیە و دیزاینەر و وەستایەکی نەخشسازی دەسترەنگینی ئەوتۆیە کە ئەو بەشە تاریك و ڕۆشنە لە رۆحی مرۆڤ دەدۆزێتەوە و رەسم دەکات کە ئەویدیکەیان بۆی نارەخسێت پەی پێببات.
بۆ من وەك کارەکتەرێکی ناو چیرۆك دۆزینەوەی ئۆ. هێنری لە سەرەتای تەمەنی نووسیندا کە هێشتا فەراقە نەببووم، بۆ خۆی دۆزینەوەی کیشوەرێکی تازە بوو، تاقانە بوو هەر وەك دۆزینەوەکەی



ئەرخمێدیس. ساڵانێکی زۆریش عەوداڵی ئەوە بووم لە چیرۆکێکدا لاسایی ئۆ. هێنری بکەم.. وەلێ نەکرا.. بەڵام لە کۆتایدا ناسینی ئۆ.هێنری شتێکی پەنهان بە هەر خوێنەرێك و نووسەرێك دەبەخشێت کە پتر من وەك "یاسای ناوەوە" تەماشای دەکەم کە تەنها لە رۆحدا جێگیر دەبێت و هیچ کام لە ئاکارەکانی وەك دەرکەوتە و بەرجەستە ناکەونە بەر هەست و خەیاڵ، یاسایەکە یان سیحرێکە کە ئاسان نییە لە دەرەوەڕا هەموو ڕەگەزەکانی بناسینەوە، بەڵام بێگومانم لەوەی وەك شا ـ یاسایەك بۆ هەمیشە لە ناوەوەڕا کاری خۆی دەکات و بێ ئۆقرەت دەکات کە نەسرەویت و بۆ هەتا هەتایە بە دوای نهێنی و پەرجوو و ڕازەکانی داهێناندا شەیدا بیت.
خەیاڵ بناغەی کۆی چیرۆکەکانی ئەم نووسەرەیە، فانتازیایەکی ناوئاخن و شاراوە کە ڕەگوریشەی لە ناو رۆحی واقیعدا داکوتاوە، کە دوا جار جیهانێکی زۆر سادە و بگیر دەگۆڕێت بە چەندین دیمەن





و تابلۆی نائاسایی که له سیریالی ـ بوونی خۆیدا دەمانباتەوە ناو خەونەکان، هەموو چیرۆکێکی ئەم گێڕانەوەیە کە بە زمان و مەرەکەبی ژیان، کە تا ئەوپەڕی گەمەی جادووگەری و خەیاڵ بە جۆرێك دادەخورپێین و سەراسیمە دەبین کە پتر لە زیندەخەو دەچێت، دەسەلمێنێت کە خەونەکان کانگای چیرۆکەکانن، یان وەها هێدمەگرتی دەبین کە لە کۆتایی هەموو فڕ و فێڵ و گەمەکانی ئەفسوونبازی گێڕانەوە ڕادەمێنین و دۆش دادەمێنین، هەر وەك ئەوەی جادووگەرێك بێت و شەپقەکەی دابگرێت و بیخاتە سەر زەوی، کەچی لە هێکڕا شەپقەکەی هەڵدەگرێت و لایدەبات: ئێمە هێدمەگرتنی چەندەها کەروێشکی خوێناوی دەبینین کە ڕووەو بن دەست و پێیەکانی ئێمە بە تەنگەتاوی و زەندەقچووانە ڕادەکەن...!



# گەڕەکی داهۆڵەکان

شێرزاد حەسەن

ئەو سەر لە بەیانییەی پیاوەکانی "چەلەبی" لە تۆوکردنی زەوییەکە بوونەوە..بەیانییەکی زۆر نوێ بوو، شاگەشکە و ئاسوودە بە هەر چوار دەوری خۆیدا ڕوانی و لە خۆشیانا لەو ئاقارەی بای دەدا..لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەمساڵ هەموو زەوییەکانم تۆو دەکەم، تاکە خاوەنی هەموو عەمبارەکان دەبم، عەمباری گەنم و جۆ و نیسك و نۆك و برنج..لە عەلوەکانی سەوزە و میوەجات گەمە بە نرخی شتەکان دەکەم، ژێرزەمینەکانی لێ پڕ دەکەم، فەردە داخ سوور و داخ شینەکان، دانەوێڵەی هەموو





دونیا..هی خۆم دەبێ..پایتەختیش داگیر دەکەم..ئەمساڵ هات بێت یەك و دەیە..
ئاقارەکانی قەراغ شارم لە دەشتی قەراجیش بە بەرەکترن..گەر خوا یار بێت."

تا چاو بڕ دەکا هەڵیڕوانی:
"ئاخ..ئەگەر تا تخووبی دەم کەل هی خۆم بوایە؟!"
سەرێکی هەڵبڕی..وەی لە سەرسامی..جگە لە قەتارە و ڕەوی هەزارەها
مەل هیچی دیکەی نەدەدی، ئاسمان ڕەش دەچۆوە..بەرز بڵند و
دوور بە ناو یەکدیدا دەچوون..لەو دوورەوە نەیدەزانی ئاخۆ قەتاری
فڕندەکان قەتاری چۆلەکەن، قەتێ یان پەڕەسێلکە...
(هەنووکە وەرزی کۆچی چ مەلێکە و من نایزانم)

مشکی و جەمەدانییەکەی لادا و سەری خوراند..دەتوت پەلەوەر و فڕەندەی هەر
چوار قوڕنەی دونیایێ ڕەویان کردووە و هاتوونەتە ئەو ئاسمانە..ئەو ئاسمانەی
سەرقاپی زەوییەکەی چەلەبی بوو:
(عەجایب...!)

ئاوڕێکی لە "حەمە داهۆڵ" دایەوە و بە حەسرەتێکەوە لەو نۆکەرە دڵسۆزەی پرسی:
(حەمە..وەرزی کۆچی کام مەلە؟)
(گەورەم..لە کۆچی مەلان شارەزا نیم)
(گەمژە..ئاواهی لەوێ مەوەستە..فریام کەوە)
(چی بووە قوربان؟)
(داهۆڵ باب..کار وا بڕوات و ئەم مەلانە بنیشنەوە تا سبەینێ چیمان تۆو کردووە
هەڵیدەلووشن..بۆ دەرمانیش هیچ سەوز نابێت)
(گەورەم سەغڵەت مەبە..حەز دەکەی سەد داهۆڵت بۆ دادەچەقێنم..داهۆڵی وا
قسە بکەن..لە جیاتی تۆ تف لە چۆلەکەش بکەن)

(دەم خۆش حەمە..کێم هەیە جگە لە تۆ..)

سەرێکی هەڵبڕییەوە و تفێکی هەڵدا بۆ فڕندەکان، تەوژمێکی "با" تفەکەی گەڕاندەوە و سمێڵی سواغ دا، دەستەسڕەکەی دەرهێنا و سڕییەوە... ئەو دەستەسڕەی حاجی مەلا شێخ شێروانی میرزا بەگ لە "مەکە"ی شەریفەوە بۆی هێنا بوو...
(پێم ناڵێیت حەمە چۆلەکە و پەڕەسێلکە و قەتێ..بگرە هەموو ئەو مەلە هیچانەی کە بە ئاسمانەوە دەفڕن..چ کەڵکیان هەیە؟
دانەوێلە دەماشنەوە و ڕیقنە دەکەن..چۆلەکەی گەواد هەبێت یان نەبێت چ حیکمەتێکی تێدایە؟)
(هیچ..گەورەم)

داهۆڵێك... دوو داهۆڵ... سێ... چوار... دە داهۆڵ... بیست... سی... چل... لێرە و لەوێ...
(عەجایب..!)

فڕەندە و مەلە نەفرەتییەکان نەدەترسان، بەسەر زەوییەوە تۆوکراوەکەی چەلەبییەوە نزم دەنیشتنەوە، شەپۆلیان دەدا، لە ئاسمانەوە نا..بەڵکو دەتوت لە غەیبەوە دێن، لە شوێنێکی بزر و نادیارەوە، ڕەوەیەك هەڵدەفڕی و ڕەوەیەك دەنیشتەوە، فڕەفڕ و هاش و هووشی هەزارەها باڵ هەترەشی نەك حەمە، بەڵکو هەترەشی پیاوی غیرەتداریشی دەبرد.
"حەمە داهۆڵیش" فریا نەدەکەوت، بە ڕاست و چەپدا بەردی دەهاوێشت و کوفری دەکرد، (چەلەبی)یش وەك خەرتەل باڵەکانی لێکدەدا و زەوییەکەی پاس دەکرد..بەو ئومێدەی نەهێڵێت بنیشنەوە..بێچارە بوو..بێچارە بوو..بێچارە...

شەو داهات و "حەمە داهۆڵ" ئەو ئاقارەی بەجێنەهێشت، لە ژێر کەپرەکە دانیشت و تا بەیانی جنێوی بە مەلەکانی هەموو دونیا دا، نەیدەزانی ئەم مەلە لەعنەتیانە چین و لە کوێوە هاتوون، ئەوەندە پەست و تووڕە بوو خەوی لێ نەدەکەوت، جار جار وەنەوز دەیبردەوە..تاریك







و ڕوونی بەیانی تۆزێك خەو بردییەوە، ورشە و هاش و هووشی هەزارەها فڕەندە لە خەو ڕاپەڕاند..
(هاتنەوە هەی بە نەفرەت بن..واشە و داڵ و هەڵۆ حیزەکانی دونیا لە کوێن..هەی نامەردینە؟)

بێ پرس و بێ ترس نیشتنەوە...

تازە گزنگی دابوو کە پیکەبەکەی چەلەبی لە دوورەوە تۆزی دەکرد، کە دابەزی حەمە داهۆڵی نەبینی، چونکە گەردەلوولی مەلەکان و تۆز و خۆڵی ئەو ئاقارە بابەخولەیان پێدەکرد، بە ئاستەم حەمەی بینی و بە پیریەوە چوو..نزیك..نزیکترە..کەوتە سەرتخووبی زەوییە تۆوکراوەکەی، چوار ناڵە غاری دەدا، تاکێك لە کلاشە هەورامییەکەی لێ بەجێما و..نەگەڕایەوە..گەیشتە ئاستی..چاوانی هەڵگلۆفی..سەیرە..حەمە داهۆڵی بینی بە پێخواسی و سەرکۆتی..سەر و پۆتەلاکی داهۆڵەکان دەکوتێتەوە، بە لەقە کەوتۆتە سەریان، تفیان لێدەکات، هەر داهۆڵە و داهۆڵەی دیکە تێکدەشکێنێت، بە قۆڵ و باسکی لێکترازاوی مەلەکان ڕاودەنێت، کەچی بەسەر و مل و شانییەوە، بە نێو گەڵیدا هەڵدەفڕین، لە پشتەوەڕا چەلەبی باوەشی پێدا دەکرد، ڕانەدەوەستا، بەررزەفت نەدەبوو، تەکانی دەدا و خۆی ڕادەپسکاند، لەنێو ئەو تەپ و تۆزە و لەژێر تاریکی سێبەری هەزاران مەل و فڕندەدا وایزانی چەلەبیش هەر داهۆڵە و ڕۆحی هاتۆتەبەر، گرتی و دای بە زەویدا، بە لەقە کەوتە سەر ورگی، کە لە چۆلەکەیەك دەچوو بە دەنووك کەوتبێتە سەر سکی قەلەڕەشێکی مردوو، مشکی و جامانەی چەلەبی کەوتە بەر پێیان، مەلەکانیش لە خۆشی ئەو بەزمە کردیان بە کەرنەڤاڵ، بێ شەرمانە دەیانجریواند، بەسەر چەلەبی و حەمەدا ڕیقنەیان دەباراند..

چەلەبی شێتتر نەڕاندی و پڕ بەو ئاقارە هاواری کرد، لەتاو ئەو هاوارە هەزارەها

فڕندەی دەنووك و گەروو پڕ دانەوێلە هەڵفڕین و نیشتنەوە، هەڵفڕین و نیشتنەوە..تەنیا ئەو حەلە "حەمە داهۆڵ" هاتەوە هۆش خۆی کە چەلەبی قیژاندی:
(سەگباب... سەگی سەگبا... با... با... ب..داهۆڵی داهۆڵ باب... چیت داوە لەو داهۆڵانە..بۆ دەیانشکێنیت؟)

چەلەبی لەنێو ئەو تەپ و تۆزە هەستایەوە، چنگی لەنێو لنگانی خۆی توووند کردبوو، تف لەسەر تف دەم و چاوی حەمەی سواغ دەدا، حەمەش کە تا ئەو حەلە ئاگری دەکردەوە، کەفی دەچڕی، ڕاست و چەپ..فڕکان فڕکان بەردی دەگرتە مەلەکان، تفی لە ئاسمانی بەرفراوانی شەپۆلی فڕندەکان دەکرد، چەلەبی هەردوو شانی گرت و رایتەکاند، حەمە داهۆڵ وەك شەقشەقە لە بەردەمیدا دەلەرزی، وەك گەڵایەکی بەربا..کە جنێوی پێ نەما، لە دوا بەندی دەیەها جنیو کە هاواری کرد:
(ماکەر... مالۆس... تۆ کەرێت؟)
ئەوسا حەمە داهۆڵ دەمی هەڵهێنا و زمانی تەتەڵەی کرد و بە دەم قووتدانی تفەوە گوتی:
(گەورەم عەفووم کە..من مەعزوورم..ئەم چۆلەکە هیچانە قەدرم نازانن و گاڵتەم پێ دەکەن..!)
(ئاخر چونکە خۆت چۆلەکەی..چۆلەکەیەکی کوێریت)
(گەورەم قەت نەبووە، من داهۆڵ دروست بکەم و تەیر و تواڵ لێی نەترسن..عاجباتیم لێدێت)
(قسە مەکە و دەمت داخە..بڕۆ بزانە کڵاشەکەم لە کوێیە..دەی زوو)

بەو پێ پەتییەی هەتا شەق دەگرێت خێواندییە قوونی حەمە..تێیتەقاند..گەڵا و گەڵ وەك بڵێیت قۆڕ بووبێت..دەگەڕا، کڵاشەکەی دۆزییەوە، هاتەوە بەردەمی، لەبەر پێیدا نووشتایەوە، بە هەردوو دەست چنگی لە هەردوو گۆزینگی چەلەبی گیر کرد، پێی بەرز کردەوە، پێیەکی کەوتەوە ناو کڵاشەکە، حەمە ئارەقەی ڕەش و شینی دەردەدا، بایەکی لێ بەربوو، چەلەبی هەستی پێکرد، وەلێ ئەو لەو تووڕەتربوو پێبکەنێت، لە داخی ئەو مەلە هیچانەی هێرشیان دەکردە سەر زەوییەکەی دەلەرزی، زمانی کلیل درابوو، بە تەنگەتاوی ڕووە و پیکەبەکەی غاری دا و خۆی تێ کوتا، سلفێك و تەقینەوی گرمەیەك و هەزاران مەلی هەڵنیشتووی ئەو ئاقارەی هەڵفڕاند، حەمە داهۆڵ بەدیار داهۆڵە شکاوەکانەوە دۆش دامابوو، لەو شوێنە هەڵنەستا..لەو شوێنەی کە چەلەبی پێی موبارەکی





خستە نێو کڵاشەکەی، غیرەتی دا بەر خۆی، ئاوڕێکی دایەوە..جورئەتی ئەوەی کرد سەیری لوولەی ئەستووری ئەو تۆزە بکات کە چەلەبی لەو ئاقارە بەجێیهێشت، دەتوت عەزیایەکی زەبەللاحە نەك لوولەی ئەستووری گەردەلولێك کە لەسەر کلك وەستا بێ...
(بۆ وا بە بێ دەنگی بەجێیهێشتم؟)

هەر لەو شوێنە و دەنێو بازنەی دەیەها داهۆڵی شکاو و لەژێر بارانی ڕیقنە و سووکە پەڕی هەزاران پەلەوەردا لێی ڕونیشت، بیری دەکردەوە..بیری لە ڕەزامەندی چەلەبی و نەمانی هەموو مەلەکانی دونیا دەکردەوە..ڕەزامەندی (چەلەبی)ش لە ڕەزامەندی خواوەیە.

گەیشتەوە شار..پیاوەکانی دەوریاندا، تێیگەیاندن، دەمیان داپچڕی، ئەبڵەق و سەرسام، سەریان بادا و دەستیان بەیەکدادا، هەر یەکە و بە گوزەرێکدا تێی تەقاند، هەر یەکە و گەڕەکێك، کۆڵانێك، ماڵێك، دەرگایەك..دوو..دە..دەرگای شەق و پەقی خانووە قوڕەکان..دەیەها باوکی برسی و تووڕە و ڕیش نەتاشراو، سەر و سیمای خەم لێنیشتوو دەرگایان دەکردەوە، لە پشت هەر باوکێکەوە منداڵێکی چڵمن و چڵکن و لیکن و چاو زەرد بە دەردی بەدخۆراکی..مل باریك و لاق باریك سەرەتاتکێی بوو، ترس و برسێتی چاوانی ڕشتبوون، کۆڵانە و کۆڵان و ماڵە و ماڵ.. نەك وەك کۆمەڵێك منداڵی برسی و ترسنۆك و شەرمن، بەڵکو وەك کۆمەڵێك داهۆڵ لە پشتی پیکەبەکە بارکران، بە هەڵتەك و داتەك شاریان بەجێهێشت، تەنیا شتێك کە سەیری بکەن بارستایی لوولەی ئەستووری ئەو گەردەلوولە بوو کە لە پیکەبەکە بەجێدەما، گەیشتە سەر تخووبی زەوییە تۆوکراوەکەی، حەمە داهۆڵ هێشتا لەو ئاقارە و لەنێو کەرنەڤاڵی فڕندەکاندا کەوتبوو..چەلەبی سەری دەرهێنا و هاواری کرد:
(وەرە مالۆس..ئەم داهۆڵانە داگرە)

به هەڵەداوان بەپیر ئەو هاوارەوە چوو، چەلەبی دانەبەزی..ڕووی کردە منداڵەکان:
(چڵمنینە..نەهێڵن هیچ مەلێکی حیز توخنی زەوییەکەم بکەوێت، ئێوارێ دێمەوە دووتان..هەفتانەکەشتان..
دەیخەمە دەست بابتان.)
منداڵە لاق باریکەکان نقەیان نەکرد.
(گوێ بگرن و لێم مەبن بە داهۆڵەکان، هەر یەکەتان دەبێت پاسەوانی چاك بێت، دەنا ڕۆژانەکەی لێ دەبڕم،
هەر یەکەتان قوتوویەك لە حەمە وەردەگرێت و پڕی بکەن لە بەرد ورد و درشت، وەك شەقشەقە ڕایوەشێنن
و بیکەن بە هەرا و زەنا و قیامەتێك نەبێتەوە..وا نەبێت مەلەکان ئێوەش بە داهۆڵ دەزانن..!)

منداڵە چاو زەردەکان..چاو مردووەکان نقەیان نەکرد، حەمە بە پەلە باوەشی بۆ منداڵەکان دەکردەوە و
یەکە یەکە دایگرتن، پاشان خۆی هەڵدایە پشتی پیکەبەکە و لەو قوتووە زۆر و ژەنگارانەی کە لە پشتی
پیکەبەکەی فڕێدرا بوون، هەر یەکە و قووتوویەکی بۆ هەڵدان، دەکەوتن و بۆیان نەدەگیرایەوە، هەر یەکە
و ماندوانە قوتووی خۆی هەڵگرتەوە، حەمە فەرمانی پێکردن کە قوتووەکانیان پڕ بکەن لە وردە بەرد، کە
لێبوونەوە حەمە بازێکی داو کەوتەوە سەر زەوییەکە و دوا فەرمانی دا:
(هەر یەکەتان لای یەکێك لە قووچەکان بوەستێت و تووند قوتووەکە ڕاشەقێنێت..نەهێڵن چۆلەکەیەکی
باڵ شکاویش بنیشێتەوە).

هەمدیس منداڵە مل باریکەکان نقەیان نەکرد..ئەوەندە باریك کە بۆیان نەکرێت ئەو سەرە مازوو ئاسایانە
ڕاگیر بکەن.
چەلەبی لێیان ورد بۆوە و بە دەم بۆڵەوە وتی:
(چەندە لە داهۆڵ دەچن..!)
هاوارێك و هەر منداڵێك ڕووە و قووچەکەکەی خۆی ڕایکرد.

دوا جار چەلەبی تفێکی لە مەلەکان کرد و سلفێکی لێدا..حەمە داهۆڵ
کەوتە دوای گەردەلوولی جێماو لە پیکەبەکە، زۆر بە هیلاکی
دەستی گەیشتە قوڵفەکە و خۆی هەڵدا، ڕەتێکی برد و قوونا و







قوون کەوت..هەستایەوە، چەلەبی پتر پێی بە بەنزینەکەوە نا..حەمە ڕایکرد و دەستی نەدەگەیشتەوە قوڵفەکە بەو هەموو خەمەوە چەلەبی ڕایدەبوارد، حەمە کەوتبووە نێو تەپ و تۆز، سێ چوار ئیستۆپ و تەکان وای کرد حەمە خۆی بە قوونی پیکەبەکەدا بدات، دەنێو ئەو گێژەڵوکەیە حەمە دەستی گەیشتە قوڵفەکە و بەری نەدا، وەك ئەوەی دەستی بەر قوڵفی کەعبە کەوتبێت، چەلەبی بەم ڕابواردنە کۆڵێك کەیفی سازبوو، چەلەبی لە ئاوێنە بچکۆلەکەوە لە حەمە دەگەڕا تا ببینێت چۆن کەوتۆتە دوای گەردەلوولی جێماو لە پیکەبەکە..دوا جار خواو راستان خۆی هەڵدا و تەڕك ئاسا خۆی بەردایەوە و کەوتە سەر پشت، دیسانەوە جگە لە سەدەها ڕەوە باڵندەی بەناو یەکدیدا چوو کە نەدەسرەوتن..هیچی دیکەی نەدی، منداڵەکانیش نوقمی ژێر ئەو تۆزە بوون، دە مێرد منداڵی ترسنۆك و سەرسامی ئەو ئاقارە چۆڵە و هەزاران چۆلەکەی هار و بێ عار، هەر منداڵێك و خەونی بە دارلاستیکێکەوە دەبینی، سینەی برژاوی مەلەکان و دەمێکی پڕ لە لیك، قیت وەك دە داهۆڵ بە پێوە وەستان، چاویان بڕیبووە خۆر..خۆری چی؟ خۆر لەبەر دیدەیان دەبوو بە کولێرەی برژاو، تایەی زێڕینی عەرەبانەیەك، چارۆگەی زەردی دایە..بازنەی زێڕینی مەچەکی کچە چکۆلانەکەی چەلەبی.

سەر لە ئێوارە بەر لەوەی تاریك دابێت، پیکەبەکە گەیشتەوە ئاقارەکە، ئەمجارەیان حەمە لێی دەخوڕی و چەلەبی لە تەنیشتەوە مژی لە جگەرە دەدا، بەپەلە دابەزین، بە تەنگەتاوی ڕووەو قوچەکەکانیان غاریاندا. وەی لە عاجباتی..لە جیاتی دە مێرد منداڵ دە داهۆڵی بێ گیانیان بینی، لە تەك هەر داهۆڵێك و قووتوویەکی پڕ بەرد، هەر هەمووشیان ڕوویان کردبووە خۆری ئاوابووی دەم کەل کە گران خۆی ڕادەکێشا، چەلەبی هێدی هێدی لە یەکە یەکەی داهۆڵەکان نزیك بووەوە، بە ترسەوە دەستی بە سەر و ملی، لاق و لەتەری منداڵە داهۆڵەکاندا هێنا..کێ بڕوای دەکرد؟ لە بری قژ: پوشوو پەڵاش، لە بری ئێسقانی شان و شەپیلك: تەختە و دار،

لە باتی دوو لاق دوو پیشەقان، لە جێی دوو چاوی پڕ خەم و شەرم و ترس: دوو کەلا شووشەی زەردباو دەبریسکانەوە، چەلەبی بە دوو چاوی زەق و سەرسامەوە ئاوڕێکی لە حەمە دایەوە و پرسی:

ـ ئەی کوا منداڵەکان؟

- گەورەم..لەوانەیە هەڵاتبن.

ـ بۆ کوێ؟

- خوا دەزانێت..قوربان ئەوانە دە مێرد منداڵی بەستەزمان و گوێ کەڕیلە نەبوون..ئەوانە لە دە بێچووە شەیتان دەچوون..!

ـ بەخوا هێستری..مالۆس ئەوانە بە قوون هەناسەیان دەدا..شەیتانی چی و تەڕەماشی چی؟

- کەیفی خۆتە گەورەم.

ـ باشە ئەم داهۆڵە پوختانە کی دروستی کردون..؟

- لەوان زیاتر کێ بێت؟ ئا..من دڵنیام ئەوان دایان مەزراندووە..ئەی ئێمە ئەوانمان بە تەنیا جێنەهێشت؟

ـ ئەو منداڵە لاواز و لە برسامردووانە و ئەم داهۆڵانە کوجا مەرحەبا؟

- ئەی قابیلە سیحر بێت..گەورەم تۆ بڕوات بە سیحر هەیە؟ تۆ بڵێیت سیحریان لێ کرابێت و خۆیان بووبنە داهۆڵ.

ـ دەمت داخە و چەڵتە چەڵت..وەختی بێ عەقڵی نییە..دەبێت من ئێستاکە دە منداڵ بۆ باوك و دایکیان ببەمەوە.

- جا بۆ وا خۆت سەغڵەت کردووە؟

ـ ئەی ئەگەر خۆم سەغڵەت نەکەم..چی بکەم کەران باو گاو؟ لات وایە دەبێت لە خۆشیانا هەڵپەڕم، چونکە من ئێستاکە لە بری دە منداڵ دە داهۆڵ لەبەر دەممدا چەقیوون؟

حەمە داهۆڵی هەمیشە ملکەچ و گوێڕایەڵ بە دەم خەنینەوە، وەك بڵێیت نوکتەیەکی بەتام بگێڕێتەوە.. پێیوت:

(قوربان زۆر ئاسانترە لە ئاو خواردنەوەش..لە جیاتی دە منداڵەکە دە داهۆڵیان بۆ بەرەوە..کێ زاتی ئەوە دەکات بڵێ لەل..)

چەلەبی سەری هەڵبڕی و لە مەلەکان ڕاما و بە حەژمەتێکەوە وتی:

(دە داهۆڵەکان بخەرە پشتی پیکەبەکە)





خۆری دەم کەل لە پرتەقاڵێکی گەورە دەچوو، ئەو پرتەقاڵەی منداڵە داهۆڵەکان دیویانن و تامیان نەکردووە، ئەمجارەیان تۆزەکە زەرکەفتی و ..زەردەپەڕیش هەموو گەردیلەیەکی دادەگیرساند..دە داهۆڵە منداڵ لە پشتی پیکەبەکە کەوتبوونە سەر یەکدی، هەزاران مەلیش ببوونە چەتری سەر سەریان، دەتوت دەیانەویێت دڵی منداڵە داهۆڵەکان بدەنەوە. بە چریکەیەکی جەرگبڕ ئاسمانیان کاس دەکرد وەك ئەوەی بیانلاوێننەوە، چەلەبی سەری لە پەنجەرەکەوە دەرهێنا و تفی هەڵدەدا، مەل و فڕندەی دونیای بە نەفرەت دەکرد، کتوپڕ بارانی ڕیقنە دایکرد و بەر دەم و لووت و سمێڵ و چەناگە و چاوی چەلەبی کەوت، هەر زوو ژێژك ئاسا سەری بردەوە ژووری، لە ڕقانا و بێئاگا لە خۆی دەستی ڕاستەی بەردا و کۆڵە مستێکی خێواندە سەر و جامانەی حەمە داهۆڵ و پەڕاندی..ئەم خەنییەوە..بێئەوەی بزانێت بۆ..!

کە بەیانیدا..سەرسامی وەکو ئاسمان هەموو شاری گرتبووە باوەش، قەت وا نەبووە و کەسیش شتی وای نەبیستبوو، ئەو شەوە کەس بە تێری نەنووست..یەکەم جار بوو کە بە هەزارەها چۆلەکەی نێو دارستانی گەورەی شار تا بەیانی نەسرەون و بجریوێنن، هەزاران مەلی نێو باخچە و سەر گوێسوانە و ژێر هەیوان و سەر درەختە تەنیاکانی نێو حەوشەی ماڵە هەژارەکان..لە جوکە و جریوە نەکەوتن..جوکە و جریوەیەکی پڕ لە ئازار و خەمهێن..وەك ئەوەی جریوەی پرسە بێت... پیرەکان وتیان:
(نەبووە و نەبیستراوە..قەت نەبووە شەو دابێت و مەلان نەسرەون..بێ شك بەڵایەکی ناگەهان لە ڕێیە..یان کۆستێکی ناقۆڵا ..!)

بۆ ڕۆژی دووەمیش چەلەبی دە منداڵی دیکەی بردەوە سەر زەوییەکەی تا پاسی

بکەن، ئێوارە دە داهۆڵی بردەوە شار..بۆ ڕۆژی سێیەمیش هەمدیس دە مێرد منداڵی بردەوە ئەو ئاقارە و ئێوارە دە داهۆڵی بردەوە..ڕۆژی چوارەم...پێنجەم...دەیەم...بیستەم...چلەم...سەد...دوو سەد منداڵ... دوو سەد داهۆڵ... منداڵ... داهۆڵ... منداڵ... منداڵ... منداڵ... منداڵەکان... داهۆڵ... داهۆڵ... داهۆڵ... داهۆڵەکان... منداڵە داهۆڵەکان... داهۆڵە منداڵەکان... منداهۆڵەکان... داهۆڵەکان... وای لەو گەڕەکە گەورەیەی داهۆڵەکان... گەڕەکێك... دوو... سێ... وای لەو هەموو گەڕەکە گەورانەی داهۆڵەکان...! داهۆڵەکان... منداڵەکان... داهۆڵەکان... منداڵەکان... منداهۆڵەکان...مممممننننننننددددددداااااهۆهۆهۆ هۆڵەڵەڵەڵەکککك ككااااااااانننننننننننننننننننننن...............................





فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

# شەیتانەکان

ڕۆمان

وەرگێڕانی

ڕەووف بێگەرد

بەرگی دووەم



# دواگەڵا

## چیرۆکی: ئۆ.هێنری

لە ناوچەیەکی ڕۆژئاوای گۆڕەپانی "واشنتن" دا جادەکان زۆر شێتانە و بە پێچ و لوول دەیانبردیتەوە کۆڵانی تەسك و تروسك و تەنگەبەر، ئا لەم شوێنەدا خانووەکان گۆشە و کەوانەی سەیریان تێدەکەوت. شەقامێك یەك ـ دوو جار لەنێو قەدەوە خۆی دەبڕییەوە، ئا لەم شەقامەدا..جارێکیان وا ڕێك کەوتووە هونەرمەندێك ژیان و گوزەرانێکی گونجاو بۆ خۆی دابین بکات، تۆ بڵێ یەکێ بووە لەوانەی سەرمەستی کۆکردنەوەی بۆیە و تابلۆ و کاغەز و کانڤاس بوون، بەم کوچە و کۆڵانەدا هاتووە و چووە، لە گەڕانەوەیدا سەیری گیرفانی



خۆی کردووە..بڵێی یەك "سێنت" چییە، لەسەر قەرزیش، نەچۆتە گیرفانییەوە.

جا دوایی...تێکڕای هونەرمەند و هونەردۆستان ڕووە و ئەم گەڕەکە کۆن و سەیر و دڵگیرە هاتوون و بووەتە قیبلەگایان، ناویش نراوە "گرینچ ڤلیچ".. ئا بەم شێوەیە کۆمەڵ کۆمەڵ هاتوون و شەیدا و عەوداڵی ئەو پەنجەرانە بوون کە لەسەر تەدارەکی ناوچەکانی ـ باکوور ـ درووست کرابوون، جەمەلۆن و سەربانە قوچەکانی سەدەی هەژدەمین، کولانەی هۆڵەندی بن ساپیتەکان، کرێی کەم، پاشان..هەر ئەم هونەرمەندانە لە ـ سکس ئاڤینو ـ ەوە چەند مەسینە و قاپ و قاچاغێکی فافۆنیان هێناوە..بێجگە لە چەند لەگەن و کەرەستەیەکی بێ کەڵك، ئیتر ئەم ناوچەیەیان کردووە بە مەملەکەتی خۆیان و تیایدا حەواونەتەوە.

لە سەرووی باڵەخانەیەکی سێ نهۆمی نزمدا "جۆنسی" و "سوو" ستۆدیۆیەکیان بە کرێ گرتبوو، "جۆنسی" بە جوانا-ش بانگ دەکرا. یەکێکیان خەڵکی "مەین" و ئەویدیکەیان لە "کالیفۆرنیا" وە هاتبوو، ئەم دوو کچە لە شەقامێکی "دێلمۆنیکۆ" و لەسەر مێزی چێشتخانەیەکدا ئاشنای یەکدی دەبن و وەکو دوو دەستەخوشك بە یەکەوە دەژین، لە زۆر شتدا هەمان زەوق و هەوەس و بۆچوونیان هەبووە ، بگرە هەر لە عیشقی هونەر و زەڵاتەی گیا کێویلە و تا دەگات بە ئەنگوجکی قەشەئاسایان، ئەوەندە هاوتا و هاوڕازی یەکدی دەبن کە ناچار دەبن بە یەکەوە لە هەمان ستۆدیۆدا بژین.

ئەو کەین و بەینە هەمووی لە مانگی "بانەمەڕ"دا دەقەومێت.
لە مانگی گەڵاڕێزاندا-میوانێکی سارد و سڕ، سەیر و نەناس، لەبەر چاوان ون و بزر..بە خشکەیی خۆی دەگەیەنێتە گەڕەکی ئەو هونەرمەندانە، پزیشکەکان

ئەم غەریبەیان ناونا ئاغای سیل و وەرەم، بەو دەست و پەنجە سارد و سڕانەی لێرە و لەوێ یەکە یەکە خەڵکی هەڵدەوەراند. لە بەری ڕۆژهەڵاتدا..ئەو دزە وێرانکەرە ئازایانە دەستی خۆی دەوەشاند، چوست و چالاکانە، بە بیست و سی کەوتە براندنەوەی نێچیرەکانی، بەڵام کە گەیشتە ناو کۆڵانی تەنگەبەر و بە پێچ و لوولی ئەو گەڕەکە کۆنە هەنگاوەکانی قورستر بوون و لە سەرخۆ و هێدی هێدی ملی دەنا.

ئاغای "سیل" ئەوەندە جوامێر و مەرد نەبوو، ئافرەتێکی وا ورد و چکۆڵانە و بێ گیانی وەك جۆنسی- یش کە بە ئاو و هەوای کالیفۆرنیا ڕاهاتبوو بۆ میوانێکی دەست ڕەش و هەناسەسوار و گەلحۆی وەك "سیل و وەرەم " گەمەیەکی زۆر سادە و سانابوو، هات و دەستی خۆی لە جۆنسی وەشاند و یەك تەختە ختییە ناو پێخەفەوە، لەسەر قەرەوێڵەیەکی بۆرکراو ڕاکشا، مەگەر بە حاڵ، ئەگینا جووڵەی بۆ نەدەکرد، لە پەنجەرەیەکی هۆڵەندییانەی چکۆلانەوە هەمیشە سەیری دیوارێکی ڕووتی ئەو بەری دەکرد، دیواری ئەو خانووەی کە کەوتبووە بەرامبەر پەنجەرەکە.



بەیانییەکیان پزیشکێکی سەرقاڵ و بڕۆ چڕ و تۆزاوی هات و پاشان "سوو" ی بردە هەیوانەکە و پێیوت:

"هیوای مانەوەی ئەم کچە کەمە، دەتوانین بڵێین لە - دە - یا یەکە." ئەمەی وت و گەرمپێوەکەی ڕاوەشاند تا جیوەکە بنیشێت.

پاشان وتی:

"ئەم هیوایەش بەوەوە بەندە گەر خۆی دڵی بە دونیا خۆش بێت و بیەوێت بژی. مەسەلەی هاودەنگی و دۆستایەتی نێوان خەڵکیش گرنگە..وا دەکات هەوڵ و تەقەللای دەرمانسازەکان ببێت بە گاڵتە و فشقیاتێکی تەواو..ئەوە و چاودێریش لەوێ بووەستێت، بەس لەوە دەچێت ئەم خانمە چکۆلانەی دۆستی تۆ بڕیاری کۆتایی خۆی دابێت کە ئیتر بۆی نییە چاك ببێتەوە. پێمبڵێ.. ئەم کچە چ گرفتێکی هەیە؟"

سوو وەڵامی دایەوە و وتی:-"ئەم..تەنها ئاواتێکی ئەوە بووە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕەسمێکی- نۆکەندی ناپلس ـ بکات و بەس."

"ڕەسم. قسەی قۆڕە...! چ شتێك هەیە کە بەڕاستی خەیاڵی ئەم کچەی تێکدابێت وا بە نهێنی بیری لێبکاتەوە بۆ نموونە: پیاوێك؟"

خاتوو سوو ئەمەی وت و لەرەی دەنگی ئاوازی گیتار ئاسا زرنگایەوە .



"پیاو ئەوە دێنێت؟ بەڵام..دکتۆر..شتی وا هەرگیز لە ئارادا نییە... هەرگیز."
دکتۆرەکەش پێیوت:-
"ئێ..کەواتە مەسەلەکە بێ هێزی و لاوازییە، سەبارەت بە خۆم ئەوەندەی لە توانامدا بێت درێغی ناکەم. بەڵام ئەگەر نەخۆشەکەم پێشبینی پرسەی خۆی بکات و هیوای بە ژیان نەمێنێت..دەتوانم بڵێم کاری دەرمان و دەرمانساز لە ـ سەدا پەنجا ـ کورتی دێنێت. ئەگەر بتوانیت وای لێبکەیت لە جلوبەرگی زستانە و لە پاڵتۆ بپرسێت..ئەوە من بەڵێنی تەواوت دەدەمێ کە نەك (یەك و دە) بەڵکو (یەك و پێنج) هیوای ساغ بوونەوەیمان دەبێت و ئەم دەردەی لە کۆڵ دەبێتەوە."

دوای ئەوەی پزیشکەکە ڕۆیشت "سوو" چووە ژووری ستۆدیۆکە و دایە پڕمەی گریان. پاشان بۆردی ڕەسمەکەی هەڵگرت و ڕووەو ژوورەکەی حۆنسی ملي نا و هەر بە فیکەلێدان کەوتە سەرمەستی ئاوازێکی ڕەسەنی قولەڕەشەکان.

جۆنسی نەخۆش ڕاکشابوو، لە ژێر پێخەفەکەیدا نەدەبزوت، ڕوو بە ڕووی پەنجەرەکە پاڵ کەوتبوو. "سوو" لە فیکەلێدان کەوت، وای بۆ چوو کە جۆنسی خەوی لێکەوتبێت.

بۆردەکەی ئامادە کرد و هەر بە قەڵەمی مەرەکەب چەند سکێچێکی بۆ گۆڤاری "چیرۆکان" رەسم کرد. ئەوەیە: هونەرمەندە لاوەکان، هەمیشە، رەسم بۆ گۆڤاری چیرۆکان دەکەن تا دەروازەی دونیای مەزنی هونەریان لێبکرێتەوە، هەر وەك چۆن نووسەرە گەنجەکانیش دەنووسن تا بتوانن ڕووەو دونیای ئەدەب هەنگاو بنێن.

لەو ساتەوەی کە "سوو" سکێچی کاوبۆیەکی ـ ئیدا هۆ ـ-ی دەکرد، نیازی وابوو پانتۆڵێکی جوان و چاوێلکەیەکی یەك شووشەیی بۆ زیاد بکات بە مەرجێك بۆ خۆپیشاندانی سوار ئەسپان بشێت..ئا لەم ساتەدا چەند ورتەورتێکی نزمی بیست کە بۆ چەند جارێك هاتەوە بەر گوێی. خێرا هەنگاوی ناو گەیشتە تەك پێخەفەکەی جۆنسی.

چاوەکانی"جۆنسی" تا ئەو پەڕی زەق ببوونەوە، لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە دونیای دەرەوە و کەوتبووە سەر ژماردن-ـ ژماردنێکی ئاوەژوو.
ورتەیەکی لێوە هات و وتی"دوانزە" دوای تۆزێکی تر وتی "یازدە" پاشان "دە" و "نۆ" دوایی "هەشت" و "حەوت" هەر لە دوای یەکدی ئەم دوو ژمارەی دوایی لە دەم هاتەدەر.

"سوو" ش لە پەنجەرەکەوە پەرۆشانە سەیرێکی دەرەوەی کرد. ئاخۆ چی بژمێرێت؟ لە گۆڕەپانێکی چۆڵ و ڕووت واوەتر هیچ دیار نییە. لەو لاتریش، لە دووری بیست "پێ"وە، لادیوارێکی ڕووتی خانوویەکی خشتە و هیچی تر. بەڵام تا ناوەڕاستی دیوارەکە بنەمێوێکی پیر وەك لاولاو هەڵکشابوو، بنەمێوێك کە لە ڕەگەوە ڕزیو و کرمێ ببوو. هەناسەی ساردی پایزیش هێدی هێدی گەڵاکانی هەڵدەوەراند تا وای لێهات لقەکانی وەك ئێسقان ڕووت و قووت شۆڕ ببوونەوە.. بە ڕووی خشتە داڕووخاوەکانیشەوە نیشتبوون.

خاتوو سوو لێیپرسی: "ڕۆحەکەم ئەوە چیتە؟"
"شەش.." هەر بە چرپەوە ئەم ژمارە لە زاری هاتە دەر. "ئێستاش وا خێراتر هەڵدەوەرێن. سێ ڕۆژ لەمەوبەر سەدەهای پێوە مابوو..نەمدەتوانی بیانژمێرم..سەرم دەسووڕا. کەچی ئێستا ژماردنیان ئاسانتر بووە..ئەوە دانەیەکی تریش هەڵوەری. تەنها پێنج دانەی پێوە ماوە و بەس."
"گیانەکەم..پێنجی چی؟ دە پێم بڵێ."
"گەڵاکان. گەڵاکانی ئەو بنەمێوە. هەر کاتێك دوا گەڵای لێ هەڵوەری..منیش دەمرم..ئەوە سێ ڕۆژە من ئەم ڕاستییە دەزانم..ئەی دکتۆرەکە پێینەوتیت؟"
"ئۆە..من هەرگیز قسەی وا پڕوپووچم نەبیستووە."

خاتوو سوو ئەم وەڵامەی بە زمانێکی وا





دایەوە کە ئەوپەڕی گلەیی و تورەیی و گاڵتە بنوێنێت، پێم ناڵێیت گەڵای بنەمێوێکی پیر و ڕزیو چ پەیوەندییەکی بە چاکبوونەوەی تۆوە هەیە؟ تۆ هەمیشە ئەم بنەمێوەت خۆشویستووە، زۆریش خووت شڕ بووە.. بەسە و خۆت گێل مەکە. ئەم بەیانییە دکتۆرەکە خۆی پێیوتم کە تۆ چاك دەبیتەوە، با بە ڕاستی قسەت لەگەڵ بکەم کە بە منی وتووە کە تۆ یەك و دە فەرقت کردووە، ئەوەشیان هیوایەکی گەورەمان دەخاتە دڵەوە،

کە لە شارێکی وەك نیۆیۆرك بژی و ناچار بێت سواری ئەم هەموو ترام و ئۆتۆمبێلە بێت. یان بە تەنیشت ئەو هەموو باڵەخانانە گورزەر بکات کە تازە درووست دەکرێن، دەبێت بە قەد تۆ هیوای بە ژیان بێت.. هەر ئێستا تۆزێك شۆربات بۆ دێنم بیخۆیت..لێمگەڕێ با بچمەوە سەر سکێچەکانم..بەڵکو ئەوە خوایە و شتێکم لە سەرنووسەری گۆڤارەکە دەست بکەوێت تا بتوانم شەرابێکی پورتوگالی بۆ ئەم منالە نەخۆشەم بکڕم..لەگەڵ چەند کوتە گۆشتێکی بەراز بۆ خۆمی نەوسن و چڵێس."

"نا..پێویست بە شەراب ناکات..مەیهێنەرەوە." جۆنسی ئەمەی وت و چاوەکانیشی بەسەر پەنجەرەکەوە ڕوابوون..سەیری دەرەوەی دەکرد. "ئەوەتا گەڵایەکی دیکەش هەڵوەری. نەخێر..واز بێنە..شۆرباکەشم ناوێت..ئەوەتانێ تەنها چوار گەڵای پێوە ماوە. بەر لەوەی تاریك دابێت.. حەزدەکەم بە چاوی خۆم دوا گەڵا ببینم کە هەڵدەورێت..ئەوسا منیش دەمرم و..ماڵئاوا."

سوو بەسەریدا نووشتایەوە و پێیوت: "جۆنسی.. گیانەکەم.. بەڵێنی ئەوەم دەدەیتێ کە چاوەکانت بنوقێنیت و لەم پەنجەرەیەوە چیتر سەیری دەرەوە نەکەیت تا من لەم ڕەسمانە تەواو دەبم؟ ئاخر بەیانی ئەم سکێچانە بۆ

خاوەنەکەی دەبەم..بە قوربان پێویستم بە ڕووناکی هەیە..ئەگەر بە گوێم نەکەی..پەردەکان دادەمەوە."
کەچی "سوو" بەوپەڕی ساردییەوە لێیپرسی: "ناکرێت لە ژوورەکەی دیکە ئەم ڕەسمانە بکەیت؟"
"ئاخر حەزدەکەم لای تۆ بمێنمەوە..بێجگە لەوەش..حەز ناکەم بەردەوام سەیری ئەم گەڵا هیچانە بکەیت." جۆنسی چاوەکانی داخست، سست و بێ گیان، ڕەنگی سپی هەڵگەڕابوو، دەتوت پەیکەرێکە و لەسەر قەرەوێڵەکە کەوتووە..پاشان وتی: " کە تەواو بوویت پێم بڵێ..چونکە حەز بەوە دەکەم دوا گەڵای ببینم کە هەڵدەوەرێت. من..چاوەڕوانی پەکی خستووم. بیرکردنەوە هیلاکی کردووم. دەمەوێت دەست لە هەموو شتێك بشۆم..نامەوێت بژیم..حەزدەکەم وەك یەکێ لەم گەڵا بێ دەسەڵات و ماندووانە هەڵوەرێم و بمرم..سەرنگوم بم."
سوو ـ ش پێیوتەوە: "هەوڵدە بخەویت..هەتا لای پیرە "بیرمان" دەچم و بانگی سەرەوەی دەکەم..دەمەوێت بیکەم بە مۆدێلی ئەو پیرە کانچییەی نیازمە وێنەی بکێشم..لە چرکەیەك زیاترم پێ ناچێت، نەجوڵێیتەوە تا دێمەوە".

پیرە بێرمان ـ ی هونەرمەند لە ژوورەکەی خوارەوە دەژیا..کەوتبووە ژێر ستۆدیۆکەی ئەو دوو کچەوە. تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕی بوو..ڕیشێکی پڕ و لوول کە لەگەڵ سەروپرچی تێکەڵ ببوو، ڕیشێکی وا کە کتومت لە ڕیشی پەیکەرەکەی موسا پێغەمبەری "مایکل ئەنجیلۆ"ی دەکرد..ئەو قژە پڕەی قەف قەف بە کەللەسەرێکەوە نوسابوو.. کەللەسەرێك کە نموونەی شەهوەت و هەوەسبازی و بەڕەڵڵایی بێت..بە بەژن و باڵایەکدا دەهاتە خوار کە کتومت لە عفریتێکی چکۆلانە و زیانبەخش و گاڵتەجاڕ دەچوو. بێرمان لە نێو دونیای هونەردا بێ ئومێد و هەناسە سارد بوو. چل ساڵی ڕەبەق دەست و فڵچەی شەڕیان بووە بێ ئەوەی توانیبێتی هیچ بە هیچ بکات. هەمیشە خەونی بەوەوە دەدی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان تابلۆ مەزنەکەی پێشکەشی ئەو خەڵکە بکات. بەڵام لەگەڵ ئەو خەونە گەورەیەشی فڵچەی نەخستبووە سەر کانڤاس.

بە درێژایی ساڵانێکی دوور و درێژ، هەر ساتە نا ساتێك، چەند ڕەسمێکی زەیتی شڕ و شێواوی بۆ بازرگان و پڕوپاگەندەناسەکان دەکرد.. بەوەش نانی خۆی



مسۆگەر دەکرد. جار جارەش دەبووە مۆدێلی ئەو هونەرمەندە لاوانەی گەڕەکەکە و لە بەرامبەریان دادەنیشت..کە لێدەبوونەوە پارەیەکی کەمیان دەخستە دەستی پیرە بێرمان..هەڵبەتە ئەو گەنجانەی نەیاندەتوانی پارەیەکی زۆر بدەنە ئەو کەسانەی مەسەلەی بوون بە مۆدێل ببووە پیشەیان. زۆر بە بێ تامیش پێکە "جن"ی هەڵدەدا و لە شاکارە مەزنەکەی داهاتووی خۆی دەدوا. بەڵام خوا هەڵناگرێت پیرەمێردێکی چکۆلانە و ئازا بوو..هەر کەسێکیش: بە خۆی وتبا: من ناسکم.. پیرەمێرد زۆر بە توندی و دڵڕەقانە گاڵتەی پێدەکرد و فشەی پێدەهات، خۆی کردبووە پاسەوانێکی بێدار و وریای ئەو دوو شۆخە هونەرمەندەی کە لە ستۆدیۆکەی سەرەوە دەژیان.. هەمیشە وەك سەگی شوانان دەیانپاراست.

"سوو" بە نیازی دیتنی پیرە بێرمان چووە خوارێ و سەری بە کولانەکەدا داگرت..ئەوەندە ڕووناك نەبوو بەرچاوی خۆی ببینێت، بۆنی جن و توترکی لێوە دەهات. لە قوژبنێکی ستۆدیۆکەدا کانڤاسێکی سپی و پاك بەسەر سێ پایەکەوە دیاربوو..ئەو کانڤاسە سپییەی سەر ئەو سێ پایەیە بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕەبەق چاوەڕێی یەکەم هێڵی شاکارە ڕەنگینەکەی پیرە بیرمان بوو، کەچی هەر لەوێدا، پاك و سپی، چاوەڕوانی دەست و فلْچەی بیرمانی دەکرد، سوو خەیاڵ و ترسی جۆنسی بە پیرەمێرد ڕاگەیاند..بۆی باسکرد کە چەند دەترسێت و چەندیش باریك و بنێس بووە، زەندەقی لەوە چووە وەك گەڵای پاییز سووك هەڵبوەرێت، بێ هیوا و نائومێد..تۆزقاڵێك دڵی بە دنیا خۆش نەماوە..خەریکە دەست لە هەموو شتێك بەردا و بمرێت.

چاوەکانی پیرە بێرمان سوور هەڵگەڕان و پڕ بوون لە ئەسرین، بەوپەڕی ناڕەزایی و گاڵتەوە دەنگی هەڵبڕی و فشەی بەم خەیاڵە پووچە دەهات:-



"هێی..سەیرە..لەم دونیایەدا خەڵکێکی ئەوەندە ساویلکە هەن بە کەوتنی گەڵای پیرە مێوێکی نەفرەتی دڵیان دادەخورپێت و وا دەزانن هەڵوەرینی گەڵایەك مەرگی ئەوانیش نزیك دەخاتەوە؟ من هەرگیز گوێم لە شتی وانەبووە، نەخێر..ئامادەش نیم بمکەیت بە مۆدێلی ئەو پیرەکەرەی گوایە دەڵێی کانچییەکی خواپەرست و ڕەبەنە. پاشان.. پێمناڵێیت چۆن لێدەگەڕێیت ئەم خەیاڵە پڕو پووچە بچێتە مێشکی ئەم کچەوە؟ ئای جۆنسی خنجیلانە و بەستەزمان....!"

" ئێستا زۆر لاواز و نەخۆش بووە، گرانەتایەکی ئەوتۆی گرتووە وڕێنە دەکات. زۆر چاکە ئاغای بێرمان..ئەگەر ناتەوێت یارمەتیم بدەیت پێویست ناکات..مەیە. بەڵام بەم چەشنە بێت..من وا هەست دەکەم کە تۆ پیرێکی چەپەڵیت..پیرێکی ئێسک گران و بەدخوویت."

"ئەوەیە..ئاخر تۆش هەر ئافرەتیت. "بێرمان دەنگی لێهەڵبڕی" کێ پێیوتیت نابم بە مۆدێل؟ پێشم کەوە..لەگەڵتدا دێم. نیو سەعاتە دەمەوێت بڵێم من ئامادەم لە بەرامبەرت دابنیشم و تۆش ڕەسمم بکەیت. حاڵی بوویت..ئێرە شوێنێکی ئەوەندە پوخت نییە بۆ کچێکی ژیکەڵە و چاکی وەك جۆنسی بە نەخۆشی تیایدا بمێنێتەوە، ڕۆژێك دێت خەونی عومرم بهێنمە دی و تابلۆکەم تەواو بکەم.. ئەوسا هەمووومان بە یەکەوە ئێرە بەجێدێڵین.. ڕزگارمان دەبێت..بەڵێ هەروا دەبێت."

کە ئەوان بە یەکەوە چوونە سەرەوە، جۆنسی لە گەرمەی خەودا بوو. سوو دەڕابەی پشت پەنجەرەکەی دادایەوە، لەگەڵ پیرە بێرمان ڕووە و ژوورێکی دیکە خشین. لەوێ..بەوپەڕی ترسەوە لە پەنجەرەیەکی کراوەوە سەیری بنەمێوەکەیان دەکرد. پاشان بێئەوەی چرپەیان لێوە بێت لە یەکدی ڕامان. بارانێکی بێ وچانیش سەرمای دەهێنا و دەباری، بەفر و بارانێکی تێکەڵ. بیرمان بە خۆو بە کۆنە کراسێکی شینەوە لەسەر کتلییەکی سەرەونخون دانیشت.
هەروەك بڵێیت کابرای کانچییە و لەسەر بەردێك دانیشتبێت.

دوای نووستنی سەعاتەوەختێك بەیانی دا، "سوو" ش لە خەو هەڵسا، سەیرێکی جۆنسی کرد و لەو دەمەدا چاوە زەقەکانی ئەبڵەق ببوون و سەیری پەردە سەوزەکەی دەکرد کە تا ئەو حەلە





دادرابۆوە. بانگی لێکرد و بە چرپەوە وتی:-
"پەردەکە لادە..دەمەوێت سەیرێکی دەرەوە بکەم."
سوو بەوپەڕی سستییەوە فەرمانەکەی بەجێهێنا، بەڵام..سەیرە..بە درێژایی ئەو شەوە لێزمەی باران و ڕەشەبای شێت نەسرەوتوون..لەگەڵ ئەو هەموو باو و بۆران و زریانەش..ئەوەتا هێشتا گەڵایەك بە ڕووی ئەو دیوارەوە خۆی گرتووە، دوا گەڵای ئەو بنەمێوە..قنچکەکەی هەر سەوزە، کەچی لێوە مشارییەکانی زەرد هەڵگەڕابوون..زەردی ڕزین و لەناوچوون..کەچی لە بەرزایی بیست پێوە ئازایانە خۆی بە لقێکدا شۆڕ کردبۆوە.
جۆنسی وتی:-"ئەمەیان دوا گەڵایە..وتم بە درێژایی ئەمشە و ئەم دوا گەڵایە هەر هەڵدەوەرێت. گوێم لە گڤەی رەشەبا بوو. بەڵام بۆ کوێ دەچێت.. ئەویش هەر دەکەوێتە خوارێ..ئەوسا لەگەڵ کەوتنی گەڵاکە منیش لێدەبمەوە و دەمرم.
"گیانەکەم..ڕۆحی من..!" سوو ئەوەی وت و ڕووە ماندووەکەی بەسەر بالیفەکەدا خوار کردەوە ؛ "ئاخر دە تۆ کچی چاکبە و بیر لە من بکەرەوە.. ئەگەر بیر لە خۆشت ناکەیتەوە.. بەزەیت بە مندا بێتەوە. ئاخر بێ تۆ چی بکەم؟"

کەچی جۆنسی وەڵامی نەدایەوە، سەیر و دەگمەنترین شت ئەوەیە کە ڕۆحێك خۆی بۆ سەفەرێکی دوور و پڕ نهێنی ئامادە بکات، ترس و خەیاڵی مەرگ سەری لێ شێواند بوو..ئەوەندە زووتر خۆی بۆ سەفەرە ئەبەدییەکەی ئامادە دەکرد. بەڵێ..هێدی هێدی پەیوەندییەکان دەپچڕان.
ئەو ڕۆژە، گران تێپەڕی، هەتا ئەو ساتەش دەیانتوانی لەژێر تەمی زەردەپەڕی ئەو ئێوارەیە دوا گەڵا بەدی بکەن خۆی بە قنچکەکەو بە ڕووی دیوارەکەوە هەڵواسی بوو، کە شەویش داهات..دیسانەوە بای باکوور شێتانە هەڵیکرد

و بارانەکەش بە خوڕ دەباری و دەیدا لەو تاقی پەنجەرە هۆڵەندیانە و لە هەموو لایەکیشەوە باراناوەکەی پیا دەهاتە خوارێ.
کە گزنگی داو دونیا ڕووناك بووەوە..جۆنسی زۆر دڵڕەقانە داوای ئەوەی کرد پەردەی پەنجەرەکەی بۆ لابەرن.

دوا گەڵا نەکەوتبوو، هێشتا وەکو خۆی مابووەوە، بۆ ماوەیەکی درێژ چاوی لەو گەڵایە نەتروکاند..پاشان بانگی "سوو"ی کرد کە لەو ساتەدا خەریکی تێکوەردانی فروجاوەکەی سەر ئاگرەکە بوو.
پاشان پێیوت:-
"سوودی..من کچێکی خراپ و بەدخوو بووم. هێزێکی پڕ لە نهێنی ئەم دوا گەڵایەی هێشتەوە تا بیسەلمێنێت من زۆر بڵح و بەدخوو بووم. گوناهێکی گەورەیە مرۆڤ حەز بە مردن بکات و بیخوازێت..تۆزێك شەرابی پورتوگالی بتکێنە ناو.. نا..وازبێنە یەکەمجار ئاوێنەیەکم بۆ بێنە..
یەك دوو سەرین بخە بەر پشتم..حەز دەکەم بە دانیشتنەوە سەیری تۆ بکەم کە خەریکی چێشت لێنانیت."
دواى تۆزێك وتی:
"سووی..بە ئومێدم ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕەسمی-نۆکەندی ناپلس ـ بکەم".



بۆ نیوەڕۆکەی دکتۆر هات و سەیری نەخۆشەکەی کرد، سوو بە بیانوویەکەوە کەوتە دوای دکتۆرەکە و لە هۆڵەکەدا گرتی..ئەمیش دەستە چکۆڵانە و لەرزۆکەکانی سووی خستە ناو لەپی و پێیوت:-
"تەواو..سەد دەر سەد چاکبوونەوەی مسۆگەرە. بەو خزمەتکردنە پوختە تۆ دەیبەیتەوە. لە خوارەوە نەخۆشێکی دیکەم هەیە و دەبێت بیبینم. بیرمان ناوێکە- گوایە دەڵێن: هونەرمەندە، ئەویش تووشی "سیل" بووە. پیر و کەنەفتیشە و دەردەکەشی کوشندەیە لێی بێ ئومێدم.. بەڵام ئیمڕۆ دەیبەنە نەخۆشخانە..بەڵکو لەوێدا باشتر بێت.".

بۆ ڕۆژی دووەم دکتۆر هاتەوە و بە سووی وت:-"تەواو..لە مەترسیدا نەما. سەرکەوتیت لەمەودوا ئاگاداری خزمەت و خواردنی بەو..بەس."
ئەو نیوەڕۆیە سوو لە پێخەفەکەی جۆنسی نزیك بۆوە، ئەویش بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە شاڵێکی شین و بێکەڵکی گرتبووە دەست و دەیچنی. سووش بە سەرینەکەوە جۆنسی گرتە باوەش و






باسکی تێوەرنا و پێیوت:-"مشکە سپییەکەم..دەمەوێت نهێنییەکت لەلا بدرکێنم..ئیمڕۆ پیرە بێرمان لە نەخۆشخانەکە بە نەخۆشی سیل مردووە، گوایە هەمووی دوو ڕۆژە تووشی ئەم نەخۆشییە بووە..کەچی دەرحاڵ برستی لێبڕیوە. لەسەر لە بەیانی ڕۆژی یەکەمدا دەرگاوانەکەی سەری بە ژوورەکەیدا داگرتووە و دیویەتی سست و بێ گیان لە ژێر باری ئازاردا کڕ کەوتووە، پێڵاو و جلەکانیشی تەڕ ببوون و لەو سەرمایەدا بەستبوویان. کەس نەیدەزانی لە شەوێکی وا ترسناك و تووشدا لە کوێ بووە، بۆ بەیانییەکەی چرایەکیان دۆزیبۆوە کە هێشتا نەکوژابۆوە..لەگەڵ پەیژەیەك کە لە شوێنی خۆیدا گوێزرابۆوە، چەند فڵچەیەکیش لێرەو لەوێ کەوتبوون..لەگەڵ پالێتێك کە چەند پەڵە ڕەنگێکی زەرد و سەوزی بەسەرەوە تێکەڵ ببوون، ئا..لە پەنجەرەکەوە سەیرێکی دەرەوە بکە..تا ئێستا لە خۆت نەپرسیوە بۆچی ئەم گەڵایە قەت ناشنێتەوە..بۆ ناجوڵێت؟ بەتایبەتی کە بایەکە هەڵیدەکات؟ ئاە..گیانەکەم ئەوەیە تابلۆ مەزنەکەی بێرمان..دوا شاکاری تەمەن..ئەو شەوەی کە دوا گەڵای بنەمێوەکە هەڵوەری..بێرمان ڕەسمی ئەم گەڵایەی کرد..!"



# ئەستێرەکان برینی مرۆڤن

## داستان بەرزان

مارس و ئەپریلی **2013**

**باوکە چاوەکانت بکەرەوە**
**سەیربکە مرۆڤ چیکرد**
**چاوەکانت بکەرەوە**
**سەیربکە باوکە سەیر.**
**سەیری مرۆڤ.**

**مرۆڤ فیلەکانی ڕاونا**
**باڵندەکانی فێری کۆچ کرد**

گیا و گەڵاکانی خوارد
کانیاوەکانی هەڵقوڕاند
قاز و کۆتر و ئاسکەکانی ڕاوکرد
شاخەکانی کرد بە هاوینە هەوار
دۆڵەکان بە دەریاچەی دەستکرد
ئەشکەوتەکان بە سۆپەرماکێت
دایناسۆرەکان بە یاریی منداڵان
پڵنگ و مەیمون و گورگوکان بە لێبوک
ماسیی و بۆق و کیسەڵەکان بە مەدالیا
هەر بۆ ئەوەی بژی
بژی مرۆڤ.

مرۆڤ، چاڵی بۆ مرۆڤ هەڵکەند
مێخی بە جەستەی مرۆڤدا داکوتی
سەری مرۆڤی بڕی
مرۆڤی ژەهرخوارد کرد
مرۆڤی گوللەبارانکرد
دڵی مرۆڤی شکاند
پێستی مرۆڤی داماڵی



هەر بۆ ئەوەی بژی
بژی مرۆڤ.

مرۆڤ ناسروشتی عەشقی کرد
ناسروشتی سێکسی کرد
ناسروشتی دەستەکانی خوێناوی کرد
ناسروشتی بیری لە گەردوون کردەوە
ناسروشتی منداڵی خستەوە
هەر بۆ ئەوەی بژی
ژیانێکی پۆخڵ.



مرۆڤ بە تاریکیدا ڕۆیشت
بە ناو ئاگردا ڕایکرد
بەرگەی سەرمای زۆر و
شەڕی زۆر و
خەمی زۆر و
گریانی زۆری گرت
هەر بۆ ئەوەی بژی
ژیانێکی بێباک
مرۆڤ بوو بە کۆیلە

کۆیلەی خەیاڵی ئەفسانە
کۆیلەی خەونی ئایین
کۆیلەی پێشبینیی زانست
کۆیلەی ژیانی سەرمایە
کۆیلەی مرۆڤی کۆیلە
هەر بۆ ئەوەی بژی
ژیانێکی سەرشۆڕانە.

مرۆڤ نواندنی کرد
فێری موزیك بوو
وێنەی کێشا
شتی نووسی
قسەی کرد
گوتاریدا
هەر بۆ ئەوەی بژی
ژیانێکی حیزانە.

ژیانی پۆخڵ
ژیانی بێباك
ژیانی سەرشۆڕانە



ژیانی حیزانەی مرۆڤ
درێژەی هەیە و
مرۆڤ دەژی
بژی مرۆڤ.



مرۆڤ لەسەر شاخەکان هاواری کرد
دەنگی لە جەستەی مردووی پڵنگێکدا بیسترا
مرۆڤ لە ناو دۆڵەکانەوە هاواری کرد
دەنگی لە دڵی وەستاوی سێوێکدا بیسترا
مرۆڤ لە کەنار دەریاکاندا هاواری کرد
دەنگی لە ناو شەپۆلێکی بەستوودا بیسترا
مرۆڤ لەسەر درەختەکان هاواری کرد
دەنگی لە ژێر باڵی چۆلەکەیەکی سپیدا بیسترا
مرۆڤ لەسەر زەوی هاواری کرد
خودا راچڵەکی، بەو چەشنەی ئێستا دیار نەما
مرۆڤ لە بۆشایی ئاسماندا هاواری کرد
ئەستێرە شکا، بەو چەشنەی ئێستا بە
فەزادا بڵاوبۆوە
مرۆڤ لەسەر هەورەکانەوە

هاواری کرد
مانگ سپی هەڵگەڕا، بەو چەشنەی ئێستا غەمگین بوو.

مرۆڤ زیاد لە پێویست هەوای هەڵمژی
زیاد لە پێویست ئاو و ئاگری بەکارهێنا
زیاد لە پێویست لە خودا نزیکبووەوە
زیاد لە پێویست شەیتانی بەنەفرەت کرد
زیاد لە پێویست ژیانیکرد
زیاد لە پێویست مرد
هەر بۆ ئەوەی بژی
بژی مرۆڤ.

مرۆڤ ماچی مرۆڤی کرد
مرۆڤ بانگی مرۆڤی کرد
مرۆڤ نیگەرانی مرۆڤ بوو
مرۆڤ خوێنی لە مرۆڤ هێنا
مرۆڤ خۆی لە مرۆڤ داماڵی
مرۆڤ گۆشتی مرۆڤی خوارد
مرۆڤ هانای بۆ مرۆڤ برد
هەر بۆ ئەوەی بژی



بژی مرۆڤ.

بۆچی نەتانهێشت درەختەکان تەنیا درەخت بن؟
بۆچی نەتانهێشت مانگ تەنیا مانگ بێت؟
بۆچی نەتانهێشت خۆر تەنیا خۆر بێت؟
دۆڵ و شاخەکان تەنیا دۆڵ و شاخ
ئەستێرەکان تەنیا ئەستێرە
مرۆڤ تەنیا مرۆڤ
خودا تەنیا خودا
هەر بۆ ژیان؟

باوکە مەنوو
سەیربکە مرۆڤ سەیر
چیکر بۆ ژیان
سەیربکە، سەیر.

باوکە چاوەکانت بکەرەوە
مەنوو باوکە مەنوو.



# ئاوگوست ستریندبێرگ

**ژیانی مرۆڤێکی بێدەرەتان و نووسەرێکی ڕچەشکێن**

**بیۆگرافیا و ڕاڤەکردن**




ڕۆژی جیهانی شانۆ





# مانەوەی ژیان لەناو شیعردا



## سەباح رەنجدەر

کانوونی دووەمی 2012 هەولێر

من بەهەمان ئازار شیعر دەنووسم، کە پێی لە دایکبوویمە. شیعریش هان دەدەم لە پێناو سەربەخۆیی خۆیدا خەبات بکات.

شیعر گیان و باڵی داهێنەری قەقنەسە، بەردەوام ژیان تێیدا نوێ دەبێتەوە و ژیانیشی تێدا دەمێنێتەوە. لەم نوێبوونەوە و مانەوەیەدا خەیاڵی داهێنەر، یان هێزی خەیاڵکردن دەگاتە یەکێتییەکی تەواوی نێوان شیعرییەت



و زمان و
شیعرییەت و بوون و نوێبەخشی دیدگا.
شیعر هەموو شتێك لەبەریەك هەڵدەتەکێنێ و لەناوخۆیدا دەیتوێنێتەوە و دەیکاتە کەرەستەی پێویست بۆ بەکارهێنانان و ئامادەبوون. هەر دەبوو شیعر بێتە سەر ئەو زەمینە و ناو کۆمەڵگا تا مرۆڤی هاوچەرخ دەربڕین لە خودی خۆی و ئاخاوتنە جیاوازەکان بکات و ئاخاوتنە جیاوازەکانیش نزیکایەتییەکی پتەویان لەگەڵ یەکدا لا پەیدایە و گفتوگۆ دەکەنە هێڵ و هێما و هەناسەدان و هەناسەدانەوەی تاك و کۆی کۆمەڵگا و زمان و بوون و هەلومەرجی ناوەوەیان .
لە ئەزموونی خۆمدا زیاتر سەرقاڵی ناوەوەی خۆمم و کەمتر دنیای دەرەوە تووشی سەرسووڕمان و واق وڕمانم دەکات، بەڵام بڕواشم بەوە بەهێزە دنیای دەرەوە، کەم و زۆر کاریگەری لەسەر دنیای ناوەوە هەیە و دەیخەملێنێت. ڕایەڵ و هێڵ و هێماکانی سروودی زەوی زیاتر بەتەنگ زمان و شێوازەوەن و شەش دەق دەناسێنن، کە ڕووبەڕووی چڕیی مانابوونەتەوە. هەر هەمووشیان شاکەس و کەسی دیاریان تێدایە. شاکەس و کەسی دییاریش ڕووداوەکان ڕوون دەکەنەوە. بەشێوەیەك هەڵسوکەوتم لەگەڵدا کردوون وەك کەسی نادیار و دوورییەکی و دوورەدەست و نیمچە مەحاڵ وەرمگرتوون و تێکەڵ بە بوونێکی گەردوونم کردوون، لەفەزایەکی ئەفسانەیی و ڕۆحی بانگیان دەکەم بۆ بینین و دۆزینەوە. ئەنجام لەفەزایەکی پاکیزەدا ئەفسوونی دەنگێك. دەنگێکی کارامە و چالاك بەنەرمی پەردەی گوێ دەلەرێنێتەوە و دەیەوێت تێکەڵ هەستەکانی ترببێت، بەڵام نە دەتوانم ببینم و نە بیدۆزمەوە. لەهەمان کاتیشدا ئەفسوونی ئەم دەنگە نادیارە لە فەزای هەموو شیعرەکاندا دەبیسترێت، ئەفسوون و دەنگێکە بۆ هەموو ژیان. لەهەندێك بەشیدا دەچێتە ناو فۆرمی نامۆییەوە. ئەم نامۆیییەی مرۆڤی هاوچەرخ لە ئەنجامی هەستیاری زۆر تایبەتیدا لەگەڵ دەسەڵات و مافیاکانی دەسەڵات دووچار و گیرۆدەی بووە. دەیەوێت ئەو بوونە ڕەهایەی خۆی بدۆزێتەوە، کە بەهۆی هەستەکانی لەفەزا پاکیزەکاندا بەدوای ئاراستەکانیدا دەگەڕێت و فۆرمی ڕەهای بۆ درووست دەکات. هەرشەش دەقی ئەم ئەزموونە نوێنەرایەتی ئەم فۆرمە ڕەهایە دەکەن، هەر هەمووشیان لە



جیها نی
شێوازیدا یەك شێواز دەهێننە
ئاراوە، بەڵام لەجیهانی بابەتیدا هەر دەقێك بنیاد و
دۆخی سەربەخۆی هەیە.
لە بنیادی جۆرا و جۆری دەقەکاندا بۆ ڕێکخستنی وشە و دابەشکردنیان لە ڕووبەری سپی کاغەزدا کارێکی تایبەتکار و دیاریکراوم نەکردووە، کە ببێتە تەواوکەری وێنە و خوڕکردنی ترپە و ئاواز و دەنگەکان، بگرە وێنە و ترپە و ئاواز و کردە دەنگییەکانم بە تەواوی بە دوای یەکدا ڕێك خستوون و لێکم دوورنەکردوونەتەوە، بیرۆکەشم نەکردووەتە دەربڕینێکی مۆسیقایی، یان بەرجەستەکردنی بنیادێکی مۆسیقایی. هێڵی پێوەندیم لە نێوان ئاراستەکان و پێکهێنەری دەروونی دروست کردووە و بەهای ڕاستەقینە وەردەگرێت. ترپە و ئاواز خرۆشێکە بەهۆی لەرە و زرینگانەوەی زمانەوە دەربڕین لە واتایەك دەکات، واتاکە لە خاڵێك دەست پێدەکات و سووڕی بازنەیەك تەواو دەکات و بازنەکە تەواو پڕ دەکات و دەدرەوشێنێتەوە. لەو بڕوایەدام هەر ئەزموونێکی شیعری بێگەرد لە بوونی بێگەردیدا دیاردەیەکی شیعری زمانە و لە ئاکامیشدا ئەوپەڕی دەرکەوتن و نوێبەخشییە. هەمیشەش بەدوای هۆ و ئامانجی نوێبەخشییەکەیدا دەگەڕێت. ئەم بەردەوام گەڕانە خەسڵەتی سەردەمە. بەنیازی دۆزینەوە و بەرجەستەکردن، هەنگاوەکانی لە زەمینەی هەوڵدان هەڵدەگرێ و لە زەمینەی داهێنان دایدەنێت.
چەمکی زمان جێگیر نییە و گەشەسەندن و دەوڵەمەندبوونی دانە پەیڤیش وەڵامدەرەوەی پێداویستییەکانی سەردەمە. من پێستی هەموو چینەکانی جەستەی وشە لە ڕووی دەنگ، پێکهاتە، واتا، ڕێزمان هەڵدەدەمەوە تا دەگەمە کرۆك و گیانی پڕ وزەی. ئەوجا بەکاری دەهێنم و دەبێتە وەڵامدەرەوەی پێویستییەکانی سەردەم. گفتوگۆکردن لەگەڵ پێداویستییەکانی سەردەم، خەسڵەتی نوێبەخش و نوێبەخشییە.
شیعر ڕەوانبێژی و چالاکییەکی زەینییە. بەبێ ئەمانە شیعرییەت دروست نابێت. شیعرییەت ئامادەیی ئەوەی تێدایە وەڵامی هەستەکانی خوێنەری کارامە و چالاك لەباری دەربڕین و کاریگەرییەوە بداتەوە. ئەو هەستەی من بەرانبەر بەشکۆی کتێبە ئاسمانییەکان هەستێکی سرووشتی و پێگەیشتووە، بۆ من شێوەیەکی ڕاستەقینە و کولتوورێکی جوانییە، نەك ئارەزوویەك. هیچ ئارەزوویەکی ساتەوەخت و کاتیش ناتوانێت بەرانبەر ئەم هەستە



ڕێگری
و بەرگری بکات. هەست دەکەم لەناو
کتێبە ئاسمانیەکاندا ژیان و هەستەکانم پڕ و بێ
کەموکوڕین. بۆ من بوونەتە ئەشق و چێژی جوانی و
شادمانی دەبەخشێت. شادمانی بەخشیش هۆکارێکی
سەرەکی و بەهێزی بەردەوامبوونی ژیان و سەرچاوەی
نوێبوونەوەیە. ئەو نوێبوونەوەیەی لە گیان و باڵی
قەقنەسەوە وەك بۆماوەیی بۆم ماوەتەوە. ئەم بۆ
ماوەییە ڕۆڵێکی گرینگ لەتازەکردنەوەی زمان و شێواز
و خەیاڵی شیعریی دەبینێت. چێژ وەرگرتن لەجوانی
و مانەوە و نوێبوونەوە لەناو جوانیدا تواناداریيە.
جوانیویست هەرچەندە بچێتە ناو سرووشتی جوانی و
بمێنێتەوە و ئاشنایەتی لەگەڵ ڕیشاڵەکانی ببێتە برای
خوێنی، ئومێدی بەرانبەر دیدگا بەهێزبوون دەخەمڵێ و
پەیبردن بەنیشانەکانی جوانی فۆرمی نوێی دەوێت و لە
خەمڵینی خۆشیدا فۆرم دروست دەکات.
درووست بوونی هەموو فۆرمێك و هەموو شتێکیش لای
من بە شیعری بێگەرد بەستراوەتەوە. یەکەمین ڕێزلێنان
و خۆشەویستیش بۆ شیعری بێگەرد، تێگەیشتنە لێی و
نەرمونیانی شیعریش لە کەسایەتیت بچەسپێت و ڕەنگ
بداتەوە.
کەسێك ئەشقی
شیعری نەناسیبێت، ناتوانێت
شاعیری ڕاستەقینە بێت. ئەشقی شیعر وەك
ئایین بڕوای دەروونییە، خۆشەویستی یەکەمم
بۆ خودا و شیعرە، پلە بە پلەش بۆ خوارەوە.
مرۆڤی هەستیار و بڕوادار، کە دەگاتە قۆناغ
و تەمەنێك بەشێوەیەکی ڕۆحی بیر لەژیانی
خۆی و دەوروبەری خۆی دەکاتەوە.
من بەهەمان ئازار شیعر دەنووسم، کە پێی
لە دایکبوویمە. شیعریش هان دەدەم لە پێناو
سەربەخۆیی خۆیدا خەبات بکات.
پێوەندی من بەکتێبە ئاسمانییەکانەوە و
ئەنجامی ئاشنایەتییان بنەما و هۆکار و
جۆشدەر و کارتێکردنی ئەم ئەزموونەمن و
بایەخی تایبەتییان هەیە. ڕاستە هێڵێکن ڕەوتی
ڕۆیشتنی منیان بە خوێن و گۆشت و ئێسکەوە
تێدا دەبیندرێت. هەناسە شیعرییەکانم
وەرنەگرتووە، بگرە خۆم تێکەڵە بەشکۆی
هەناسەکان کردووە و خۆشم پاراستووە لە
ڕەسەنی دەقەکان و بابەتی بەرجەستەکراو.
بە ئاستی توانا هاوتاییم دروست کردووە.
بەشێوەی ڕێکخستنە پەخشانییەکانی کتێبە
ئاسمانییەکان کاریگەر نەبوویمە. بگرە



هۆگری
پڕ مەبەستی ناوەرۆکیان
بوویمە و بنەمای بۆچوونمیان داڕشتووە و
کاریگەری خۆیان بەشێوەیەکی ڕوون چەسپاندووە.

ئەم وەرچەرخان و گۆڕانکارییەی بەسەر بوونی، شیعریی و ژیانی مندا هات لە ئەنجامی ڕووداوێك بوو. 6/12/1995 ئۆتۆمبێل منداڵە نۆبەرەکەمی شێلا. بۆماوەی حەفتاوپێنج چرکە منداڵەکەم گیانی تێدا نەما و مرد. چوار دکتۆریش لە مردنیدا دڵنیایان کردمەوە. لە دۆخێکی زۆر خراپدابووم و لە هەموو هەستەکانمەوە شڵەژابووم، هێشتاش شڵەژانی ئەم ڕووداوە بەری نەداوم. لەم چرکە زۆر تایبەت و کاریگەر و هەستیارەدا، بە دڵ نزام بۆ خودا کرد. لە نزاکردنەکەمدا دڵم زۆر بەهێزبوو، لە شوێنی شیاوی نزاکانم دڵم لێی دەدا. وام دەزانی لەناوەندی گەردوون ڕاوەستاوم و مەیدانخوازی داوا دەکەم، خاڵی کۆتایی بوونم نیشاندراوە و شەڕی ئەم نیشاندراوە دەکەم. هێشتان دەستم بەئاسمانەوە بوو، منداڵەکەم گیانی تێدا گەڕایەوە و زیندوو بووەوە و دەماری لێی دا. بەئاواتەوەم ئەم چرکەساتە بگرم و دەربڕینی لێ بکەم. ڕۆژی لە دایکبوونی منداڵەکەمم کردووە بەم ڕێکەوتە و هەموو ساڵێك لەم ڕێکەوتەدا ئاهەنگی لەدایکبوونەوەی بۆ دەگێڕم. ئەم ڕووداوە وای لێکردم بەشێوەیەکی زۆر لە دڵەوە بیر لەبوون و هێزی ڕەهای خودا بکەمەوە و زەمینەیەك لە نێوان بەرهەمەکانی خۆم و کتێبە ئاسمانییەکان خۆش بکەم. هەوڵی زیاتریش بدەم بۆ تێگەیشتن لە چییەتی کتێبە ئاسمانییەکان و کاریگەریان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری کۆمەڵگای کوردی. بۆ ماوەیەکی زۆر کەوتمە کۆکردنەوە و خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی لەبارەی بیری کتێبە ئاسمانییەکان نووسراون و لێکدراونەتەوە. قورئانیشم بەدوو وەرگێڕانی جیا جیا چوار جار خوێندەوە، چوومە ناو ڕووناکییان و لەناو ڕووناکییان خانەکانم دۆزییەوە و تێیدا نیشتەجێ بووم، بەڵام خانەی ڕووناکییەکانی قورئان زیاتر لە تەورات و ئینجیل لەناو خۆیاندا دایانگیرساندم و لە خۆیان نزیك کردمەوە.

ئەم ڕووداوەم کردە بنەما و ئەشقی زەمینیم بۆ ئەشقی ئاسمانی گواستەوە و بێ ئەم ئەشقەش ناتوانم مەزندەی ژیان بکەم ، کە بەو ئەشقەوەش دەنووسم، هەست دەکەم لە جیهانی واقیعدا ئەرکێکی جیهانی زەینی جێبەجێ دەکەم. شاعیری ڕاستەقینە هەستەکانی لە ئاست تەواوی ڕووداوەکانی ناخی خۆی و دەوروبەری



بەئاگایە و بچووکترین
ڕووداو وەردەگرێت. ڕووداوە گرینگ و
کاریگەرەکانی ژیان دۆخی دەروونین و لە کرۆك
و ناوکی شیعرەکانیدا دەناسرێنەوە. شیعر خۆی
ڕووداوە، یان ڕووداوی واقیعی، یان ڕووداوی
زەینی. هەندێك جاریش باری نائاگایی تێکەڵ
دەبێت و دەچێتە دۆخی سەرسامییەوە.
ئەم ڕووداوە ئاسۆ و دوورییەکانی ژیانی بۆ
دەستنیشان کردم. چی بکەم و چی نەکەم. چۆن
و خەریکی چ جۆرە بوونێکبم. پێش ئەم ڕووداوە،
ئایینم بەدەستکرد و خەیاڵی مرۆڤ دەزانی.
لە کتێبە ئاسمانییەکاندا وشە خەیاڵ نییە و
خەیاڵیش وشە نییە، ناوەندێکی مانا هەیە ماڵی
هەبوونە. دەبێت سرووشتی ئەم ناوەندەش باش
بناسین. سەرەتا دەپرسین خودی ناوەند چییە و
ناوەند لە پێناو چیدا درووست دەبێت. لە ڕێگای
هێما و هێماپێکراوێك پێمان دەگات، یان ئەو وەك
واقیعیکی بە زەبر و دەسەڵاتێك ئێمە دەناسێت
و دەوروبەرمان پێدەناسێنێت و لەناوەندی خۆیدا
کۆمان دەکاتەوە، لە ڕێگای زمانەوە ناو و قەوارە
ما نا ما ن
پێدەبەخشێت و
دەمانباتە بواری تایبەت و بوونەوە.
زمانی شاعیر خوێنەری کارامە و چالاك بە ناخ و
خودی شاعیر دەگەیەنێت و ناخ و خودی شاعیریش
نیشانی خەڵك دەدات و زمان بەڕێوەبەرایەتیی خودی
شاعیر دەکات و ئاراستەکانی مانا و ئێستێتیکی
بۆ دەدۆزێتەوە. ئەو پرسیارانەی لەناو کتێبە
ئاسمانییەکاندا شەپۆل دەدات، هەموویانم هێناوەتە
سەرزەوی واقیع و کردوومەتەوە پرسیار و لەمەڕ
هەموو شتێکی دنیام کردوونەتەوە و دەمەوێ یاسای
ئێستێتیکی بەو جۆرە ڕێك بخەمەوە، کە خۆم تاسە
و تامەزرۆییم بۆی هەیە. لە ڕێگایی ئەم هەستە
شیعرییەوە بەوە گەیشتووم کوردستان بۆ من
تاراوگەیەکە و مێوانێکی یەك دوو ڕۆژەم تێیدا.
زۆر جار لە خوێندنەوەی دەقێکی شاکار دەچم لە
نیشتیمانی نووسەرەکەدا وەك هاووڵاتییەکی بێگەرد
دەژیم و بە تانوپۆی شوێن لە دەقەکە و زەمینەی
نووسینەوە پەیوەست دەبم.
بەهیچ پێودانگێك پێم لە بازنەی شوێن لە نووسیندا
ناخەمە دەرەوە، خودی خۆم دەکەمە نیشتیمانم. لە
دەرەوەی شوێن لە نووسیندا هەست بە تاراوگەکراوی
دەکەم. شوێن لە ئەدەبدا بۆ من شێوەیەکی





ڕاستەقینەی هەیە و بۆ ژیان هەڵمبژاردووە. لەو ئەزموونەمدا لە ڕێگای قووڵبوونەوە بە مێژوودا لە چەمکی بوون و دووبارەبوونەوەی کارەساتە مرۆییەکان دەکۆڵمەوە و هەڵیدەکۆڵم و کاردانەوە نیشان دەدەم، کاردانەوە بەهەردوو باردا، باری ئەرێنی و باری نەرێنی. بەهەموو ئەو دەرفەتانەوەش دەژیم، کە دێنە سەر ڕێگام و لە خاڵ و هێڵی دامەزراندنی نووسین لە ئاکارە سەرەکی و گرینگەکانم دەبن و بەهابەخش بۆ ڕێکخستنی ڕایەڵی مانا و دۆخی خواستراو.
هەرچەند جارێك دەچمە دۆخی شیعرێکی نوێوە، هەست دەکەم یەکەم جارمە ژیان دەبینم و ڕووبەڕووی دەوروبەر و پێداویستییەکانی ژیان دەبمەوە و لەناو فەزایەکی بێگەرد و پاکیزەدا شەپۆل دەدەم و کەوتوومەتە ژێر کاریگەری خەیاڵ و دیدگا و واقیعەوە و بیرکردنەوەی مرۆڤی هاوچەرخ بە هەموو دیاردەکانی پێوەندیداریانەوە وێنا دەکەم و هەوڵ دەدەم یارمەتی هەستی ئێستێتیکیان بدەم.
سوپاس بۆ شیعری بێگەرد هەموو دەم وای کردووە جێگای شانازیم بێت، لە هێزی نادیاریش داوا دەکەم جێگای شانازی شیعری بێگەرد بم.
من بەهەمان ئازار شیعر دەنووسم، کە پێی لەدایکبوویمە. شیعریش هان دەدەم لە پێناو سەربەخۆیی خۆیدا خەبات بکات.

# دەبێت بڕۆیت؟

## ژیانم لەگەڵ هارۆڵد پینتەر

### دانا رەئووف

هارۆڵد پینتەر و خاتوو ئەنتۆنیا فرەیسەر، بۆ یەکەمجار لە هەشتی مانگی یەکی ساڵی ١٩٧٥ دا، بە رێکەوت و بەهۆی هاوڕی هاوبەشەکانیانەوە، لە میوانداری ئێوارەخوانێکدا یەکتری دەبینن.
بە درێژایی ئەو شەوە هیچ کامێکیان ڕێك ناکەوێت قسە لەگەڵ ئەویتر بکات، تا ئەو چرکەساتەی ئەنتۆنیا فرەیسەر خەریکی رۆیشتە. هارۆڵد پینتەر لەو کاتەدا و لەپڕ بە چاوە ڕەشە چڕەکانیەوە سەیرێکی دەکات و بە هێمنی پێی دەڵێت:" ئەبێ بڕۆیت؟" ئەنتۆنیا فرەیسەر بەخێرایی بیر لە کارەکانی رۆژانی دوایی خۆی دەکاتەوە، کە دەبێت بیانکات؛ بۆ نموونە منداڵەکانی بەرێت بۆ قوتابخانە، کار لە کتێبە تازەکەیدا بکات ... هتد، لەگەڵ ئەوەیشدا بەبێ دوودڵیی دەڵێت:" نەخێر .. بەهیچ شێوەیەك پێویست ناکات بڕۆم." بەو شێوەیە ئەو شەوە دەبێتە سەرەتای خۆشەویستییەکی گەورەی نێوان پینتەر و ئەنتۆنیا فرەیسەر، کە زیاتر لە سیی



ساڵ دەخایەنێت و بۆ هەتاهەتایە ژیانی هەردووکیان لە بنەڕەتەوە دەگۆڕێت. دوای مردنی پینتەریش، فرەیسەر لە کتێبێکی چوارسەد لاپەڕەییدا، یادەوەری و یاداشتە تایبەتییەکانی ژیانی ڕۆژانەی ئەو سیی ساڵەی خۆیان ۱۹۷۵-۲۰۰۸ دەگێڕێتەوە.

فرەیسەر ئەم چیرۆکە یادەوەرییەی، کە لە ماوەی سی و سێ ساڵدا نووسیویەتی، ڕۆناوە. ئەم شوێنپێ هەڵگرتنە ورد و ڕۆژانەیە تەنها چیرۆکی خۆشەویستی ئەم دوو نووسەرە پینتەر/ فرەیسەر ناگێڕێتەوە، بەڵکو بیۆگرافیایەکی نزیك و هاودەمی پینتەرە، لەهەمانکاتدا خستنە روویەکی تەواوی چینە بەرز و ئەرستۆکراتەکەی کۆمەڵگەی ئینگلیزی دەیەی نەوەدەکانیشە.

پینتەر وەك شانۆنامەنووسێکی بەتوانا، دەرگایەکی نوێ و جودا بەڕووی شانۆیەکی مۆدێرنی ئەورووپیدا دەکاتەوە، لەم شانۆیەدا بە ئاسانی دنیابینی و جیهانە شاراوە و پڕ لە راز و نهێنییەکان لە جیهانە دیار و ئاشکراکان جیاناکرێنەوە. ئەتمۆسفێر و ستراکتوری رووداو و کارەکتەرەکانی لە بۆتەیەکی توندوتیژ و هەڕەشەئامێز و دوژمنکاریدا دەسوڕێنەوە.

لە ژوورێکی واقیعیەوە، لە ناو چوار دیواری ماڵە ئاساییەکانەوە، لە شێوازێکی تەبای دراماتۆرگییەوە دەمانگوێزێتەوە بۆ جیهانێکی ریالیزمی ئەندێشەئامێز و تەلیسماوی نادیار. رستە کورت و وچانە درێژ و وشە هێماگەلییەکانی، بینەران دەخاتە دڵەڕاوکێ و چاوەڕوانییەکی ترسناك و بەردەوامەوە.

پینتەر لە ساڵی ۱۹۳۰ دا لە لەندەن و لە ناوچەی ئێست ئێند لەدایك بووە، لە ساڵی ۲۰۰۵ دا پاداشتی ئەدەبی نۆبڵ وەردەگرێت و لە ساڵی ۲۰۰۸ دا و لە تەمەنی

حەفتا و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات. کە پینتەر و خاتوو فرەیسەر یەکتری دەبینن، هەردووکیان تەمەنیان لە سەرو چل ساڵییەوە دەبێت، هەردووکیان ژیانی تایبەتی خۆیان و پێشتر بە ئەزموونی هاوسەرگیریدا ڕۆیشتوون، پینتەر نووسەرێکی رادیکاڵی جوولەکە، زیاتر لە بەرەی چەپەکانەوە نزیك بووە و خانمە ئەکتەری ناسراوی ئینگلیزی (فیفیان مێرچنت) هاوسەری بووە. هەرچی ئانتۆنیا فرەیسەر- یشە ئافرەتێکی کاسۆلیك، ئەرستۆکرات و دایکی شەش منداڵ، مێردەکەشی هیو فرەیسەر سەر بە پارتی پارێزگارەکان و ئەندامی پارلەمانی بەریتانی بووە.

ئەنتۆنیا فرەیسەر بەر لە چەند ساڵێك ئەم بیرەوەری و یاداشتانەی ژیانی هاوسەری خۆی و پینتەر لە بەرگێکی گەورەدا بڵاو دەکاتەوە و هەر زوویش وەردەگێڕدرێتە سەر زۆربەی زمانەکانی دونیا.

ئەنتۆنیا فرەیسەر لەسەرەتاوە، ئەم یاداشتانەی بۆ ئەوە نەنووسیوە تا دواتر بڵاویان بکاتەوە، بەڵکو بۆ خۆی نووسیوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕووداوەکاندا بژی و لەبیری نەچنەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت زەمەن، گەر لەسەر ڕووپەڕی کتێبەکانیش بێت، بۆ تاوێك بووەستێنێت. زەمەن لەم کتێبەدا وزەیەکی بەهێز و ئامادەبوونێکی لەبەرچاوی لە دێڕ و وشە و ساتەوەختی ڕۆژەکاندا هەیە و یادەوەرییەکان، لە گەڕانەوەی زەمەندا سەرلەنوێ و بەشێوەیەکی زیندوو، بەرجەستە دەبێتەوە.
ئەنتۆنیا فرەیسەر لە ٢٨ ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٨٠دا دەنووسێت:" من ئەم یادەوەرییانە بۆ ئەوە نانووسم تا ببێتە ئەدەبێکی گەورە، بەڵکو ئەمە هاوڕێکەمە، دۆکیومێنتێکە دەربارەی ژیانی هەردووکمان و هەندێك جاریش دڵنەواییەکە ..."
ئەنتۆنیا فرەیسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات،










که هەر دوای دوو مانگ بەسەر مردنی پینتەردا، دەستی کردووە بە نووسین و ئامادەکردنی ئەم کتێبە، ئەمەیش جۆرێك بووە لە دڵدانەوە و سەرلەنوێ ژیانەوەی ئەو ڕۆژگارانە و بەڕەنگاربوونەوەی ئەو خەمە گەورەیەی، کە پینتەر لەدوای خۆی جێی هێشتووە.

ئەم یادەوەرییانە بە شێوەیەکی ساکار تیشك دەخاتە سەر ژیانی پینتەر و وەك کەسایەتییەکی ئاسایی و مرۆڤێکی میهرەبان، لە ڕاڕەوە تاریکەکانی ژیانەوە، لەودیو نووسینی شانۆنامە پڕ لە ڕاز و نهێنییە توندوتیژەکانییەوە، دەردەکەوێت و ئەو کلێشە و وێنە تەبایانەی، کە خوێنەر و ڕەخنەگرەکان لەلای خۆیان سەبارەت بە کەسایەتی پینتەر دروستیان کردووە، بە تەواوی دەشکێت. ئەم نووسەرە ئەبسورد و تۆقێنەر و نادیارەی ناو شانۆنامەکانی، وەك کەسێکی میهرەبان و عاشق و ناسك دەردەکەوێت.

نووسەر بەم یاداشتگەلە ڕاستگۆ و لێوڕێژ لە ژیانە، هەستێکی (لێرە و لە ئێستا) ی خوڵقاندووە و خوێنەر دەباتە ئەودیو پەردە دادراوەکانەوە و وێنەیەکی ڕاستەقینەی ڕەوش و ژیانی ڕۆژانەمان پیشان ئەدات.

ئەم یادەوەرییانە بە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانییەوە، ئەدەبێکی تایبەتمەند دەخوڵقێنێت و مانا دەبەخشێت بەهەموو ئەو ڕۆژگارانەی بەسەرچوون، بە جووڵانەوە ئاساییەکانەوە، بە ساتەوەختە ساکارەکان و بە ساتە چڕەکانی پرۆسەی داهێنانیشەوە.

نووسەر بە ڕستە کورتەکانی دەسپێکی کتێبەکە، تا کۆتایی و هەڵکشانی ڕووداوەکان، درامایەکی بەهێز دروست دەکات، که تەنها دوو کارەکتەر، پینتەر/

فرەیسەر لە ناوەندی ڕووداوەکاندا، هێدی هێدی گەورە دەبن. ئەم کتێبە تەنها دەروازەیەك نییە بۆ ژیانی ڕۆژانە و ئەو چیرۆکە خۆشەویستییە بەتین و بەهێزەی نێوان پینتەر و ئەنتۆنیا فرەیسەر، بەڵکو پێناسە و تێڕوانینێکیشە بۆ کەسێتی ئەم دوو نووسەرە، بەتایبەتی لە بوارەکانی شانۆ، ئەدەب و سیاسەتدا.
هەروەها لەم یاداشتانەدا وێنەی پینتەرێکی بەختیار لەژیانی هاوسەرگیریی و خێزانیدا دەبینین، ژیانێکی پڕ لە ماچی تەڕ و گوڵی بۆنخۆشی جوان و گفتوگۆی گەرم و پڕ لە خەندە. خوێنەر چیرۆکی عەشقی دوو مرۆڤ دەخوێنێتەوە، کە بە یەکەوە و بە تەنیشت یەکەوە گەورە دەبێت، هەڵدەکشێت و لەناو دونیاکەی ئێمەدا، دوور لەهەموو شتێکەوە، جیهانێکی تایبەتمەند بۆ خۆیان دروست دەکەن.





ئەنتۆنیا فرەیسەر دەڵێت:" ئێمە هەرگیز لەگەڵ یەکتری بە شەڕ نەهاتووین، بەڵێ بیروڕای جیاوازمان هەبووە و گفتوگۆمان زۆر کردووە، بەتایبەتیش سەبارەت بە مەسەلە سیاسییەکان و چەمکەکانی ئایین، بەڵام هەمیشە ئەم گفتوگۆیانە بۆ هەردووکمان بە مانا بوون. ئێمە بەردەوام لە گفتوگۆیەکی بێکۆتادا بووین."
کتێبی دەبێت بڕۆیت؟ تەنها ژیانی پینتەر و ئەنتۆنیا فرەیسەر ناخاتە ڕوو، بەڵکو لە پەراوێزی ژیانی ئەم دوو مرۆڤەدا، وێنەیەکی چڕی ڕەوتی شانۆ و کولتووری بەریتانی، بە تایبەتی لە لەندەن - مان پێدەناسێنێت و چەندین کەسایەتی گرینگی بواری شانۆ بەنێو ڕووپەڕەکانی ئەم کتێبەدا، بەنێو ژیانی ڕۆژانەی ئەم دوو مرۆڤەدا تێدەپەڕێت، هەر بۆ نموونە، لۆرانس ئۆلیڤەر، یولیەت واڵتەر، ڤاکلاڤ هاڤل، سەلمان روشدی، پیتەر هاڵ، سامۆیێل بێکێت، ئارسەر میللەر، ف. سی نیاپاول، یوان بەیێز... هتد، ئامادەگییەکی بەهێزیان لەم کتێبەدا هەیە.
کە فەتوای کوشتنی سەلمان روشدی دوای بڵاوبوونەوەی ڕۆمانەکەی (ئایەتە شەیتانییەکان) لە مەلاکانی ئێرانەوە دەدرێت، بۆ ماوەیەك لە ماڵی پینتەر/ فرەیسەر خۆی دەشارێتەوە، پینتەر و فرەیسەر بە توندی بەرگری لە سەلمان روشدی دەکەن، بەرگری کردن لە سەلمان روشدی بۆ ئەوان بەرگری کردن بووە لە مافی ئازادی دەربڕین و وشەی ئازاد.
پینتەر لە شانۆوە دەستی پێکردووە، سەرەتا ئەکتەر بووە و لە هونەری نواندنەوە، لە دەرهێنان و پێکهێنەرەکانی تری پرۆسێسی نەمایشێکی شانۆییەوە دەستی کردووە بە نووسینی شانۆنامەکانی. لەم یاداشتانەیشدا



دەبێت بڕۆیت؟ جگە لە پینتەری نووسەر، پینتەری شانۆکاریش دەبینین، کە بەردەوام شانۆنامەکانی خۆی و نووسەرەکانی تر لە لەندەن، ئەمریکا و ئەوروپا پێشکەش دەکات و ساڵانە ئامادەی ئەو فێستیڤاڵە تایبەتمەندانە دەبێت، کە لە ئەمەریکا، مەکسیکۆ و ئێرلاند بۆ شانۆنامەکانی سازدەکرێت.

پینتەر، کە وەك ریژیسۆر کاری کردووە، هەمیشە خۆی لە بەرەی ئەکتەرەکاندا بینیوەتەوە، خۆی لەواندا دۆزیوەتەوە، ئەگەر هەر جیاوازییەکیش لە بیروباوەڕ و چۆنییەتی خوێندنەوەی تێکستەکانیشدا هەبووبێت، تەنها لەبەر ئەوە بووە، کە پینتەر لە لایەکەوە تا ئاستی لێبێزران بە دیقەت بووە و لە لایەکی تریشەوە بە هیچ شێوەیەك بواری بۆ هیچ کەسێك نەهێشتۆتەوە تێکستەکە کورت بکەنەوە، یان دەستەواژە و تەنانەت وشەیەکیش بگۆڕن و ئاڵوگۆڕی پێبکەن. پینتەر بەهەموو شێوەیەك دژی کلکو گوێ کردنی دەقە شانۆییەکان بووە و ڕێگای بە کورتکردنەوە و لابردنی هیچ بەش و دیالۆگ و تەنانەت ڕستە و وشەیەکیش نەداوە. ساڵانەیش، کە لە شانۆی (رۆیاڵ کۆرت) ۆرکشۆپی بۆ شانۆنامەنووسە نێونەتەوەییەکانی وڵاتانی وەك، یۆگۆسلافیا، ئەفەریقا، ئیسرائیل و هەندێك لە وڵاتانی عەرەبی سازکردووە، بەچڕی کاری لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە و تیشکی خستۆتە سەر گرینگی هەموو وشە و دەستەواژەیەك لەنێو دەقە شانۆییەکاندا. خاتوو فرەیسەریش باسی ئەم چالاکییانەی پینتەری کردووە و ئەوەیشی خستۆتە ڕوو، کە پینتەر گرینگییەکی زۆری بەم ۆرکشۆپانە داوە.

پینتەر جگە لە شانۆنامە، شیعریشی نووسیوە، لە کۆتایی ژیانیدا بە تەواوی

روویکردۆتە شیعر و کۆمەڵێ شیعری دڵداری، بەتایبەتی بۆ ئەنتۆنیا فرەیسەر نووسیوە. فرەیسەر دەڵێت:" ئێمە نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت، کە هارۆڵد پینتەر دەیویست ببێت بە شاعیر و لە زۆر رووەوە خۆی وەك شاعیر دەبینی." پینتەر کەوتبووە ژێر کاریگەرییەکی بەهێزی وێنەشیعرەکانی ت.س. ئەلیوت و ولیەم باتڵەر یەتیس، لە شیعرەکانی ئەم دوو شاعیرەدا تروسکەیەکی رۆحی بەدیکردووە و هەر لە شیعرەکانی ئەم دوو شاعیرەوە وزەی وەرگرتووە و بەدوای پەیوەندییە رۆحییەکاندا گەڕاوە.

پینتەر هەستێکی چڕی بۆ مەسەلە رۆحییەکان هەبووە، کە سەردانی هەر وڵاتێکیشی کردبێت، بۆ ماوەیەك لە کڵێسا کۆن و تاریکەکاندا بەبێ دەنگ دانیشتووە. ئەنتۆنیا فرەیسەر ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە پینتەر زۆر جار لە کڵێسا شێدارە تاریکانەدا، لە ساتە تەنها و بێدەنگەکاندا، لەبەر خۆیەوە شیعرەکانی ئەلیوتی خوێندۆتەوە و هەستی بەوە کردووە، کە پریشکێکی رۆحی لە شیعرەکانی ئەلیوتدا هەیە و راستەوخۆ لەگەڵ هەستە نادیار و رۆحییەکانی مرۆڤدا دەدوێت.

پینتەر ئەو هەستە رۆحییەیشی لە (فرانس کافکا) یشدا دۆزیووەتەوە، کە رۆمانی (پرۆسێس) ی کافکا بۆ شانۆ و تەلەفزیۆن تۆمار دەکات، دووپاتی پەیوەندییە رۆحییەکانی نێوان مرۆڤ لەم رۆمانەدا دەکاتەوە. پرۆسێس بۆ پینتەر گەڕانی مرۆڤ بووە بەدوای خودادا، نەك پەیوەندییە سیاسییەکان.

پینتەر زوربەی دیمەنەکانی رۆمانی (پرۆسێس) لە پراگ، جێنزرگەی کافکا تۆمار دەکات، ڤاکلاڤ هاڤل ئەوکات سەرکۆماری ئەو وڵاتە دەبێت و زوربەی رۆژ، دوای کار سەردانی پینتەر لە شوێنی وێنەگرتنەکان دەکات و گفتوگۆیەکی چڕ، کافکا، پینتەر و هاڤل، لەدەرەوەی کۆشکی سەرۆکایەتییەوە کۆدەکاتەوە.

پینتەر و ڤاکلاڤ هاڤل، شانۆنامەنووس و سەرکۆماری چیك پەیوەندییەکی







توندوتۆڵیان هەبووە، کە هاڤلیش، بەرلەوەی ببێت بەسەرۆك کۆمار و بەهۆی هەڵوێست و بارودۆخە ئاڵۆزە سیاسییەکەی ئەو وڵاتەوە لە بەندیخانەکاندا توند دەکرێت، پینتەری هاوڕێ و هاوپیشەی لە لەندەن شانۆنامەکانی پیشکەش دەکات، تا چاوی میدیا و سیاسەتمەدارەکانی بەریتانیا و ئەوروپای بچێتە سەر و بەو شێوەیەش فشار بخاتە سەر رژێمی ئەوکاتەی چیکۆسلۆڤاکیا.

پینتەر هەر لە سەرەتاکانی رەوتی نووسینە شانۆییەکانییەوە پەیوەندییەکی راستەوخۆی بە سامۆیێل بێکێت- ەوە دەبێت و ئەو پەیوەندییە دەبێتە دۆستایەتییەکی نزیك و درێژخایەن. پینتەر لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا و لەژێر کاریگەری بێکێت دا شانۆنامەی "ئەسانسێرەکە" دەنووسێت کە دواتر دەبێتە یەکێك لە شاکارە کلاسیکییەکانی شانۆی مۆدێرنی جیهانی.

بە مردنی بێکێت، پینتەر خەمبار و دڵگران دەبێت و وەك رێزلێنانێك لەو رابەرە گەورەیە، لە شانۆی نەتەوایەتی لەندەن یادێکی شکۆمەندانەی دەکەنەوە، پینتەر لەو یادەدا دەڵێت: "هیچ شتێك لە جیهان و دنیابینی بێکێت دا نەمردووە، بە تایبەتی بێکێت خۆی، تەنانەت مردووەکانیش لە شانۆی بێکێت دا زیندوون." فرەیسەر لە زۆر شوێنی ئەم کتێبەدا باسی پەیوەندییەکانی پینتەر و بێکێت دەکات، ئەوەیش ناشارێتەوە، کە پینتەر چەندە کاریگەری بێکێتی بەسەرەوە بووە و وەکوو شتێکی پۆزەتیڤ ئاماژەی بۆ دەکات. هەروەها ئەوەیش دووپات دەکاتەوە، کە ئەو نیوەیەی پینتەر، کە بێکێت نییە، ئەوە بەدڵنیاییەوە نووسەری ئەمەریکی (هەمەنگوای)ە. ئەنتۆنیا فرەیسەر دەڵێت: "بەلای منەوە بێکێت لەو نامەیەیدا، کە بۆ هارۆڵد پینتەری نووسیوە، لە هەموو کەسێك باشتر باسی ئەو

کارەکتەرە دانسقە و تایبەتمەندەی شانۆنامەی (ناپاکی) دەکات، هەروەها بێکێت باسی هێز و وزەی دیمەنی کۆتایی ئەم شانۆنامەیەیش دەکات، کە لە بنەڕەتدا دیمەنی یەکەمە." ئەنتۆینا فرەیسەر لە ٢٧ی دیسەمبەردا دەنووسێت: "هارۆڵد بە درێژایی دوازدە سەعات خەریکی نووسینی ئەو شانۆنامەیە بوو، کە ئێستا بە (ناپاکی) ناوزەدی کردووە."
کە شانۆنامە نووسی ئەمەریکی (ئارسەر میللەر) کۆچی دوایی دەکات، ڕۆژنامەنووسەکان لە هەموو دونیاوە پەیوەندی دەکەن بە پینتەرەوە. پینتەر هاوڕێیەکی نزیکی ئارسەر میللەر دەبێت و بەپێی یاداشتەکانی ئەنتۆنیا فرەیسەر، پینتەر لە دڵەوە بۆ مەرگی لەناکاوی ئارسەر میللەر گریاوە.
ئەنتۆنیا فرەیسەر دەڵێت، لە پینتەر نزیك بوومەوە و لێم پرسی "تۆ هەرچەندە بە مردنی بێکێت زۆر خەمبار و دڵتەنگ بوویت، بەڵام نەگریایت؟ ئێستا بۆ مەرگی ئارسەر میللەر ئاوا بەم شێوەیە دەگریت." پینتەریش لە وەڵامدا گوتوویەتی"بێکێت خۆی دەیویست بەرەو مەرگی خۆی بڕوات، بەڵام ئارسەر میللەر وزەیەکی گەورە بوو لە ژیان و دەیویست بەردەوام بێت، دەیویست بژی، نەك بمرێت."
پینتەر هەمیشە بە شێوەیەکی رادیکاڵی هەڵوێستی سیاسی خۆی دەربڕیوە، رەخنەی توندی گرتووە و لایەنگری خۆی بۆ چەوساوەکانی دنیا دەربڕیوە. لەم کتێبەشدا نووسەر ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە چۆن پینتەر هێدی هێدی ڕووداوەکانی جیهان و هەڵوێستە سیاسییەکان هەموو ژیانی داگیرکردوون، فرەیسەر باسی ئەو ڕۆژانە دەکات، کە پینتەر بەهۆی رووداوە سیاسییەکانی جیهانەوە بە قووڵیی هەستی بە نیگەرانی کردووە.
هەر لەم دەوازەیەیشەوە، نووسەر و هونەرمەندی وەك هاووڵاتییەك داناوە و بەتوندی دەستەواژەی (هونەرمەندیش هاووڵاتییە)ی بەکار هێناوە. پینتەر لەم ڕووەوە مەبەستی ئەوە بووە، کە هونەرمەند، وەك هاووڵاتییەك لەپاڵ هونەرەکەی خۆیدا، دەبێت ڕۆڵی خۆی بگێڕێت و پێگەی هونەری خۆی بەکاربهێنێت.
پینتەر لە سێ ناوچە و مەداری جیاوازی دنیاوە بەرگری لە گەلانی چەوساوە کردووە و دژی سیستەمە دیکتاتۆر و تۆتالیستەکان بۆتەوە: یەکەمیان وڵاتانی ناوەڕاست و ئەمەریکای لاتین، بە تایبەتیش نیکاراگوا، دووەم ئەوروپای رۆژهەڵات و بە تایبەتی وڵاتانی چیکۆسلۆڤاکیا، سێیەمیشیان تورکیا بووە.





نووسەر لە زۆر شوێنی ئەم یادەوەریانەدا باسی بەرگریکردنی پینتەر لە گەلی کورد دەکات، بۆ ئەم مەبەستە بەشداری خۆپیشاندانەکانی کردووە، کە لە بەریتانیا دژی سەدام حسین و دەسەڵاتدارانی تورکیا، لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ دۆزی کورد و چارەنووسی خەڵکی کورددا کردووە. ئەنتۆنیا فرەیسەر لە رۆژی ٢٤ی مانگی سێدا نووسیویەتی: "ئەو شانۆنامە تازەیەی هارۆڵد دەستی کرد بە نووسینی، زمانی چیا بوو، ئەم کارەیشی راستەوخۆ بۆ بەرگریکردن و دژی چەوساندنەوەی کوردەکان نووسیوە. هارۆڵد بۆی دەرکەوت، کە زمانی کوردی تەنانەت لەناو کوردەکان خۆشیاندا قەدەغەیە، ئەمەش بە شێوەیەکی بنەڕەتی و بۆ هارۆڵد هێماگەلێکی بەهێزی چەوساندنەوە بوو. جیهانبینی هارۆڵد پینتەر زۆر نزیك بوو لە چەمکی (زمان) ەوە، کە زمانیش قەدەغە بکرێت، مانای وایە مرۆڤ لە هەموو بنەما سەرەکییەکانی خۆی وەك مرۆڤ دابماڵرێت. هارۆڵد هەر کە لە تورکیا گەڕایەوە بۆ لەندەن دەستی کرد بە نووسینی ئەم شانۆنامەیە." لەهەمانکاتدا پینتەر بە توندی دژی جەنگی عێراق بوو، هێرشی دەکردە سەر ئەمەریکا و بەریتانیا و بە هەموو شێوەیەك هەوڵی ئەدا سەرکردەکانی ئەو جەنگە ریسوا بکات. ڕەخنەگر و ئەو کەسانەی، کە لە بەرەکانی جەنگدا بوون، هێرشیان کردۆتە سەر پینتەر و بەوە تاوانباریان کردووە، کە بەرگری لە سەدام حسین دەکات. بەڵام فرەیسەر دەڵێت "هارۆڵد دژی سەدام بوو، چەندین جار خۆپیشاندانی بۆ مافی کوردەکان و دژی سەدام کردبوو، بەڵام دژی شەڕ بوو، دژی ئەوە بوو کە خەڵکی سڤیل بۆردومان بکرێن."
کە پینتەر لە ساڵی ٢٠٠٥دا پاداشتی نۆبڵی ئەدەبییاتی وەرگرت، پێگەی

ئەم پاداشتە بۆ زیاتر قووڵ بوونەوە، فۆرمۆلەکردن و بە فەرمیکردنی بیروباوەڕە سیاسییەکانی خۆی بەکاردەهێنێت و ئەو پاداشتە جیهانییەی وەك ناوەندێك بینیوە تا بتوانێت لەم روانگەیەوە گوزارشت لە دیدە رادیکالییەکانی خۆی بکات.

پینتەر لە ساڵی ٢٠٠١دا تووشی نەخۆشی شێرپەنجە دەبێت، دوای حەوت ساڵ هەر بەم نەخۆشییە دەمرێت، بەڵام لە ماوەی ئەو حەوت ساڵەدا ژیانی پینتەر بە تەواوی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بەسەردا دێت. بەردەوام لە نەخۆشخانەکان دەمێنێتەوە، نەشتەرگەری بۆ دەکرێت، جەستەی بچووك دەبێتەوە و هێز و تواناکانی لە هەموو ڕوویەکەوە کەم دەبنەوە. لەو رۆژانەدا بەردەوام لە نزیك مەرزەکانی مەرگەوە دەژی، ئەودیوی ژیان، وڵاتی مردووەکان دەبێت و بە هەستێکی پڕ لە ژان و ئازارەوە دەڵێت: "ناتوانم خۆم لەسەر ئەو رەوشە رابهێنم کە دەمرم، تەمەنم تەنها تۆزێك لە سەروو حەفتاوەیە."

چیرۆکی پینتەری نووسەر و عیشقی ئەم مرۆڤە بەرهەڵستکارە، لە مانگی دوازدەی ساڵی ٢٠٠٨دا کۆتایی پێ دێت، ئەنتۆنیا فرەیسەر، بەشێوەیەکی کاریگەر ئەم دوا چرکە ساتانەی ژیانی پینتەر تۆمار دەکات و لەدوا بەشەکانی یاداشتگەلەکەیدا دەڵێت: ( کاتژمێری دەوروبەری حەوت و بیست دەقیقە بە تەنیشت جێگاکەی هارۆڵدەوە دانیشتم و دەستم کرد بە خوێندنەوەی "ژیانەوە" ەکەی تۆلستۆی. هارۆڵد هەناسەی



دەدا، بەڵام بە دەنگێکی لەرزۆك و قرخەقرخ، سستەرەکان لە دەرەوە چاوەڕوانییان دەکرد. منداڵەکانم و منداڵی منداڵەکانمان رۆیشتبوون، من بە تەنها لە ژوورەکەدا بووم. هەستم دەکرد ئەمەیش بڕیارێکی راست و تەواوە. لەپڕ هارۆڵد لە پرخەپرخ کەوت، چاوە ڕەشەکانی بە گەورەیی کردەوە، وەك ئەوەی چاو زەق بکاتەوە، کاتێك من وەك جاران گوتم: "ئەوە منم ئەنتۆنیا، کە تۆی خۆش دەوێت." بەڵام ئەو هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو. هەموو جەستەی بە توندی گرژ بوو، دواجار ئارام و بێدەنگ. من سەرم بردە پێشەوە، بەڵام هەستم بە هەناسەی نەکرد. ئەو مردو و سیمای سپی بووبوو. بۆ تاوێك لەوێدا دانیشتم. ماچم کرد. جەستە نازدارەکەی سارد ببۆوە: دەبێت برۆیت؟ بەڵی، کاتی هاتووە. بەرلەوەی بچمە دەرەوە ماچێکی ترم کرد، دوا ماچ و گوتم: "شازادە ئازیزەکەم، شەوباش! فریشتەکان بە گۆرانییەوە بەرەو دوا ئارامگات بەرن."

ئەنتۆنیا فرەیسەر بەم شێوەیە کۆتایی بەو یاداشت و یادەوەرییانە دێنێت، کە



به درێژایی سیی ساڵ ڕۆژەکانی ژیانیانی تیا تۆمار کردووە. (دەبێت بڕۆیت؟) وەك یاداشتگەلێك، دەبێتە سەرەتا و کۆتایی ژیانێکی پڕ لە داهێنان و خۆشەویستییەکی بەهێز و یادەوەرییە بەسەرچووەکان و تەنهاییەکی ڕەها و وزەکانی بەرەنگاریی.

تێبینی:

لەیدی ئەنتۆنیا مارگەرێت فرەیسەر لە ساڵی ١٩٣٢ لە بنەماڵەیەکی بە نەژاد ئیرلەندی لەدایك بووە. چەندین کتێبی بیۆگرافی گرینگی لەسەر ژیانی شاژن و پادشاکانی ئەوروپا نووسیون، لەوانە لۆدڤیکی چواردە، هێنریکی هەشتەم و ماری ئەنتوانێت. لە ساڵی ٢٠٠٦دا ئەو کتێبەی لەسەر ماری ئەنتوانێت نووسیویەتی دەکرێتە فیلم. ئەم خانمە جگە لەوەی کە نووسەرە، چەندین چالاکی تری هەبووە، لەوانە لەنێوان ساڵانی ١٩٨٨ - ١٩٩٩دا سەرۆکی پێن کلوبی بەریتانی دەبێت.

سەرچاوە:

**Måste du gå**

**Mitt liv med Harold Pinter**

**Översättning av Margareta Eklöf**

**Bokförlaget, Forum**

**Stockholm, 2011**



# لەگەڵ نەجیب مەحفوزدا

## و. لە هۆڵەندییەوە: میران ئابراهام

لە دەی دێسەمبەری ساڵی ١٩٨٨ دا کۆمیتەی خەلاتی نۆبڵ، نەجیب مەحفوز -ی نووسەری میسری لە تەمەنی ٧٧ ساڵیدا لە بواری ئەدەبدا خەڵات کرد.
لە جیهانی عەرەبیدا بەگەرمی پێشوازی لێکرا و ئاهەنگی بۆ گێڕدرا، ئەوەی لە میدیا عەرەبییەکانەوە زۆر بەر گوێ دەکەوت، دەیانگوت: کاتی خۆیەتی زمان و ئەدەبی عەرەبی... باوەڕی پێبهێنرێت و وەك سەردەستەی زمانەکان بناسرێت.
ئەوەی دەمەوێت لێرەدا ئاماژەی پێبدەم، سەرنجی ئەوسای زۆرێك لە کەناڵ و گۆڤار و ڕۆژنامە عەرەبییەکان بوو بە میسرییەکانیشەوە، بەگشتی ئەوەندەی ناوی زمانی عەرەبی و ئومەی عەرەبی و ئیسلامییان هێنابوو، نیو ئەوەندەش ناوی مەحفوز نەدەبینرا یان بەرگوێ نەدەکەوتن، بەڵام سەرنجەکان لە دەرەوەی وڵاتانی عەرەبی بەتایبەتی لە ئەوروپا جیاواز بوون، ئەوسا مەحفوز لە ئەوروپا لای کەم کەس ناسرابوو.

خواستی زانیاری لەسەر ئەو نووسەرە زۆر بوو، هەموو میدیاکان هەوڵی خۆیان خستەگەڕ بۆ بەدەست هێنانی زانیاری لەسەر براوەی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەدەب لەو ساڵەدا، چاپخانەکان لە هەموان زیاتر بە پەرۆشتر بوون بۆ وەرگێڕانی کتێب و نووسراوەکانی مەحفوز، پاش چەند مانگێك... دوو کتێبی بە پەلەپڕوزکێ وەرگێڕدرایە سەر زمانی هۆڵەندی، کتێبەکان زۆر بازاڕیی بوون و کاری وەرگێڕانی خێراو ڕاکەڕاکە بە ڕۆحیانەوە دیار بوو، یەکێك لەو کتێبانە "قاهیرەی نوێ، ١٩٤٥" بوو ئەوەندە بە ئامانەتەوە کاری وەرگێڕانی بۆ کرابوو، زیاتر لە فەرهەنگی زمان دەچوو نەك ڕۆمان.

ئەوەی خوێنەر لە وڵاتانی ئەوروپادا چاوەڕوانی بوون... بەرهەمەکانی و زیاتر پاشخانی ئەو نوسەرە عەرەبە بوو، لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٩دا کتێبێك بە ناونیشانی "لێدوان لەگەڵ نەجیب مەحفوز"دا بڵاوکرایەوە، کاتی ئەنجامدانی ئەو لێدوانە دەگەڕایەوە بۆ سێ ساڵێك پێش ساڵی ١٩٨٨، لێدوانی جەمال الغیتانی بوو لەگەڵ مەحفوزدا، لە دوتوێی کتێبێکی ٦٠ لاپەڕەییدا.



الغیتانی نوسەر و ڕۆژنامەنوس، بە چیرۆك و ڕۆمانە مێژووییەکانی لە ئەوروپادا دەناسرێتەوە، ڕۆمانی"جاسوسی بۆ سوڵتان"ی لە ساڵی ١٩٨٨دا لە چەندین وڵاتانی ئەوروپادا بڵاوکرایەوە.

الغیتانی لەدایك بووی یەکێك لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری قاهرەیە بەناوی "حوسێنیە"، هەمان گەڕەك کە مەحفوز پاشان لێی ژیابوو، ئەوەش بووبووە هۆی ئەوەی کە الغیتانی خۆی لەگەڵ مەحفوز-دا بە هاوڕێ و کوڕی گەڕەکێك بزانێت، هەرچەندە جیاوازی تەمەنیان ٣٤ ساڵێك دەبوو.

الغیتانی لە لێدوانێکیدا دەڵێت: پەیوەندی من لەگەڵ مەحفوز دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٢، کاتێك من تەمەنم تەنها ١٧ساڵ بوو، یەکێك بووم لەو گەنجانەی سەرسام بووم بە کتێب، خوێنەرێکی باشی کتێبەکانی نووسەر مەحفوزیش بووم، ڕۆژانە مەحفوزم دەبینی بەیانیان بۆ سەر کار دەچوو یان ئێواران لە دوای کارەکەی بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، کۆتایی هەفتەش لە کافتریاکانی گەڕەکی حوسێنیە بوو، ئەوسا کورتە چیرۆکێکم نووسیبوو، مانگێك زیاتر بوو پلانی ئەوەم دانا بوو، ڕێگای پێبگرم و ڕای ئەو وەرگرم لەسەر چیرۆکەکەم، ڕۆژێك لەو ڕۆژانەدا... زۆرم لەخۆم کرد و پاش ئەوەی خۆمم پێناساند... داوام لێکرد، چیرۆکەکەم بۆ تەماشا



بکات و ڕای خۆیم پێبڵێت، مەحفوز بەناوبانگ بوو بەوەی کە دڵگەورە و بەڕێزە لە گەڵ نووسەر و ڕۆشنبیرە لاوەکاندا، ئەو ڕۆژە پاش ئەوەی کورتە چیرۆکەکەمی بە سەرپێییەکەوە خوێندنەوە، گوتی: کارێکی باشت کردووە، بەردەوامبە لەسەر نووسین.
لەدوای ئەو ڕۆژەوە تاکو ئەمڕۆ پەیوەندیم لەگەڵ مەحفوز بەردەوامە، لە سەرەتای یەکتر ناسینمانەوە بەردەوام لەگەڵ خۆی بۆ هەموو کۆڕ و دانیشتنێکی خۆی بانگهێشتی کردوم، لەگەڵ ناساندنمی بە هەموو هاوڕێ و دۆستە نووسەر و ڕۆژنامە نووسەکانی ئەوسای خۆیدا.
ئەو لێدوانەی الغیتانی لەگەڵ مەحفوز-دا کردویەتی، ڕەگی دۆستایەتی ئەم دوو نووسەرە هەست پێدەکرێت، توانا و ئاستی ڕۆشنبیری الغیتانی وا لە مەحفوز دەکات... زۆر قوڵ ڕۆچێتە ناو بیرەوەرییەکانیەوە، هەرچەندە ئەم کتێبە "لێدوان لەگەڵ نەجیب مەحفوز"دا، نابێت وەکو بیۆگرافییەکی ئەو نووسەرە هەژماربکرێت، بەڵام زیاتر وەك دۆکۆمێنتی کات گرنگی خۆی هەیە.
لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ کەناڵێکی تەلەفزیۆنی ئەڵمانیدا، مەحفوز دەڵێت: دوای ئەوەی جەمال الغیتانی ئەو لێدوانەی لەگەڵ مندا کرد، کە ئێستا بە چەندین زمان وەك کتێب لە بەردەستی خوێنەراندایە، ئەو لێدوانە ڕێگرە لە پێشم تاکو جارێکی تر بگەڕێمەوە سەر ڕابردووم و یادەوەریەکانم بنووسمەوە.
- ئەم بابەتە بەراورد کردنی کتێبی "لێدوان لەگەڵ نەجیب مەحفوز"ە بە چەند لێدوانێکی تری نوسەر، بەتایبەتی ئەو لێدوانانەی کە لە دوای ساڵی ١٩٨٨وە ئەنجام دراون لەگەڵ نەجیب مەحفوز و لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی هۆڵەندا- دا بڵاوکراونەتەوە، لەم بابەتەدا ناوبژێری چەند وەڵامێکی مەحفوزم کردووە.

سەردەمی مناڵیت چۆن لە گەڕەکی الجمالیە بردە سەر؟
مەحفوز: ئەگەر بەخەیاڵ بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی مناڵیم... ماڵەکەمانم دێتەوە پێش چاو لەو گەڕەکە.
باوکم فەرمانبەر بوو، پاشان بوو بە شەریکی هاوڕێیەکی

بازرگانی، پێش ئەوەی من لە دایك ببم، دایكم بەدواییەكدا شەش منداڵی بووبوون، دوو كوڕ و چوار كچ، پاشان دوای حەوت ساڵێك پشودانی دایكم منی دەبێت، كاتێك پێنج ساڵان بووم... خوشكەكانم سیانیان هاوسەرگیرییان كردبوو، هەر لەو ساڵانەشدا دواین خوشكم بەجێی هێشتین، براكانیشم بە ناوازە لە ماڵ دەبوون و دایم لە سەر كار بوون، بە بیرم نایەت كە لە ماڵەكەدا هەستم بەوە كردبێت كە خوشك و برام هەبووبێت، بە پێچەوانەوە گەورەبووم وەك تەنها منداڵی ماڵ، ژیانی سەردەمی منداڵیم زۆر ئاسایی بوو، بە ناز و خۆشەویستی دایك و باوكم گەورە بووم، دایك و باوكم هەموو تەمەنیان بەیەكەوە بوون و بۆ یەكبوون، ئەوەندەی من بزانم باوكم پەیوەندی لەگەڵ هیچ ئافرەتێكی تردا نەبوو، هەروەك چۆن بە پیاو ڕەوا دەبینرا ئەوسا، باوكم مەینۆش و قومارچی نەبوو... توڕە و دڵڕەقیش نەبوو لەگەڵماندا، هەر بۆیە لە قوڵایی دڵمەوە تاكوو ئەمڕۆش دایك و باوكم و خێزانەكەمانم خۆشدەوێت. ماڵەكەی ئێمە بەرانبەری مەخفەری پۆلیس بوو لە الجمالیە، ئەوسا ئەو گە ڕ ە كە



جێگایەكی نامۆ بوو بۆ ژیان تێیدا، هەموو چین و توێژێكی تێدا دەژیان، خاوەن كارگە و بازرگان و فەرمانبەر... هەروەها ئەوانەی لایەنگری پارتی وەفد بوون و تەنها بۆ پارتەكەیان دەژیان، ئەویش جۆرێك بوو لە پیرۆزی ئەو پارتە لای خەڵكی ئەوسا.
ماڵی هەژارانیشم باش وەبیردێتەوە، لەوێ تورك و فارسەكان دەژیان، لە ماڵەكەی ئێمەوە دەمان بینین، لە ڕاستیدا ئەوسا... هەركەسە و لەگەڵ هاوشێوە و هاو چینی خۆی هەڵسوكەوتی دەكرد، فەقیر لەگەڵ فەقیر و دەوڵەمەندەكانیش بەجیا، مرۆڤەكان بە گوێرەی ڕەنگ و دەنگیان جیا بووبوونەوە لە یەكدی، تەنها لە مانگی ڕەمەزاندا نەبێت... هەموو دەرگاكان دەخرانە سەرپشت و گشت تێكەڵ دەبووین بە یەكتری، تەنانەت بێگانەكانیش بەختی ئەوەیان بەردەكەوت نزیكمان ببنەوە و خواردنیان بەشبدرێت.
دایكم ڕۆڵێكی گرنگی گێڕا لە ژیانمدا و كاریگەری لەسەرم هەبوو، هەرچەندە لەگەڵ كاتدا نەگۆڕابوو، بەڵام زۆر شتی لێوە فێربووم، دایم گوێم لێ دەگرتن... كاتێك میوانی دەهات، میوانەكانیشی ژنانی گەڕەك بوون، بە زۆری ئەو ژنانە بوون كە نوشتەیان دەكرد و بەخت و دەستیان دەگرتەوە، یەكێكیش لە هاوڕێكانی دایكم مریشك فرۆش بوو، دایكم لە هەڵسوكەوتی



ژیانی ڕۆژانەیدا سەربەست بوو، بۆی هەبوو بە تەنیا بچێتە دەرەوە بۆ لای هاوڕێ و کەس و کاری، حەزیشی زۆر لە شوێنەوار و جێگا مێژوییەکان بوو، زۆر جاریش منی لەگەڵ خۆی دەبرد بۆ ئەهرامەکان و بینینی مۆمیا کراوەکان، سەردانی مۆزەخانەشمان کرد پێکەوە.
لە چوارساڵیمەوە چووم بۆ قوتابخانەی قورئان، ئەو سەردەمە ئاوا بوو، هەموو منالآنی وڵات دوو ساڵێك قورئانمان دەخوێند، پێش ئەوەی بچین بۆ قوتابخانەی ئاسایی، لەوێ سەرەداوێکیان لە ڕۆحمان دەهاویشت لەسەر باوەڕ، هەروەها فێری نووسین و خوێندنەوەش دەبووین.
لە ماڵی ئێمەدا بێجگە لە باوەڕ، کات و جێگایەکی تر نەمابویەوە بۆ کلتور، دایك و باوکم هیچ هەستێکیان نەبوو بەرانبەر بە ڕۆشنگەری، تەنها کتێبێك کە ئەو سەردەمە لە ماڵەکەماندا بوو... کتێبی "چیرۆکەکانی عیسا بن هاشم"بوو، لە نوسینی محەمەد المویلیهی، ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەو نووسەرە هاوڕێی باوکم بوو.
تێکلآو بوونی ئێمە بە خەڵکانی تر و بەشدار بوونمان لە زۆر کۆڕ و ئاهەنگدا لە ڕێگای کلتورەوە نەبوو، بەڵکوو زیاتر لە ڕێگای پرەنسیپ و ڕەنگی پارتی وەفدوە بوون، دایکم و باوکم لایەنگری ئەو پارتە بوون، بە بیرم دێت باوکم هەمیشە باسی "سەعد زەغلول و مستەفا کامیل"ی دەکرد، زۆر بە پیرۆزی ناویانی دەهێنا، زیاتر ناوی سەعد زەغلول. باوکم هەمیشە سیاسەت و ئاسۆی بیری خۆی تێکەڵاو بە هەموو باس و لێدوانێکی ماڵەکە دەکرد، هەموو ڕوداوێکی گەورە و بچوك لە ژیانی ئێمەدا دەگلا لە باسی سیاسەتەوە و لە کۆتایشدا باوکم دەیگوت: هەموو شتەکان وان، سەعدیش هەروای گوت.
هەموو کەسە ناودارەکانی بەناوی یەکەمی خۆیانەوە ناو دەبردن... وەکو لە نزیکەوە بیان ناسێت و هاوڕێی یان ناحەزی بن.
بە بیرم دێت کاتێك بۆ یەکەمین جار دەستم کرد بە ڕۆژنامە خوێندنەوە، لە پێش هەموو وشەیەکەوە لە دەستپێکدا بۆ ناوی سەعد زەغلول دەگەڕام، بێجگە لەوەش بیری ناسیۆنالیزمی... ئەوە دایکم و

باوکم نەبوون بەڵکوو مامۆستاکەم بوو لە قوتابخانەی سەرەتایی لە ڕۆحمدا چاندی، بەتایبەتی مامۆستای زمانی عەرەبی، لە ناوەڕاستی هەموو دەرسێکدا فرسەتی دەهێنا و باسی بۆ دەکردین.
بێجگە لەوانەش شۆڕشی ساڵی ١٩١٩و خۆپیشاندانەکانی ئەو ساڵە، کاریان تێکردم و زۆر لە قوڵاییەوە ڕۆحمیان هەژاند، ئاسەواری ڕوداوەکانی ئەوسا لە خەیاڵمدا تاکوو ئەمڕۆش پێشینەن، ئەوسا تەمەنم تەنها هەشت ساڵێك دەبوو.
قوتابخانەکەمان لە گۆڕەپانی ناوەڕاستی گەڕەکی الجمالیەدا بوو، لە پەنجەرەی پۆلەکەمانەوە دەمانبینی، خۆپیشاندەران هوتافیان دەکێشا و هاواریان دەکرد بەرانبەر سەربازە ئینگلیزەکان.
خۆپیشاندانی ڕاستەقینە لە گەڕەکە سادە و هەژار نشینەکانەوە دەستیان پێکرد، گەڕەکەکەی ئێمەش یەکێك بوو لەو گەڕەکە بەشدار بوانە لە خۆپیشندانەکاندا، چونکە زۆرینەی دانیشتوانی لایەنگری پارتی وەفد-بوون، ئەوسا بەچاوی خۆم بینیم، چۆن سەربازە ئینگلیزەکان بەتوندی بەرەوڕوی خۆپیشاندەران بوونەوە، گوێم لە



تەقەکان بوو... کوژراو و برینداریێکی زۆرم بینی کە هەموو لەسەر جادەکان کەوتبوون، هەموویم باش بەبیردێت، بەڵام ئەوەی لە ناو هەموو ڕوداوەکاندا هەمیشە زیاتر بیری لێدەکەمەوە... خۆپیشاندانی ژنان بوو، ئەوسا و هەموو ئەوساڵانەی دوایش زۆری لەسەر نووسرا، بەڵام هەموو دەیان نووسی "خۆپیشاندانی ژنانی حیجاب پۆش"، یان زۆر جاریش ژنانی پاشا، وایان بە ژنان دەگوت ئەوسا، بەڵام کێ بوون ئەو ژنانە؟ بەچاوانی خۆم هەزاران ژنی مۆدە و بێلەچکم بینی بەشدار بوون، بەڵام ئەوەی جێگای سەرسوڕمانمە، لەنووسین و تەنانەت لە ئەرشیفی وێنەکانیشدا بەتەنها ژنانی داپۆشراو و حیجابکار ناو و وێنەیان ماونەتەوە.
ئێمەی قوتابیش هاندراین بەشداربین، ئەو قوتابیانەی بەشدارییان نەکرد یان لەترساندا هەڵاتن، ڕۆژانی دوایی لە قوتابخانە ڕووبەڕووی سزا بوونەوە، ئەو خۆپیشاندانانەی لە کتێبەکانمدا وێنەم کردوون، هەموو ڕوداوی ڕاستەقینەن و ڕوویانداوە، بەڵام بۆچی ئەو ڕوداوانەم لە نووسینەکانمدا جێگاکردۆتەوە، یان بۆ تاکو ئەمڕۆش لە خەیاڵمدا بەڕۆشنی ماونەتەوە... لەڕاستیدا خۆشم نازانم.
لە ساڵی ١٩٢٠دا هەموو خێزانە دەوڵەمەندەکان



یەکێك لەوانەش ئێمە، گوێزامانەوە بۆ گەڕەکی "العباسیە"، هەرچەندە هەموو هاوڕێکانم لەوێ بەجێهێشتن و لەچاوم ونبوون، بەڵام هەمیشە دڵم بۆ گەڕەکە کۆنەکەمان لێیدەدا، پاشانیش کە سەرقاڵی خوێندن بووم و بویشمە فەرمانبەر، هەر غەریبیم دەکرد و ناوازە دەگەڕامەوە بۆ گەڕەکە کۆنەکەمان، زۆر جاریش بەخەیاڵ پیاسەیەك بە کۆڵانەکانیدا دەکەم... بە هێزی ئەو پەیوەندییە ڕۆحییەی لەگەڵ دار و بەردی ئەو گەڕەکەدا هەمە.
پاش ئەوەی خوێندنی فەلسەفەم تەواو کرد، زیاتر ڕۆحم بیانوی پێدەگرتم تا بگەڕێمەوە بۆ گەڕەکە کۆنەکەمان و جێگای سەردەمی مناڵیم.

گەڕەکی العباسیە و خوێندنی ناوەندی و ژیانی تەلەبایەتیت؟
مەحفوز: ئەو گەڕەکە ئەوسا زۆر جیاوازتر بوو لە ئێستای، هەموو ماڵەکان خاوەنی باخی خۆیان بوون... بەڵام ئێستا ئەوباخانە نەماون و لە جێگایان ئاپارتمان درووست کراون، ساڵانێکی خۆشم گوزەراند لە گەڕەکی العباسیە، زۆرینەی کات یاری فوتباڵمان دەکرد و منیش زۆر لێهاتوو بووم لەو وەرزشەدا، هەرچەندە ئەوکات یانەی فوتباڵی نزیك نەبوون بە گەڕەکەکەمان و لەسەر شەقام و لە گۆڕەپانەکاندا یاریمان دەکرد، یان لە یەکێك لە کافتریاکاندا خەریکی نێرگەلە کێشان بووین... ویسکیمان دەخواردەوە و گوێمان لە "ئوم کەلسوم" دەگرت.
بۆ یەکەمین جارم لەو گەڕەکە کچێکم خۆشویست، هەرچەندە بە تەمەن زۆر گەورەتر بوو لەمن، لەڕووی دارایی و ئاستی بیرکردنەوەشمانەوە دوور بوین لە یەکتری، پێم وابێت هەر ئەو هۆیانەش بوون، نەمان توانی بەردەوامی بە پەیوەندیمان بدەین، هەر لەو کاتانەشدا بوو دەستم کرد بە خوێندنەوە، بەتایبەتی کتێبی نووسەرە نوێخوازەکان، وەکوو تەها حسێن، ناوازەش زانستم دەخوێندەوە بەڵام زیاتر ڕووم لە خوێندنەوەی فەلسەفە کردبوو.

دوای خوێندنی ئامادەیی ویستم فەلسەفە بخوێنم، بەڵام ئەو هەواڵە باوکمی تەنگاو کرد... بە ڕای مامۆستایەکیشم کە پێی گوتم: باشتر وایە تۆ فەلسەفە هەڵنەبژێریت... چونکە تۆ توانات باش نییە لە ئەدەبدا و لێهاتو نیت تێیدا. باوکیشم ڕێنمایی کردم کە یاسا بخوێنم... بەڵام من دەمویست بخوێنم و بخوێنمەوە تاکو لە نهێنی بوونم تێبگەم، ئەوکات پێم وابوو تەنها لە بواری فەلسەفەدا وەڵامی شیاوم چنگ دەکەوێت.
کاتێك سەرقاڵی خوێندنی فەلسەفە بووم، دەستم کرد بە نوسینی بابەت، لێرە و لەوێ لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوم کردنەوە، هەموو ئەو بابەتانە فەلسەفی بوون... کورتکراوەی ئەو دەرسانە بوون کە لە زانکۆ دەم خوێندن، دوایی داوایان لێکردم کۆیان بکەمەوە و بیان کەم بە کتێبێك، بەڵام پێم وابوو ئەو بابەتانە شایەنی ئەوە نەبوون بچنە دووتوێی کتێبێکەوە.
ئەوسا لەنێوان فەلسەفە و ئەدەبدا باز بازێنم بوو، هەرچەندە دەمویست هەردووکیان بخوێنم بەڵام ئەوسا خوێندنی لەو چەشنە بوونی نەبوو، ئێستا بە پێچەوانەوە، ساڵی ١٩٣٦ لە زانکۆ دەرچوم، پاشان بێ دودڵی بە یەکجاری ئەدەبم هەڵبژارد، هەستم کرد لەخۆمدا ئارام بومەوە و بە یەکجاری ئۆقرەم گرت.



ئەی لەگەڵ نووسین و فەرمانبەریدا؟
مەحفوز: پاش تەواو کردنی زانکۆم... هەڵبەتە لە سەردەم و ساڵانی گرانیدا، تەمەنم بیست و پێنج ساڵ بوو، بەرنامەم ئەوەبوو کارێك بدۆزمەوە و لە سێبەری کارەکەمدا خۆم خەریك بکەم بە ئەدەبەوە. کاتێك وەك فەرمانبەر لە یەکێك لە وەزارەتەکانی سەر بە وەزارەتی کاروباری ئاینی دەست بەکار بووم، کارەکەم بەدڵ بوو... ڕۆژانە خەڵکێکی زۆرم دەدواند، لە کوڕی سوڵتانەوە بۆ جوتیارێکی هەژار، کە هەموو بەشیان هەبوو لەو وەزارەتەدا.
هەموو ڕۆژێك دوای کار، لە ماڵەوە دەستم دەکرد بە خوێندنەوە، باوکیشم دایم بێ ئارام دەیپرسی: بۆچی هەموو ڕۆژێك لەدوای مێزەکەتەوە بێدەنگ دادەنیشیت و سەرت گرتووە بەسەر کتێبێکدا، چی پێویست بەوە دەکات... ئەوەندە خۆت لە پێناوی چیدا دەچەوسێنیتەوە؟
باوکم هەر نەیزانی بۆچی ئەوەندە خۆم ماندوو دەکەم... چونکە ساڵی دوایی کۆچی دوایی کرد.



ئەی دوای ساڵانی تەنگانە؟

لە ساڵی ١٩٥٩دا دوای حەوت ساڵێك گیرخواردنم لە ناوخۆمدا دەستم کردەوە بەنووسین... هەر ئەو ساڵە ڕۆمانی "منالآنی گەڕەکەکەم"م نووسی، لەناو نووسینەکانی ئەو ساڵانەدا کۆمەڵێك کورتە چیرۆکیشم نووسی و بڵاوم کردنەوە، ئەوەش بۆ جاری یەکەمم بوو، کورتە چیرۆکەکانم بکەم بە کتێبێك.

نووسینی ئەو چیرۆکانەم، لە ڕوانگەی خواستی خۆمەوە بوون، نەك وەك پێویستییەك بۆ خوێنەرانم، بەڵکو زیاتر وەك نووسەرێك بۆ ئازادکردنی ڕۆحی خۆم بوون، زۆرێك لەو چیرۆکانەم دەربارەی مردن بوون، خۆ ڕزگارکردنم بوو لە وەسوەسە و دوودڵیم لەگەڵ مانای مردندا، نووسین تەنها ڕێگەیە کە نووسەر سەربەست دەکات لەدەست داواکاری و گوشاری خەیاڵی.

ئەی سەبارەت بە سیاسەت لە نووسینەکانتا؟

هەموو ڕۆمانەکانم... تەپوتوزی سیاسەتی سەردەمی خۆیانیان پێوەیە، بەو هۆیەشەوە ڕۆمانتیك لێیان بێبەشە، بەڵام چیرۆك بەبێ هێڵی کورت یان درێژی سیاسەت تێیدا بوونی نییە.

من لەگەڵ سیاسەتدا گەورە بووم... وەکو پێشتر گووتم دایك و باوکم لایەنگری پارتی وەفد بوون، ئەوسا ئەو کەسانەی لایەنگری پارتێکی سیاسی تر بوون، بە مەزەندەی ئێمە بێ باوەڕ و هەڵەبوون.

لە ڕاستیدا تاکو ئەمڕۆش باوەڕم نەگۆڕاوە، ئێستاش پارتی وەفد بە جێگا و ڕێگای پرەنسیپی سیاسی خۆم دەزانم، قەت بە بیریشمدا نەهاتووە لایەنگر و هەڵگری بیر و باوەڕێکی تربم، یان پەیڕە و پرۆگرامی پارتێکی کە بە گونجاوتر بزانم، بۆ نمونە ئیخوان... بە هەموو تەمەنم نەك هەر سەرسام نەبووم بە هیچ کردەوەیەکیان، بەڵکو زۆر ڕقیشم لێیان بووە، بەهۆی بیری ڕادیکاڵانەیان و تاك ڕەوی و شێوازی فێندەمینتالیزمیانەوە.

لەراستیدا منیش وەکو باوکم هەمیشە سەرسام بووم بە

سەرکردە سەعد زەغلول، بەداخەوەم چانسی ئەوەم نەبوو لە نزیکەوە بیناسم، هەرچەندە جارێکیان بەتایبەتی چووم بۆ گەڕەکی زەین العابدین لە قاهیرە بە مەبەستی بینینی... بەڵام ڕێنەکەوت.
کەسانێکی وەکو من زۆر بوون کە سۆزیان هەبوو بۆ ئەو سەرکردەیە، بەڵام هەموو لەکاتی پێویستدا لە ترسی باوەڕیان بێدەنگەیان لێدەکرد، ئەوەم زۆر بەناهەقی دەزانی.
چەند ساڵێك پێش ئێستا قیبتییەکی هاوڕێم "میسرییەکی مەسیحی" کارتی دەعوەتنامەیەکی شووکردنی خوشکەکەیی پیشاندام... سەردەمی چاپکردنی ئەو کارتە دەگەڕایەوە بۆ چەند مانگێك دوای مردنی سەعد زەغلول، شووکردن یانی ئاهەنگ گێڕان و خۆشی، بەڵام ئەو کارتە... باگراوەندەکەی ڕەنگی ڕەش بوو، لەسەری نووسرا بوو: ئێمە بانگهێشتی تۆمان کردوە بۆ کەنیسە، تاکو بەڕێزەوە هەستی ماتەمینی خۆت دەربڕیت بۆ گیانی کۆچکردووی سەرکردەی ڕۆحیمان.
لێرەدا دەردەکەوێت کە زەغلول چەندە جیاواز بووە لە سەرکردەکانی ئەوسا و ئێستای میسر.
لە جیهاندا بەتایبەتی لە ناو عەرەبدا باوە و دەوترێت: لەکاتی مردنی سەرکردە یان ناودارێکدا... زۆری ئامادەبوونی خەڵك لەسەر قەبرانیدا پێوەرە، چەندێك دۆست یان لایەنگری هەبێت.
بەڵام بە پێچەوانەوە... ئەگەر ئەوە پێوەر بێت کەواتە "جمال عبد الناسر" دۆست و لایەنگری زۆر زیاتری هەبوون لە زەغلول، هەرچەندە لە سەردەمی زەغلول-دا دانیشتوانی قاهیرە یەك ملیوێن بوو، بەڵام لە سەردەمی ناسر-دا دانیشتوانی قاهیرە چەندین ملیۆن زیادی کردبوو، لەهەمان کاتدا نابێت زەغلول بە ناسر بەراورد بکەین... چونکە لە دوو سەردەمی زۆر جیاوازدا سیاسەتیان کردووە، بێجگە لەوەش زەغلول دەمرد لەپێناوی میسرێکی سەربەخۆ و گەلێکی ئازاددا، لە کاتێکیشدا بوو کە میسر داگیرکرابوو گەلەکەشی ژێر دەستە بوو، زەغلول شۆڕشی کرد... وڵاتی میسر لەوەدا بوو ئازاد بێت و داگیرکەری ئینگلیز دان بە سەربەستی گەلی میسر-دا بنێت، ئەوسا ناسر بوو بە سەرکردەی شۆڕش و دەسەڵاتی گرتەدەست.
ناسر کاری گرنگی کرد بۆ وڵات، ناکرێت ناویان نەهێنم، پەیڕەو کردنی بیرۆکەی سۆشیالیزم...





ڕێکخستنی سەرلەنوێی خاوەندارێتی زەوی و زار و بەرزکردنەوەی مافی کرێکار.
بەڵام بەداخەوە زۆر دوژمنکارانە لە خەبات و کەسایەتی زەغلولی دەڕوانی، لەسەرەتاوە دڵخۆش بووم بە شۆڕشی ساڵی ١٩٥٢، هەستم دەکرد لەو ڕۆژانەدا منیش هەروەکو زۆرینەی میسرییەکان بەشێکم لەو شۆڕشە و بە شۆڕشی خۆمم دەزانی، وەك باڵێکی بەهێزی سیاسی پارتی وەفد کە بەشێك بوو لەو شۆڕشە، شۆڕشێکیش کە تا ڕۆژی سەرکەوتنیشی هەمان پرەنسیپی سیاسی پارتی وەفدی هەڵگرتبوو، ئەوسا تەمەنام دەکرد کە ناسر و سەرکردەکانی تری ئەو شۆڕشە، وەفد وەلا نەنێن و چەندین سەرکردەی سیاسی ئەو پارتە پۆستی سیاسیان پێبدرێت، بۆ بەهێز کردنی دەسەڵاتی سیاسی لە وڵات، نەك من بەڵکو زۆرینەی ڕۆشنگەران ئەوسا پێیان وابوو کە ئەو سەرکردە سیاسیانەی پارتی وەفد... دەتوانن نوێنەری ڕاستەقینەی هەموو توێژ و چینە جیاوازەکانی وڵات- بن.
بەڵام بە پێچەوانەوە، هەموو ئەو سەرکردە سیاسیانەی پارتی وەفد و پرەنسیپی ئەو پارتە، بە هەڕەشە و ترسناك بۆ شۆڕش لەقەڵەم دران، ناوهێنانی سەعد زەغلول یاساغ کراو تەنانەت لە نووسراو و دۆکۆمێنت و کتێبەکانیشدا تاکو توانیان ناویان سڕییەوە.
هەرچەندە لە ساڵی ١٩٧٨دا پارتی وەفد دامەزرایەوە و سەرلەنوێ ڕۆحی سیاسی و سەرکردەیی خۆیی ڕێکخستەوە، بەڵام وەك پارتێکی نوێ و نەناسراو لای خەڵکی.
ڕاچڵەکیم کاتێك کچەکەم لێی پرسیم: بابە سەعد زەغلول کێیە؟ کچەکەم پێی وابوو زەغلول لە ژیاندا ماوە و سەرکردەیەکی نوێیە.
لە سەرەتای شۆڕشدا، ئەگەر ناسر خۆی بەتەنها هەموو بڕیارێکی سیاسی نەدایە. لەوە دەچوو بمان توانیایە دیموکراسی

پەیڕەو بکەین و بیپارێزین، بە پیرۆزکردنی ناسر لەبەرامبەر ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستی هێنابوون، زۆر گران لەسەر ئێمەی میسری کەوتن، سڕینەوەی فیۆدالیسم و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، ئەگەر حورمەتی دیموکراسی تێدا بپارێزرایە، کەسی شیاو لەجێگاو پۆستی شیاودا دانرابان، مەبەستم ئەگەر سیاسییە بەتواناکانی پارتە جیاوازەکانی ئەوسا بێکار نەکرانایە و بەختیان بەرکەوتایە لە بەڕێوە بردنی ولاتدا، لە کاتێکدا کە ئەو سیاسیانە دەستیان هەبوو لە سەرکەوتنی شۆڕشدا، ئەگەر ئێستا لە سەرئەنجامی ئەو شۆڕشە بڕوانین... چی گەیشتوە بەجێ... بەدڵنیاییەوە لە پێویست کەمترە.

بێجگە لە کتێبەکانمدا... بەشداریم نەکردووە لە هیچ چالاکییەکی سیاسیدا، بۆ منێکی نووسەر سەردەمانێکی گران و تاڵ بوون، نەدەکرا بەتەنها دوودڵبم و بەرانبەر بەو شۆڕشە بوەستمەوە، دوای چەندین ساڵ بێدەنگیم... لە زۆرینەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانەوە بە بێڕەحمانە هێرشیان کردەسەرم، لە دوای ساڵی ١٩٥٢وەوە دوور و نزیك خۆم پەنادا، ناو بەناویش بە بابەتێك پرسیارێکی گرنگم دەوروژاند، هەمیشە جێگا و پیرۆزی ناوی شۆڕشم لەخەیاڵ و دڵی خەڵکیدا پاراستووە، لە هەمانکاتدا لە کتێبەکانیشمدا وشەیەك چییە نایبینیتەوە کە من دژایەتی شۆڕشی ساڵی ١٩٥٢م تێیدا کردبێت. ئەوسا سەرنجی من لەسەر ئەو خاڵانە بوون کە بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن گەلی میسر زەرەرمەند دەبوو لێیان، لە گۆڤاری میرامار-دا ئاسۆی سۆشیالیزمی یەکگرتووم ڕووت کردەوە و زۆرێك لە هەڵە و ناپاکییەکانیانم خستەڕوو، ئەوەی لەو گۆڤارەدا نووسیبووم، ڕاستی بوون و کەس نەیدەتوانی چاویان لێ بپۆشێت، هەڵبەتە دەسەڵاتی ئەو سەردەمەش ئەوەیان دەزانی کە ڕەخنەکانم لە جێگای خۆیاندان و بوختانیان بۆ ناکەم... هەربۆیە توشی کێشەیان نەدەکردم.

لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ساڵی١٩٥٢وەوە و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بۆ گەلی میسر تاکو ئەمڕۆش... هەمیشە ترس دایگرتووم، نەك تەنها ترس لە دەسەڵات بەڵکوو ترسیش لە خوێنەرانم، بۆ نمونە... جارێکیان خوێنەرێکم کە دۆستیشم بوو پرسیارێکی لێکردم لەسەر چیرۆکێکم... لەوانەش بوبێت ئەو هیچ مەبەستێکی تری نەبوبێت، بەڵام من زۆر ترسام... هەمیشە بەو شێوەیە ترساوم، بەڵام دایم بەردەوام بووم لەسەر نووسین





و کۆڵم نەداوە... تەنها کاتێك کە دەنووسم ئەو ترسەم نامێنێ و قورسایی ئەو ترسە دەڕەوێتەوە. پێم وابێت ئەوە ڕەوشتی هەموو نووسەرێکی من ئاسایە. نووسەر هێزێکی بێکۆتای تێدا کۆدەبێتەوە ئەگەر بزانێت خۆی لەسەر هەقە.
بۆ خۆپاراستنم، پەیوەندیم نەبووە لەگەڵ هیچ دەستە و تاقم و لێپرسراوێکی دەوڵەتدا... نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا، ئەو ترسەشم پەنای پێنەبردمە بەر قونسوڵیەیەکی بێگانە تاکو بمپارێزن.
تەنها شت کە کردبێتم بەردەوامیدانم بووە بە نووسین... گلەیی و ڕەخنەکانم، نووسینەکانم دژی دەسەڵات، کتێب و نووسینەکانم بەرهەمی خەیاڵی کەسێك بوون کە بەشێك بوو یان تێوەگلا بوو لەگەڵ ڕوداوەکاندا، پێشم وابوو هەموو دەیانزانی کەمن دوژمنی شۆڕش و دەسەڵات نەبووم، چونکە ئەگەر وانەبوایە نەیان دەهێشت لە ڕۆژنامەی ئەهرام-دا بنووسم، یان ڕێگر دەبوون لەبەردەم هەموو ئەو بەختانەی ترمدا.
ئەو ڕەخنانەی لەدوای ساڵی ١٩٥٢وەوە لێم گیران هەموویانم بەگرنگییەوە وەرگرتن... بەڵام بە درێژایی کات لەگەڵیاندا ڕاهاتم، هەرچەندە تاکو ئەمڕۆش بەردەوامن.
نووسەرێکی فەڕەنسی وا لەبارەی منەوە نووسی بووی، "گوایە مەحفوز بووە بە سۆسیالیست"، لە وەڵامی نووسەرێکی تردا بۆ ئەو نووسەرە فەڕەنسییە هاتووە، "نەخێر مەحفوز کۆنەپەرستە".
هەمووکەس ئازادە لە ڕادەربڕیندا... چۆن من دایم بە پێویستم زانیوە بوارم هەبێت ئازادانە ڕاو بۆچونەکانم دەربڕم.

سەرچاوە:

**Gmaal al_Ghitani**

**Gesprekken met Nagieb Mahfoez 1986**



# ئەوەی چیرۆکەکان بۆمانی دەگێڕنەوە

**نووسینی: ئیریك پیگانی**
**و. لە فەرەنسییەوە: بەیان سەلمان**

سەرەتاییەکی پێویست
چیرۆك بە هەمەرەنگی و دەوڵەمەندی ناوەڕۆکەکانی و فۆرمی هەمەجۆری گێڕانەوەکانی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی هەمیشە مرۆڤی سەرسام کردووە. ئەگەر چیرۆك لە کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ بۆ بەسەربردنی کاتە، بۆ ئەوەش بووە کە شتی لێوە فێربین، بە نێوەندییەوە خەون ببینین و گەشە بە ئەندێشەمان بدات. جیاوازی فۆرمی گێڕانەوەی چیرۆك و دەستکاری هەندێ لایەنی بۆ گونجاندنی لەگەڵ کۆمەڵێکدا هیچی لە ستروکتوری چیرۆکە ئەسڵیەکە نەگۆڕیوە. بێگومان چیرۆك لە جەوهەردا زارەکییە، ئەم لایەنە

بواریداوە چیرۆك لە نێو هەموو میللەتاندا هاتوچۆ بکات و بگوازرێتەوە و شتێك بخرێتە سەری و شتێکیشی لێ کەمکرێتەوە تا بە باشی وەرگیرێ. بەسەرنجدان لەم بابەتەی خوارەوە، لایەنی دەروونناسی لە چەند چیرۆکێکی بەناوبانگدا تێبینی دەکەین. لەلاشمان ڕوون دەبێتەوە کە هەمان ئەو چیرۆکانەمان گوێ لێبووە، لە دایە گەورە و ئەمیش لە دایە گەورەی خۆیەوە گوێی لێبووە.
ئیریك پیگانی، دەروونناسێکی فەرەنسییە نزیکەی سی کتێبی لە بارەی شیکردنەوەی دەروونی و گەشەکردنی کەسایەتی هەیە. ئەم بابەتە یەکێکە لەو بابەتە کورتانەی لەسەر لایەنی دەروونناسی چیرۆك نووسیوەتەوە و تەنها چەند چیرۆکێکی دەستنیشان کردوە وەك نموونەیەك بۆ بابەتەکەی. لێرەدا دەقی بابەتەکەیمان وەرگێڕاوە.

چیرۆکەکان چێمان پێدەڵێن؟
هەبوو نەبوو کاری ناشەرعی دەکرا، خوشکەکان ڕقەبرایەتی یەکترییان دەکرد، ئارەزوو و مەیل هەبوو، وەلێ هیچی ئەمانە بە شێوە سامناکەکەی نەبوو. چیرۆکەکان بۆ نەستی منداڵان دەدوێن. لێرەدا جفرەی چوار چیرۆکی کلاسیکی شیدەکەینەوە.
پلان:

**پێشەکی**

- تێگەیشتن لەلایەنی ئەفسانەییمان
- بەفرە سپیلکە، برایان گریم
- پێستی کەر، شارڵ پیرۆ
- "سووتەکە" ساندریلا، شارڵ پیرۆ
- کۆڵوانە سوور، شارڵ پیرۆ




پێشەکی:
ئایا دەزانن کە یەکەم دەقی ساندریلا و زڕ دایك و خوشکەکانی لە دەستنووسێکی چینیدا دۆزرایەوە کە بۆ سێ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. بۆچی ئەو چیرۆکە





دیرینانەی وادەزانین بەسەرچوون و بۆ ئەم سەردەمەی ئێمە دەست نادەن هێشتا هەر دەخوێندرێنەوە و سەرنجمان ڕادەکێشن؟
چونکو زۆر بە سادەیی، ڕەنگدانەوەی ستروکتوری دەروونیمانن. لە منداڵییەوە، لە شێوەی وێنەی سیمبولین کە دەبنە زمانحاڵی کێشەکانی ناواخنمان، لە هەمانکاتدا پەنجە بۆ پەیوەندییەکانی نێو خێزان درێژ دەکەن وەك "ڕقەبەرایەتی، قەدەغەکردنی جووتبوونی نێوان مەحرەم (زینای مەحرەم)..." و کێشە تایبەتییەکانی تاك وەك "ڕەتدانەوەی وابەستەیی منداڵیی، جەغتکردن لەسەر خود، هەستکردن بە بەهای تایبەتی خۆی، ڕەتدانی گرێی ئۆدیبی". دوور لە سادەیی بیرۆکەی "ئەدەبی منداڵان"، ئەم چیرۆکانە لە ڕێگای تەوزیفکردنی خەیاڵ بە شێوەی خۆیان چارەسەرێك بۆ کێشەکانمان پێشنیاردەکەن؛ بۆیە ئاراستەکردنی ڕاستەوخۆی خودی منداڵ ئەم چیرۆکانە ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕن لە بیناکردنی کەسایەتی منداڵ. ئەمەش تەنها لەبەر ئەوە نییە کە پەیامێك ئاڕاستەی هۆشمان دەکات، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە لەگەڵ نەستیشماندا دەدوێ. هەر یەك لەم چیرۆکانە: بەفرە سپیلکە، سێ بەچکە بەراز و پوسەی بچووك یارمەتیان داوین لەواتای خێر و شەڕ تێبگەین، خەیاڵمانیان چالاك کردۆتەوە، گەشەیان بە زیرەکیمان داوە و بەتایبەتی یارمەتیان داوین هەست و سۆزمان ڕەوانتر ببینین.
دەوڵەمەندی ئەو چیرۆکانە بە ناوەڕۆك و سیمبولەکانیان بە ڕادەیەکە کە خۆیان بە سادەیی دەخنە بەر لێکدانەوە و شیکردنەوە. شیکردنەوەی دەروونناسی فرۆیدی وا دەریدەخەن کە ئەو چیرۆکانە بەرهەمی نەستن و لە ناواخنیاندا فشاری دەروونی و واتای شاراوەیان هەڵگرتووە. لە چیرۆکی "ژاك و دەنکە فاسولیا"، ژاك دەنکێ فاسولیای سیحریی دەنێتەچاڵ و لەپڕا دەبێتە دارێکی زۆر بەرز، ژاك پێیدا سەردەکەوێ، دێوەکە دەکوژێ و گەنجینەکەی دەدزێ. شیکردنەوەی دەروونناسی لەم چیرۆکەدا ڕەفتاری هەرزەکارێك دەبینن کە باوکی دەکوژێ بۆ ئەوەی نێرێتی خۆی بسەپێنێ. لە کاتێکدا دەروونناسان بە پێی فێرگەی یۆنگ چیرۆکێکی سەرەتایی تێدا دەبینن کە وێنەیەکە لە پێویستیمان بۆ گەیشتن بە پلەی بەرزتر لە هۆش. کەچی نە ئەم شیکردنەوەیە و نە ئەوی

تریان یەکدی ڕەت ناکەنەوە. بەڵگەش ئەمەیە: وەك هەموو چیرۆکەکانی تریش، ئەمەی "ژاك"یش نیشانی دەدات کە بەکارهێنانی زیرەکی لەلایەن پاڵەوانە بچووکەکەوە یارمەتیدەدات دێوەکە ببەزێنێ، ئەمەش منداڵ فێردەکات پشت بە خۆی ببەستێ و بۆی ڕوون دەکاتەوە کە دەکرێ زیرەکی و لایەنی عەمەلی لەبیرکردنەوە چارەسەرێك بێت، ئەگەر کەسەکە منداڵیش بێت لە کێشە و زەحمەتییەکانی ژیانی ڕزگاری دەکات.

لایەنی جیهانی و قوڵیی ڕەمزییەتی ئەو چیرۆکی فریشتانە بوارمان دەدەن چەند جارێك بیانخوێنینەوە، چەندین جار بیانگێڕینەوە و لە هەموو قۆناغێکی تەمەندا. هەر ئەم لایەنەشە کە لە ئێستادا لە بواری چارەسەرکردنی دەروونی و گەشەی کەسایەتی بەکار دەهێندرێت: چەندین وەرشەی گێڕانەوەی چیرۆك کراوەتەوە و لێکدانەوەی هەمەجۆر پێشنیار دەکەن بۆ ئەوەی ئەو "منداڵەی لە ناخماندایە" بەخەبەربهێنن و گەشە دەدات بە دەوڵەمەندی ئەندێشەمان و یارمەتیمان دەدات خۆمان بگۆڕین.

**تێگەیشتن لەلایەنی ئەفسانەیمان**

دوو سەد ساڵ پاش لەدایکبوونی نووسەر و حیکایەتخوێنی دانیمارکی "چونکە بە زار چیرۆکی گێڕاوەتەوە" هانز کرستیان ئەندرسن، کۆمەڵێ چیرۆك لە گەشەی کەسایەتیدا بەکارهێندراون.

ئەو میتۆدانە سێ کەسایەتی سەرەکی لە هەموو ئەفسانەکانی دونیادا بەکار هاتووە:

- پاشا/ خواستمان دەنوێنێ بۆ گۆڕان و بۆ توانای بیرکرنەوەی باش.
- پاڵەوان/ بەرجەستەی حەزمان دەکات بۆ کردەوەیەك و جێبەجێکردنی گۆڕان.
- فریشتە/ بەرجەستەی لایەنی سیحریی نەستمان دەکات. ئەویشە کە دەرفەتەکانمان بۆ دەدۆزێتەوە و هەلی گونجاو دەرەخسێنێ تاکو گۆڕانکارییەکان ئەنجام بدرێ.

دواجار، چیرۆك یارمەتیدەرێکی بەنرخیشە تاکو وێنەیەك بدەینە ڕێبەستەکانمان.







## بەفرە سپیلکە، برایان گریم

زەحمەتییەکانی هەرزەکاریی:
چیرۆکەکە: کچە شازادە بەفرە سپیلکە هەزار جار لە زڕدایکەکەی جوانترە، ئەمیش لەبەغیلیدا هەوڵی کوشتنی دەدات و بەفرە سپیلکە لە دارستانێکدا لەلای حەوت کورتەباڵاکە خۆی دەشارێتەوە، ئەوجا زڕدایکەکەی ژەهرخۆر دەکات و تەنها بە ماچێکی کوڕە شازادەیەك ژیانی دێتەوە بەر.
زۆر کەمن ئەو چیرۆکانەی سەرکەوتوون لە گێڕانەوەی زەحمتیەکانی قۆناغی گەشەی منداڵ، بە تایبەتی ئەوانەی باسی گەشەی ماوەی هەرزەکاری کچان دەکەن. چیرۆکی بەفرە سپیلکە لە سەرەتادا وەهایە کە شاژنێك ژیانێکی ئارام بەسەر دەبات، سکی پڕە، دڕکێك دەچەقێتە پەنجەی شاژن و سێ دڵۆپ خوێن دەکەوێتە سەر بەفر: بێگەردیی و سپێتی بەفر دەبنە هاودژییەك لەگەڵ خوێن کە ڕەنگی سوورە و نیشانەی سێکسواڵەتییە.
پاشان لە کاتی منداڵبووندا گیانی لەدەست دەدات.
لە ڕاستیدا ئەم چیرۆکە کچان ئامادە دەکات کە قبوڵی لایەنی گەورەبوونیان بکەن بە بینینی خوێنی خولی مانگانە. منداڵ فێردەبێ کە هەلومەرجی یەکەمی بەپیتبوون ڕێژەیەکی کەمی خوێنە. بەهەمان جۆریش بەفرە سپیلکە قۆناغی گەشەکردنی هەرزەکاری لەلای حەوت کورتەباڵاکە بەسەر دەبات، تا ڕادەیەك ئەوانن کە هەڵدەستن بە ئامادەکردنی بۆ ژیانی داهاتووی هەتا ئەو عانەی کوڕە شازادە پەیدا دەبێ و ئەو حەزو مەیلەی بۆ جێبەجێدەکات کە گەرووی گرتبوو و سیمبولەکەی "سێوەکە"یە. هەڵوێستی زڕدایکەکەشی بەرامبەر بە ئاوێنەیەك بەردەوام لێی دەپرسێ " ئاوێنەکەم کێ لەمن جوانترە..." قۆناغێکی پێویستە بۆ بونیادنانی شوناسی مێیەنە کە دەبێ دایك جێی خۆی بۆ کچەکەی جێهێڵێت.

## چیرۆکی پێستی کەر

قەدەغەکردنی جووتبوونی نێوان مەحرەم:
لەم چیرۆکە پاشایەك ژنەکەی لەسەرەمەرگدا بەڵێنی لێوەردەگرێ کە پاش ئەو جارێکی تر هاوسەرگیری نەکات، ئەگەر ژنەکە لەو جوانتر نەبێ. کە ژنەشازادە دەمرێ، پاش ماوەیەك پاشا لە کچەکەی خۆی بەولاوە ژنی جوانتر نابینێ. داوای لێ دەکات شوی پێبکات، کچەکە بە توندی ئەو داخوازییە ڕەتدەکاتەوە. لە ئاست زۆرەملێی باوکی فریشتەیەك هاریکاری دەکات و ئامۆژگاری دەکات داوای کراسی زۆر تایبەت بکات کە بە بڕوای ئەوان هەرگیز نایەتە دی، کەچی هەر بۆی دەهێننە دی. باوکی کەرێکی هەیە زۆری خۆش دەوێ، کچەکەی ئەم فێڵەش دەکات و داوای لێ دەکات پێستی کەرەکەی بۆ بکاتە کراس، ئەمەشی بۆ جێبەجێ دەکرێ، کە هیچ چاری نامێنێ شەو هەڵدەێت و هەموو کراسەکانیشی لەگەڵ خۆیدا دەبات. لە گوندێکی ناوچەیەکی تردا دەبێتە کارەکەر و بە پێستی کەرەکە خۆی دەشارێتەوە، تا ڕۆژێکیان کوڕی پاشای ئەو ناوچەیە بە یەکێك لە کراسە تایبەتییەکانیەوە دەیبینێ و ئاشقی دەبێ. داوا لە کچەکە دەکات کێکێکی بۆ دروست بکات، ئەمیش لە عانی دروستکردندا موستیلەکەی دەکەوێتە نێو هەویرەکە و دواتر دەکەوێتە دەستی کوڕەکە. پاش ئەوە کوڕە لەوێ دەڕوات و کچە دیسان خۆی بە پێستەکە دەشارێتەوە، شازادەش هەر بەدوایدا دەگەڕێ و لە تاواندا نەخۆش دەکەوێ تا ئاهەنگێك سازدەکات کە هەموو کچانی ناوچەکە بێن و موستیلەکە تاقی کەنەوە، دواجار کچە دێت و موستیلەکە پڕ بە پەنجەیەتی، بەیەك شاددەبن، کچەکە سەردانی باوکی دەکات، ئەمیش فریشتەکەی خواستووە و کچە لەگەڵ باوکی ئاشت دەبێتەوە و کۆتاییەکی خۆشیان دەبێ.

ئەم چیرۆکە، لەبەر ناوەڕۆکەکەی تا ماوەیەکی زۆر قەدەغەکرابوو چونکە کێشەی جووتبوونی نێوان مەحرەم تاوتوێ دەکات. بە مردنی دایکی کچە شازادە، فریشتەکە جێی دایکی بۆ دەگرێتەوە لە ئامۆژگاری و پەروەردە. ئەم چیرۆکە، لەلایەکەوە باس لە زەبری دەسەڵات دەکات کە لە دەسەڵاتی پاشادا بەرجەستەیە، تەنانەت زەبری بەرامبەر



به کچی خۆشی؛ وانەیەکیشە بۆ منداڵان کە بە دوای ژیانێکی ئاساندا نەڕۆن و پشت بە خۆیان ببەستن. پێستی ئاژەڵیش سیمبولێکە بۆ پاڵەوانە کچەکە کە بەرگری بکات و پاکیی رۆحی لەدەست نەدات.

## سەندریلا"بە واتای، سووتەک"



ڕقەبرایەتی نێوان خوشکان:

هەموان چیرۆکی سەندریلا پێدەزانین، دیارە بە چەند جۆرێك ئەم چیرۆکە گێڕدراوەتەوە بەڵام بەناوبانگترینیان ئەمەی شارڵ پیرۆیە: پیاوێکی دەوڵەمەند پاش مردنی ژنەکەی ژنێکی تر دەخوازێ و ئەمیش دوو کچی هەیە. دەکەونە ڕقەبەرایەتی لەگەڵ سەندریلا، کە باوکیشی دەمرێ مامەڵەی خراپتری دەکەن. پاشا بۆ ئەوەی کوڕەکەی کچێك بۆ هاوسەر هەڵبژێرێ ئاهەنگێکی گەورە دەگێڕێ. ماڵی سەندریلا بانگهێشت کراون، وەلێ زڕدایك و کچەکانی هەموو ڕێیەك لە سەندریلا دەگرن، ئەمیش بە هاوکاری فریشتەیەك بەرگێکی زۆر جوان لەبەر دەکات و ڕۆیشتنەکەی بۆ ئاسان دەکاتەوە بە مەرجی گەڕانەوەی لە پێش نیوەشەو، دەگاتە ئاهەنگەکە بە مەرجی ئەوەی نیوەشەو بێتەوە، لەوێ لەگەڵ کوڕە شازادە حەز لەیەك دەکەن، دوایی سەندریلا هەڵدێت تا بەڵێنەکەی بەسەرببات، تاکێ لە پێڵاوە شووشەییەکەی لێ بەجێدەمێنێ، پاش گەڕانی زۆر بە دویدا لە کۆتاییدا کوڕەپاشا سەندریلا بەو تاکە پێڵاوە دەدۆزێتەوە و بەیەك شاد دەبن.

گرنگی ئەم چیرۆکە لەوەدایە کە هەست و سۆزی منداڵێك لە تەمەنی سەندریلا کە دایك و باوکی لەدەستداوە بە وردی بۆ ئێمەی گواستۆتەوە. ئەم هەستەی سەندریلا پڕ فشاری دەروونییە، لە سەرەتای هاتنی زڕ دایکەکە و قینەبەرایەتی دوو نیمچە خوشکەکانی لەگەڵیدا تاکو کۆتایی نموونەیەکە لەسەر ئەو جۆرە پەیوەندییە شەڕەنگێزە کە رەهەندێکی نێو نەتەوەیی هەیە و لە هەموو شوێنێکدا دووبارە دەبێتەوە. دەروونناسی ئەمریکی ـ نەمساوی **Bruno Bettelheim** لە شیکردنەوەی

دەڕوونی چیرۆکی فریشتەکان، دەڵێ: ڕۆڵی زڕدایك وەك فیگەرێکی ترسناك بواردەدات بە منداڵ بەرەوڕووی ئەو قین و قێزە بێتەوە کە لە بنچێنەدا بۆ دایك و باوکی خۆی هەیەتی و ئەمە نەستی داگیرکردوە و نەیتوانیوە دەریببڕێ. هەروەها، بەم جۆرە چیرۆکە منداڵ بە ئازادی ئەو هەستانەی دەردەبڕێ بێئەوەی هەست بە نارەحەتی ویژدانی بکات.

## کۆڵوانە سوور

سێکس و فریودان:
ئەم چیرۆکەش نزیکەی بە سی جۆر گێردراوتەوە و ئەمەی پیرۆ لێرە مەبەستە. کۆڵوانە سوور، کچێکی زۆر جوانە و دەنێردرێتە لای نەنکی، وەلێ گورگێك پێش ئەو کەوتووە و نەنکی خواردوە و تەڵەی بۆ ئەمیش ناوەتەوە و دواتر ئەمیش دەخوات.
لەم چیرۆکەدا، لە پێشاندا لەسەر رەنگی سوور دەوستین کە سیمبولێکی توندوتیژی سێکسە. ئاشکرایە کە گورگ لێرەدا نیشانەیەکە بۆ نێر کە چارۆکە سوور خۆی ڕووت دەکاتەوە و دەچێتە ناوجێ لەگەڵ گورگەکە، کچە لە گورگەکە دەپرسێ بۆ قۆڵت وەها زلبووە؟ گورگەکە وڵامی دەداتەوە: "بۆ ئەوەی باشتر تۆ لە باوەش بگرم". لێرەدا هیچ بوارێك بۆ خەیاڵ نامێنێ و دەزانین کە دەیخوات، ئەم کرداری خواردنە سێکسە. دەبێ لایەنێکی ڕەوشتیش لەم چیرۆکەدا ببینین کە پیرۆ جەختی لەسەر کردووە و لە کۆتاییدا خۆی بۆی زیادکردووە کاتێ دەڵێ: "کچە گەنج و جوان و ناسك و پڕ سۆزەکان هەڵەدەکەن کە باوەڕ بە هەموو کەسێك دەکەن".



سەرچاوەی وەرگێڕانی بابەتەکە:
**http://www.psychologies.com/Culture/Philosophie_et_spiritualite/Savoirs/Articles_et_Dossiers/Ce_que_**




les_contes_nous_racontent/4

ئەم سەرچاوانەش لەلایەن خودی نووسەر و دەروونناس ئیریك پیگانی نووسراوە:


- Bruno Bettelheim, Psychanalyse des contes de fées, Ed. Pocket, .Paris 1999
- Marie_Louise von Franz, L'Interprétation des contes de fées, Ed. .Jacqueline Renard, Paris 1990
- .Anne_Marie Garat, Une faim de loup, Ed. Actes Sud, Paris 2004
- .Clarissa Pinkola Estés, Femmes qui courent avec les loups, Ed. Grasset, Paris 1996



# دارهەرمێ

سیناریۆ

داریوش میهرجوویی

گوڵی تەرەقی

2014

وەرگێڕ: شادی نیکخا

ئارام کاکەی فەلاح

ڕەووف بێگەرد

توانا ئەمین

جەلال ئاڵ ئەحمەد

بارا

فەرهاد مستەفا

پشتیوان هەڵبجەیی

مارگرێتا ئێکستروێم

# چیرۆک ئەدەبی سەردەم



# ژنی ژێر باران "3"

**ئارام کاکەی فەلاح**

**ستۆکهۆڵم، یانوەری 2014**

نازانم منتان بیر ماوە یان نا؟ من غەریبم، غەریب ڕیکۆرد، ئەو کەسەی نیوەی زیاتری تەمەنم لە نووسینەوەی ژیانێکی پڕ دڕك و گەڕان بەدوای کەسانێکی ون بوودا سەرف کرد، کە ئەفسووس نە توانیم بە دڵی خۆم ئەو ژیانە بەدبەختە بنووسمەوەو نە ئەو کەسانەشم بۆ دۆزرانەوە کە ڕێکەوت یان چارەنووس بە منی ناساندن و کردنی بە بەشێك لە ڕۆحی شێواوم.

من ئێستاش جار بە جارێ خوێنەرانێك لەم لاو و خوێنەرانێك لەولا، هەر بە مەیلی جارانەوە، هەواڵی نووسینی چیرۆکم لێ دەپرسن، کەسانێك بێزار لە چیرۆکی کوردی. وەڵامیان دەدەمەوە و دەنووسم، نا ئازیزان، وەك هەمیشە بۆم نووسیوون، من چیرۆکنووس نیم. من حەقم چییە ئەو هەموو چیرۆکە خراپانە بڵاودەبنەوە. بۆیە واز لە من بێنن و بڕۆن یەخەی ڕۆژنامە و گۆڤار و سەرنووسەرەکانیان بگرن کە مەجبوورن لەبەر پڕکردنەوەی لاپەڕەکانیان ئەو هەموو شتە سەیرانە بە ناوی ئەدەبەوە بڵاوبکەنەوە. کەسانێك پێیان خۆشە بێن و من دڕکەکانیان پێشان بدەم، بێن و پەیکەری ئەو پیاوەی بوو بە بەرد ببینن، بێن و کەمێك بارانی سەر سەدەکە لە ناکاو نەرم نەرم لەدەم وچاویان بدات. پێیان خۆشە بێن و دەفتەری ریکۆردەکان ببینن و دەست لە چوار کلیلەکەیەوە بدەن. دەفتەرێك لەسەری نووسراوە "دڵی خەڵکانە بەهەشت، دڵی خەڵکان". بۆیان دەنووسم: نا ئازیزان، تکایە وەك توریستێك، وەك شوێنێك بۆ گەشت و گوزار و حەوانەوە، سەیری ئازارەکانی من مەکەن. تووریستێك بەخۆی و کامێرایەکەوە هەموو شوێنێ دەگرێ، هەموو شتێ دەبینێت، ئازارەکانم نەبێت. ئاخر نابێ خوێنی من و پەرداخێك شەربەتی هەنار وەکو یەك سەیر بکەن. ئەوەی ئێوە وەك حەز و ئارەزوویەك سەیری دەکەن، وەك چیرۆکێك پێتان خۆشە بیخوێننەوە و چێژی لێ وەربگرن. بۆ من هەر چرکەیەکی جەهەنەمێکە. نووسینی ئەم چیرۆکانە لای من تەواو لە ڕاکردن دەچێ بە پێی پەتیی بەسەر هەزارەها نووکی چەقۆدا.
بەڵام ئەم جارەش هاتمەوە لاتان، هاتنەوەی ئەم جارەی من و نووسینەوەی بەشێکی تری ئەم چیرۆکە دڕکاوییە، تەنها لەبەرخاتری کەسێکە، بەڵام چ کەسێك؟ کەسێك کە لە مێژە لێم ون بوو بوو. نووسینەوەی ئەم چیرۆکانە نەبووایە قەت نەمدەدۆزییەوە. بەڵام ئێستا کاتم نییە باسی بکەم، نا، کاتم نییە.
پێش هەموو شتێك حەز دەکەم بەوە دەست پێ بکەم کە هەفتەی پێشوو لە فەیس بووکەوە نامەیەکی زۆر سەیرم بۆ هات، ڕەنگە لەلاتان سەیر بێت کە نامەکە لە کەسێکەوە بوو بە ناوی ـ ژنی ژێر باران ـ. من دەزانم کە ئێوە هەمووتان ژنی ژێر باران دەناسن، بە جۆرێك لەجۆرەکان ئاگاتان لە چیرۆکی ژیانێتی، ژنێك دوای مردنی مێردەکەی لە



پاریسەوە بە تراکسۆدێکی زەردەوە دێتەوە بۆ شار، نیوەی پیاوانی ئەم شارە شەیدای جوانییەکەی دەبن و نیوەکەی تریشی دەچنە خوازبێنی و شوو بەکەس ناکات، شاعیرەکان شیعر لەسەر شیعر، دیوان لەسەر دیوانی پێشکەش دەکەن و ئەو هەر تاقەتی خوێندنەوەشیانی نییە. هەموومان دێڕە بەناوبانگەکەی ئەومان لەبیرە کە دەڵێ "زۆربەی زۆری پیاوانی ئەم شارە تەنها بیر لە گوونی خۆیان و ورگی خۆیان دەکەنەوە". دێتەوە بۆ ئەم شارە تا شۆڕشێکی فێمینیستی وەك خۆی دەڵێ بەسەر پیاوە ناشرینەکانی خۆماندا بکات. هەر لەیەکەم هەفتەی هاتنەوەیەوە، دەستە بە دەستە دەچنە خوازبێنی تا شوو بکاتەوە و شۆڕشەکەی بیر چێتەوە، شوو بکاتەوە و بە زێڕ و منداڵ دروست کردن لە موبەق زیندانی بکەن و هەموو خەونێکی وەك مرۆڤ بیربەنەوە. ئەو ئاگرەی ناو سەریشی خامۆش بکەن کە گەر بە وردی سەیرت بکردبایە دووکەڵەکەی لە دوورەوە لەناو قژییەوە زۆر بە تووڕەیی دەهاتە دەرەوە. هەندێ لەوانەی کە بە قووڵی کۆمەڵگای ئێمەیان دەخوێندەوە، لەو بڕوایەدا بوون کە دەرکەوتنی دە ساڵ، پانزە ساڵ جاری کچێك لەم شارەدا کە دژی یاساکانی پیاو دەجەنگێ، کە ئەو هێزەی تیایە لەبەر دەم ئەو ڕەشەبا نێرینەیەدا بوەستێ، تەنها ماوەیەکی کورتە و بە زۆر دەیدەن بە شوو، هەر دوای ئەوەش وا ڕێگەی لێ دەگرن و مەجبووری دەکەن بچێتەوە ژێر هەمان ئەو یاسایانەوە کە ڕۆژانە لە دژی نووسیووە و لایەنە ناشرینەکانی پێشان داوە و لافیتەکانی لە میتینگەکاندا لە دژی بەرزکردووەتەوە. زۆربەی پیاوە دەسەڵاتدارەکانی شار دەکەونە خۆیان و لەم کۆبوونەوە دێنە دەرەوە بۆ ئەو کۆبوونەوە، هەست بە ترسناکی شۆڕشەکەی دەکەن و لەو بڕوایەدا دەبن گەر ئەم ژنە شوو نەکاتەوەو شۆڕشەکەی سەر بگرێ، ئەوا دەبێ شوێنی خۆیان لەگەڵ ژندا بگۆڕنەوە و لەجیاتی ئەوان بچنە موبەق و لە پیازپاکردن زیاتر هیچیان بۆ نامێنێتەوە. تا ڕێکەوت لەفەیس بووك دەیکات بە هاوڕێی کەسێك و ئەویش ئێوارەیەکی غەمگین لە پارکی دایك دیارنامێنێت. بەڵام لێرەدا نهێنییەك هەیە هەر بۆ چیرۆك باشە، نهێنییەك نامەوێ لێتان بشارمەوە، ئێستا پێتان نەڵێم، دوایی کە هێزی نووسینم نەما قەت لێم خۆش نابن. من لە مێژ بوو دەمزانی ژنی ژێر باران کێیە، وەك زۆربەی زۆری خەڵکی ئەم شارەش ناوەکەیم بیستبوو،






ئاگام لە چیرۆکە غەماوییەکەی ژیانی بوو، دەمزانی دەیەوێ شتێ لە خەڵکی ئەم شارەی خۆمان بگۆڕێت و ڕێی لێ دەگرن و پێی ناکرێت. دوو جار چووم بۆ پارکی دایك و لەسەر ئەو کورسییە ڕەق و تەق و ئاسنینە دانیشتم کە ئەوان یەکەمجار یەکترییان تیا بینی. مەبەستم خۆی و هاوڕێکەی بوو. خۆشم نازانم بۆ حەزم کرد بچم و ئەو نامەیەی ئەوانم کۆپی کردبووەوە و چەند جارم لەسەر ئەو کورسییە بە دەنگی بەرز  بۆ خۆم خوێندەوە. من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی هاوڕێکەی کە لێی ون بوو بوو بدۆزمەوە، کەسانێکی زۆر داوایان لە من کرد بەدوای هاوڕێکەیدا بگەڕێم، بەو پێیەی من ئەزموونێکی زۆرم هەبوو لە گەڕان بەدوای کەسانی ون بوودا و کەسێك بووم هەروا بەئاسانی تەسلیم نەدەبووم. بەڵام ئەمە هەموو ڕاستییەکە نییە، لێرەدا نهێنییەك هەیە لەناو نهێنییەکی تردایە. ئەویش ئەوەیە کە من دە ساڵێك زیاتر بوو ژنی ژێر بارانم دەناسی، کاتێك من ناسیم و چایەکمان پێکەوە خواردەوە ئەو ناوی ژنی ژێر بارانی لەخۆی نەنابوو، بەڵکو ئەوسا فەیس بووك هەر نەبوو. ساڵانێك دواتر کە من هەواڵی ئەو ناوەم لێ پرسی، پێم وت بێزەحمەت ناوی ژنی ژێر باران لە چییەوە هاتووە؟ بۆ ئەو ناوە سەیرەت لەخۆت ناوە؟ چاوانی پڕ بوون لە فرمێسك و هەستا ویستی بڕوات، بە کزییەوە وتی: بەڕێزم پرسیارێکت لێ دەکەم؟ وتم فەرمووو. وتی: تۆ قەت بە منداڵی حیکایەتت بۆ کراوە؟ وتم بەڵێ. وتی ئەی بە گەورەیی؟ وتم مەبەستت چییە؟ وتی بەڵێ هەر مەبەستم ئەوەیە کە وتم، با مەبەستەکەم باشتر ڕوون بکەمەوە. تۆ قەت بە گەورەیی نەخۆش بوویتە و خۆشەویسترین کەست حیکایەتت بۆ بکات تا خەوت لێ بکەوێ و چاك بیتەوە؟ وتم نا، قەت ئەو بەختەم نەبووە، قەت بەخت بەو شێوەیە قژی دانەهێناوە و بێتە سەر ڕێگام. وتی کەواتە هەرچی بڵێم زیادەیە و لێم تێناگەیت. پێش ئەوەی بڕوات چەترە سپییەکەی بەرزکردەوە و  بە هەنیسکێکی گەرم و زەردەخەنەیەکی برینداروەوە وتی: لە دەرەوە باران دەبارێ، فەرمووو ئەم چەترە سپییەم لێ وەرگرە. من چەترێکی ترم لەناو جانتا دەستییەکەمدا پێیە، منیش زوو فریا کەوتم و وتم، باشە منیش حەز دەکەم چەترێکت بەدیاری بدەمێ، حەز دەکەی ڕەنگەکەی چۆن بێت؟ کەمێك بیری کردەوەو وتی: چەترێکم دەوێ لەڕەنگی باران، منیش وتم بۆ؟ وتی ئاخر هەروەك چۆن لەبەر باراندا نابینرێت کەدەگرین، ئاواش بەچەترێك لەرەنگی باران نابینرێت کە بەچەترەوە

وەستاوین، باران و چەترەکە تێکەڵاوی یەك دەبن. دەبێ ئەو دیمەنە لە دوورەوە چەند جوان و پڕ تەلیسم بێت و چ سیحرێکی هەبێ. لە دوورەوە یەکێ بتبینێت پێی سەیر دەبێ کە لەبەر باراندا وەستاویت و تەڕیش نابیت. منیش پێکەنیم و وتم مانای ئەوەی تا چەترێکی وا دەگمەنت بۆ پەیدا نەکەم بۆم باس ناکەیت و پێم ناڵێی ژنی ژێر باران لەچییەوە هاتووە؟ وتی نەخێر، دەزانی بۆ؟ چونکە بۆ گێڕانەوەی پێویستم بە هەموو هێزی دونیایە، ئێستا ناتوانم باسی رۆژێکی باراناویت بۆ بکەم. بەڵام رۆژێك دەبێ ئەو هێزەم هەبێ و بۆت باس بکەم. ئێستا نا، تکایە ئێستا نا. بەڵام ئێمە یەکترمان باش دەناسی، ئەوەش کە من یەکێك بووم لەوانەی کە حەزم کرد هاوڕێکەی بدۆزمەوە، هی ئەوە بوو کە ئەو چاکەیەکی لەگەڵ کردم و منیش حەزم کرد چاکەکەی بدەمەوە. بۆیە من لێرەدا باسی ئەوە ناکەم کە ئایا من هاوڕێکەیم دۆزییەوە یان نا؟ ئەوەیان هەڵدەگرم بۆ ژنی ژێر باران تا ئەو بۆتان بگێڕێتەوە، چونکە هەست دەکەم گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە هەر لەخۆی دێت. ئەوە چیرۆکی خۆیەتی و هی کەسی تر نییە، با منیش یارمەتیم دابێ، ئەوە ئەو مافەم ناداتێ من بیگێڕمەوە. ڕەنگە ڕۆژێك بێت و ئەو وەك خۆی دەڵێ چیرۆکێك بنووسێت بە ناوی "چەترێك لە ڕەنگی باران"، منیش وەك ئێوە، وەك خوێنەرێك چاوەڕێ دەبم و پێم خۆش دەبێت بیخوێنمەوە. بەڵام ئێستا ئەی خوێنەری ئازیز! ڕەنگە بەلاتەوە سەیر بێت، ئێمە دە ساڵ پێش ئێستا بۆ دەبێ یەکتریمان بینیبێت، چاکەی چیمان بەسەر یەکەوە هەیە؟ ئێستا ئیدی بەرە بەرە بۆ ئەوەی ئەم چیرۆکە شوێنی خۆی بگرێت، دەبێت وردە وردە بکەومە گێڕانەوەی هەندێ بەسەرهات، بەڵام پێش ئەوەی ئەوە بکەم دەبێ هەندێ شتی خێرا بەبیری خوێنەر بێنمەوە نەوەك بەشەکانی تری لەبیر نەمابێت. گەر هاتوو بەشەکانی تر و گێڕانەوەی هەندێ بەسەرهات تێکەڵاوی یەکتر بوون، بۆ ئەوە دەبێ من داوای لێ بووردن بکەم، وەك وتم من چیرۆکنووس نیم و نازانم چیرۆك چۆن چۆنی بینا دەکرێت.
هەمووتان ڕەنگە ڕۆمانی هاوڕێم بناسن، رۆمانی پاریسی، کە داوای لەمن کرد چیرۆکی "نووسینەوەی درك" بنووسمەوە تا یەکێ چیرۆکەکە بخوێنێتەوە و کلیلێك لە چوار کلیلەکە، کە لای پاریسی بوو بۆم بێنێتەوە. یەکێ دوای خوێندنەوەی چیرۆکەکە بزانێت کە






ئەو کلیلەی بۆم دێنێتەوە زۆر بایەخی هەیەو بێ ئەو کلیلە دەفتەری ژمارەی پێوانەییەکان قەت ناکرێتەوە. ئەو دەفتەرەی بە بادانی چوار کلیل لەیەك کاتدا دەکرێتەوە. ڕەنگە بیرتان مابێت کە پاریسی هاوڕێم هەوڵێکی زۆر دەدا لە پاریس کەسێك بدۆزێتەوە کلیلەکەی پێدا بنێرێتەوە، کەسی دەست ناکەوێت تا بەهۆی کوردەکانی پاریسەوە دەبیستێت کە ژنێك مێردەکەی بە شێرپەنجە ماوەیەك دەبێ مردووەو لە پاریس تاقەتی چووە و دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ وڵات. بە هۆی کچێکەوە ژمارەی تەلەفۆنەکەی وەردەگرێت و تێلێکی خێرای بۆ دەکات و سەرەخۆشی لێ دەکات و هاوخەمی خۆی پێ ڕادەگەیێنێت و بەشەرمێکەوە داوای لێ دەکات کە بەیانی حەز دەکات بیبینێت و چیرۆکێکی بداتێ بیخوێنێتەوە. ئەویش بەلایەوە سەیر دەبێ کە گەنجێك دەیەوێ چیرۆکێکی بداتێ بۆ خوێندنەوە، لای ئەو خانمە، کوردەکانی دەرەوە یان خەریکی دەعوەتکردنی یەکترن و هەر کە گەیشتنە بەردەمی دەرگاکە بۆ ڕۆشتن، دەکەونە زەمکردنی یەك، یان دەچن بۆ ئاهەنگ وتا دەتوانن هەڵدەپەڕن و دوایی پیاوەکان بە یەك بیرە سەرخۆش دەبن و دەیکەن بە شەڕ. یان منداڵەکانیان دەبەنە ماکدۆناڵدس و خۆیان بەدوای کەبابخانەدا دەگەڕێن. بەڵام چیرۆکێك بۆ خوێندنەوە؟ هیچ کەسێك لە دونیای کوردیدا شتی وا قۆڕی لێ داوا نەکردووە، داوای ماچیان لێ کردبێ، داوای خوێندنەوەی چیرۆکیان لێ نەکردووە. بۆیە یەکسەر ڕازی دەبێ. ڕۆمانیش بەیانی لە شوێنێك دەیبینێت و چیرۆکەکەی دەداتێ و پێی دەڵێ، خانمی ئازیز! ئەم چیرۆکە بخوێنەوە و هیچی ترم ناوێ، گەر بەدڵت بوو، تەلەفۆنەکەم لەسەر نووسیووە و گەر توانیت کلیلێکم بۆ بەریتەوە بۆ برادەرێکم کە خاوەنی ئەم چیرۆکەیە و ناوی غەریب ڕیکۆردە سوپاست دەکەم. گەر بە دڵیشت نەبوو وەك هەندێ ڕەخنەگر بیدڕێنە و بە هەر دوو قاچت، بە پاژنەی پێڵاوەکانتەوە تا هێزت هەیە بچۆ سەری تا هەنجن بە هەنجن دەبێ و لاپەڕەکان وشەیان تیا نامێنێت و ئاواش هەر سوپاست دەکەم و ڕێزم هەیە. ئێستا ئیتر خوێنەری ئازیز! باش دەزانی کێ کلیلەکەی کاتی خۆی بۆ هێنامەوە و ئەو چاکەیەی لەگەڵ کردم کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە. هەر کە کلیلەکەی دامێ، داوای لێ کردم ئەو نامەیەی پێشان بدەم کە لە ژووری دڕکەکاندا دۆزیمەوە و هەردوو کلیلی "کۆپی یەکتر"ی تیا بوو. ئەو نامەیەی من پەیمانم دابوو وەك پاداشت پێشانی ئەو کەسەی بدەم کە کلیلەکەم بۆ دێنێتەوە. بەدەم چاخواردنەوەیەکی خێراوە

نامەکەی خوێندەوە و تەوقەیەکی کرد و ڕۆشت. پێش ئەوەی بڕوات سەیرێکی کردم و وتی، براڤۆ بەڕێزم! سوپاس ڕۆڵە بۆ ئەو چیرۆکە. تۆ وات لەمن کرد چیرۆکم خۆش بوێت. منیش وتم: نا ببوورە من چیرۆکنووس نیم خانمی بەڕێز! من تەنها ژیانی منداڵیی خۆم و هاوڕێکانم لەناو دڕکەکاندا نووسییەوە و لای خەڵکی بوون بە چیرۆك. نازانم گوێی لێ بوو یان نا؟ چونکە بارانێکی سەیر لە دەرەوە دەباری و دەنگی من تەواو تێکەڵاوی بارانەکە بوو بوو . تا دوای چەند ساڵێك بە هۆی فەیس بووکەوە منی دۆزییەوە و نامەیەکی بەناوی ژنی ژێر بارانەوە نارد و داوای قبووڵکردنی وەك هاوڕێیەك لێ کردم و نووسیبووی "من، ژنی ژێر باران، ئەو کەسەی کلیلێکم بۆ هێنایەتەوە"، منیش بە سوپاسەوە داواکەیم جێ بە جێ کرد و بووین بە هاوڕێی فەیس بووك. هەندێ جار نامەیەکی هەواڵ پرسینی دەنارد، باسی ئەوەی دەکرد کە ئاگای لە چیرۆکی ئەو پیاو و ژنەیە کە پیاو دەبێتە بەرد و ژنەکەش لەشی دەبێتە پارچەیەك لە برین. ئاگای لە چیرۆکی ئەو کوڕەیە کە دێ بۆ شار، شەکر بکڕێ بۆ باوکی و ناگەڕێتەوە. "حوزنی میوانێك بە تەنیشت ژیاندا دەڕوات". ئاخ ! ئەوە منم بە تەنیشت ژیاندا دەڕۆم و ئەوەش حوزنی منە. ئاگای لەو چیرۆکانەیە کە دەیاننووسم و ئەویش دەیان خوێنێتەوە. منیش لای خۆمەوە هەر بەهۆی فەیس بووکەوە، ئاگاداری ئەو نامەیەی بووم کە داوای یارمەتی لە هاوڕێیانی فەیس بووك دەکرد هاوڕێکەی بۆ بدۆزنەوە. هەر ئەوەش بوو زیاتر وای لەمن کرد هەوڵ بدەم بۆ دۆزینەوەی. جگە لەوەی کەسانێکی زۆریش داوایان لێ کردم کە بەو کارە هەستم و وەك باسیشم کرد کە گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە بۆ خۆی بەجێ دێڵم، بەڵام ئێستا دەکەومە گێڕانەوەی ئەوەی لە سەرەتادا باسم کرد، کە هەفتەی پێشوو لە ژنی ژێر بارانەوە نامەیەکی زۆر سەیرم بۆ هات، چاوەڕوانم نەدەکرد.

لە نامەکەیدا کە من چەند جارێکم خوێندەوە، ژنی ژێر باران نووسیبووی: "بەڕێزم، غەریب ڕیکۆرد! من لەوە دەچێ هەواڵێکی دڵخۆشکەرم پێ بێت بۆت. هێندە دڵخۆشکەر کە من خۆم لە خۆشیدا خەوم لێ ناکەوێت، هەرچەندە ناتوانم سەد لە سەد پەیمانی هیچ شتێکت پێ بدەم، چونکە کاتێکی زیاترم دەوێ و کەمێکی تر سەفەرێکی بۆ دەکەم و ڕەنگە هەفتەیەکم پێ بچێ تا بتوانم بە روونتر بۆت بنووسم،



بەڵام کەسێکم بۆ دۆزیویتەوە کە چەند ساڵە بە دوایدا دەگەڕێیت. دەبێ بچم بە دوایدا بزانم بە ڕاست ئەوە خۆیەتی یان نا؟ بۆیە من ئێستا نامەوێ هیچ بڵێم نەوەکو خۆی دەرنەچێت. هەرچەند هەموو نیشانەکان، وێنەکان، قسەکان، هەموو چرکە ڤیدۆییەکان کە گیراون بۆ ئەوە دەچن کە ئەو بێ. من پێم نەوتوویت. بەڵام ماوەیەکی زۆرە لەم کەیسەدا ئیش دەکەم و خەڵکانێکی زۆرم ڕاسپاردووە تا بە هەمووومان بۆت بدۆزینەوە. هەست دەکەم لە زۆر ڕووەوە قەرزاری تۆم و کەسێکی لە هەموو لایەنێکەوە شایانی هەموو شتێکی جوانی. من هەفتەیەکم پێ دەچێ و کاتێ هاتمەوە بە بوون یان نەبوون نامەت بۆ دەنووسم، بەڵام تۆش بە بوون یان نەبوون شتێك هەیە دەبێت بۆمنی بکەیت". دوای خوێندنەوەی چەند جارێکی نامەکە، وەڵامم دایەوە: بەڵێ باشە خانم! بەسەر چاو، چیت دەوێ، هەر بە من بکرێت پەیمان بێت فەرمووو. بەڵام تۆ جارێ پێم بڵێ کێت بۆ دۆزیومەتەوە؟ چاوەڕێم کرد وەڵامی نەبوو، بۆ ئێوارەش، بۆ شەویش هەر وەڵامی نەبوو، جا زانیم سەفەری کردووە و هەفتەیەکی زۆر زەحمەت چاوەڕێم دەکات. هەفتەیەك بێ وەڵام دەمێنمەوە. بەڵام گەر ئەو کەسێکی وای بۆ من دۆزیبێتەوە، هەفتەیەك چییە؟ مانگ و ساڵ چین؟ هەرچەند دەمزانی لەوێ نییە و سەفەری کردووە، نامەیەکی ترم بۆ نووسی، سوپاس خانم، سەرکەوتووبی لە کارەکەتدا. هەر بیرم دەکردەوە، دەبێ کێی دۆزیبێتەوە؟ من کەسانێکی زۆرم لە ژیاندا ون کردووە و گەڕاوم و نەمدۆزیونەتەوە. نامەیەکی ترم بۆ نووسی، هەر چەند دەمزانی لەوێ نییە و وەڵامم ناداتەوە، نامەکانم لە هاوارێك دەچوون بەڕووی دیوارێکدا کە دەنگەکە هەر دەهاتەوە بۆ لای خۆم. نووسیم: خانم! تا تۆ لە سەفەرەکەت دێیتەوە، ڕەنگە لە چاوەڕوانیدا من ببم بە مۆم. گەر دوای هەفتەیەك نامەت نووسی و وەڵامم نەدایتەوە، ئەوە هی ئەوەیە بوومە بە مۆم.
دوای هەفتەیەك، دوێنێ ئێوارە نامەیەکی نارد و بە پێکەنینەوە نووسیبووی، بەڕێزم غەریب ریکۆرد، هیوادارم جارێ نەبووبی بە مۆم. من لە فەیس بووك نەبووم تا وەڵامی بدەمەوە، بۆیە ئەو ترسابوو بووبم بە مۆم، نامەیەکی تری ناردبوو و نووسیبووی، گەر ببی بە مۆم، ئەوا دەبیتە مۆمێکی زۆر گەورە و بەشی ئەم شارە دەکەی، هەر دادەگیرسێیت و دەسووتێیت و قەت تەواو نابی، دەبیتە پەیکەری مۆم. دەزانی ئەم شارە لەهەموو شتێ زیاتر پێویستی بەو جۆرە مۆمەیە. پاش ماوەیەکی تر نامەیەکی تری نووسی بوو:



بەڕێزم! دە وەڵام بدەرەوە، پێش ئەوەی ببی بە مۆم چیرۆکێك بنووسە بە ناوی "ئەو کوڕەی بوو بە مۆم". دە وەڵام بدەرەوە، ئاخر ئێستا دەزانم ئەم هەفتەیە چەند خراپ ژیاویت و بۆ ئەوەش داوای لێ بووردن دەکەم. کە فەیس بووکم کردەوە و نامەکانم بینی، یەکسەر وەڵامم دایەوە. سڵاو ژنی ژێر بارانی بەرێز، نا نەبوومە بە مۆم، بەڵام تۆزێکم مابوو. ئەو نووسی، بڕوا بکە دڵم لە مەراقدا بوو، دەزانی ئینسان زۆر ناسکە، لە دوای رۆمانەکەی کافکاوە، ئینسان، ئەو بوونەوەرە نەگبەتە، ئاگامان لێ نەبێ دەبێ بە هەموو شتێك. نووسیم، وایە خانم، ڕاست دەکەیت.

بێدەنگ بووم، ئەویش بێدەنگ بوو، پێم وت، پێم بڵێ سەفەرەکەت چۆن بوو؟ گەر کەسێك هەیە و بۆ منت دۆزیوەتەوە پێم خۆشە گەر دەکرێ پێم بڵێیت، لە پاداشتی ئەوەشدا نازانم چیت دەوێ لێم، گەر شتێکت لە خەیاڵدایە، ئەوەشم بۆ بنووسە و گەر بە من بکرێت بەسەرچاو. خۆت وتەنی بە بوون یان نەبوون من تازە پەیمانم پێ داوی. نووسی، بەڕێزم غەریب ڕیکۆرد، سەفەرەکەم خراپ نەبوو، بەڵام ئەوەی من لەتۆم دەوێ، ئەوەیە کە بەیانی زوو



لەسەر سەدەکە یەکتری ببینین و پێم خۆشە سەفەرێك بکەین. بۆ کوێ خانم؟ دەمەوێ بە هەمان ئەو ڕێگایەدا بمبەیت بۆ ئەو ژوورەی بۆنی برینی لێ دەهات، دەمەوێ بە لای چایخانەکەدا تێپەڕین و سەرێکی ئەو باوکە بدەین کە کوڕەکەی لە مێژە نەبینیووە و لە ناو هەنگەکانیدا چایەکی تاڵی لابخۆینەوە. دەزانی خانم! چایخانەکە لە مێژە نەماوە، دەزانم، بەڵام باوکی ماوە؟ بەڵێ، تا مانگی پێشووش مابوو بەڵام خراپ پیر بووە. ئەح، گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە تا ئێستاش چاوەڕوانی کوڕەکەی دەکات. بەڵێ تا ئێستاش هەر من ببینێت یەکسەر باسی دەکات. نووسی: کەواتە تا بەیانی، منیش نووسیم، لەوە ناچێ ئێستا پێم بڵێیت کێت بۆ دۆزیومەتەوە. نووسی: ئێستا زۆر هیلاکم، بەیانی کە کەوتینە ڕێگا هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، لە ڕێگا هەموو شتێك دەزانی. ڕاست دەکەیت خانم هیلاکیت و بۆ ئەوەش زۆر سوپاس؛ نووسی، بەڵام دەترسم بەیانی لەسەر سەدەکە باران نەبارێت، ئەی من چی بکەم بەڕێزم غەریب ڕیکۆرد؟ چی بکەم گەر بەیانی باران نەباری و چوار ئۆتۆمبیل یەك لەدوای یەك نەیەن و چوارەمیان گەنجێك نەبێت دەستی نارەزایی بەرز بکاتەوە و بۆڵە



بۆڵ بکات و پێنجەم دانە دوای پێنج هەناسە، بێ ئەوەی دەستی لێ ڕابگرین لە بەردممانندا نەوەستێت و تا چایخانەکەی لاڕێ نەوەستینەوە. نووسیم: دەزانی ئەوەیان بەدەست من نییە، بەڵام هەر کە گەیشتینە سەر سەدەکە و باران باری، ئەوە بزانە سەفەرەکەمان دەکەین. ئەی ئەگەر باران نەباری غەریب ڕیکۆرد؟ خانمی بەڕێز! گەر ئێمە نەخشەکەمان لەگیرفاندا بێت و دونیای ئەو ونبووانەمان لەدڵدا هەڵگرتبێت، ئەوە بزانە سەدی سەد باران دەبارێت. ئەویش بە پێکەنینەوە نووسی: من تراکسووده زەردەکەم لەبەر دەکەم و لەسەر عەرزەکە، لەو تەپ و تۆزەدا لێی دادەنیشین تا باران دەبارێ. بۆم نووسی: باشە وا دەکەین. ئەویش نووسی: کەواتە تا بەیانی. ئەی ئێستا هەر پێم ناڵێیت کێت بۆ دۆزیومەتەوە؟ بەیانی بەڕێزم بەیانی. منیش نووسیم کەواتە مادەم ئێستا پێم ناڵێیت، منیش بەیانی شتێکم لەتۆ دەوێت؟ فەرموو بەسەر چاو، چیت دەوێ؟ نووسیم دەبێ بەیانی ئەوەشم بۆ باس بکەیت کە ناوەکەت، ژنی ژێر باران لە چییەوە هاتووە؟ نووسی، ئۆکەی ڕۆڵە، بڕاڤۆ، چاکی لێ دەزانی، کەواتە تا بەیانی سەعات پێنج. نووسیم زۆر باشە بەڕێزم تا بەیانی و ئێستا شەو شاد. شەوت شادتر.




# تۆپی ناو تابووتەکە

**ڕەووف بێگەرد**

من تا ئێستا نازانم خەیاڵ واقیع دروست دەکات یان پێچەوانەکەی ڕاستە. بۆ سەلماندنی هەر یەکێکیان کۆمەڵێك نووسەری بە ئەزموون و شارەزا بە دەنگ هاتوون. من لە ئەزموونی خۆمدا هەندێك لەو چیرۆکانەی نووسیومن بە پێچەوانەی ڕای خوێنەرەوە بیرم لێ کردونەتەوە. بۆ نموونە خوێنەر پێی وتووم کاراکتەری فڵانە چیرۆك خۆم و کەسە ڕاستەقینەکانی دەوروبەرمن، ڕووداوەکەیش بەسەرهاتێکی واقیعیە. کەچی لای من ئەو چیرۆکە زادەی خەیاڵیکی ڕووتی خۆم بوە. بەڵام هەر لەو چیرۆکانەدا کە کەرەسە و ڕەگەزەکانیم لەناو ژیانی ڕاستەقینەوە هێناوە و لەوەیش ترساوم بە چیرۆکنووسێکی واقیعی ناوم بەرن، لای خوێنەر بە خەیاڵی ڕووت شکاونەتەوە. لە هەردوو هەڵوێستەکەدا من کڕبووم و هیچم نەوتووە (زۆرجار ئەم بیدەنگیە لە بەرژەوەندی نووسەرە) ئەوەی من لەم لایەنەوە بڕوام پێی هەبێت لە ئەدەبدا ئەو دوو ڕەگەزە (خەیاڵ و

واقیع) تەواوکەری یەکترین. واقیعی بێ خەیاڵ لە وێنەیەکی فۆتۆگرافی ڕووت دەچێت و خەیاڵی ڕووتیش هەر بوونی نییە. وەك نووسەرێکی گەورە دەڵێت: باڵندە چەند بە ئاسمانەوە بفڕێت هەر دەبێت بۆ خواردن بێتەوە سەر زەویی. ئێستا من چیرۆکێکم هەیە خۆیشمی تووشی سەرەگێژە کردووە. ناچارم بۆ ئێوەی بگێڕمەوە بۆ ئەوەی ڕای خۆتانی لەسەر بدەن و منییش لەدواییدا ئەگەر پێویست بێت بتوانم هەڵوێستێك وەربگرم، هەر هەڵوێستێك...

من لە تەمەنی منداڵیمەوە حەزی زۆرم لە یاریی تۆپی پێ بووە. ڕەنگە کاریگەریی ئەوەم لەسەر بووبێت کە یاریگای گەورەی شار لە گەڕەکی ئێمە بووبێت و چێژی ئەم یاریەی بە زۆربەی هەرەزۆری منداڵ و قوتابی و لاوانی گەڕەك دابێت. بۆیە ئێواران، چ خودی یاریگا و چ دەوروپشتە چۆڵەکەی چەندین تیپی سەرەکی و لاکۆڵان یاریان تیا دەکردن. بۆ هەندێکمان و بەتایبەتی لە ڕۆژانی بێ بارانیدا ئەمە بەردەوام و زۆر کەم پشووی تێ دەکەوت. بۆ ئەوەیش لای دایك و باوك و خێزانەکانمان وا خۆمان دەربخەین

کە لە یاری کردن نەبووین و بۆ پیاچوونەوەی وانە چووینەتە دەرەوە و درەنگ هاتووینەتەوە، دوای تەواوکردنی یاریی بە کاووخۆ دەچووینە مزگەوتە نزیکەکەی سەر ڕێگامان. سەر و مل و قاچ و قولمان پاك دەشت. تەواو خۆمان ڕێك دەکردەوە و بە کتێبە نەکراوەکانمانەوە دەگەڕاینەوە بۆ ماڵێ. دەبێت ئەوەیش بڵێم کە تیپەکەمان تیپێکی لاکۆڵانی بێ بارەگا و تاڕادەیەك ناڕێك و پێکیش بوو.

ڕۆژێکی سەرەتای مانگی مایس کە خۆر لە ئاوابوونی دابوو. تیپەکەمان کۆتایی بە یاریی هێنا و ئامادەی گەڕانەوەی ماڵەوەبووین. بڕیاریشمان دا ڕۆژی دواتر یاریی نەکەین، چونکە ماندووین و زۆربەی هاوڕێکانیشمان تاقی کردنەوەی قوتابخانەیان هەیە.

دوا کەس من و هاوڕێیەکم بووین کە فتبۆڵەکەمان لا مایەوە و دەبوو یەکێکمان بیباتەوە بۆ ماڵەوە. بەڵام کەسمان نەماندەویست ئەرکەکە لە ئەستۆ بگرێت و لای خێزانەکەی ئاشکرابێت کە لە یاریی کردن بووە. هاوڕێکەم (دوای ئەوەی نەگەیشتینە ئەنجام) هەر لەناو مزگەوتەکەدا کەوتە گەڕان و سووسەکردن. پاشان پێشنیارێکی سەیری بە خەیاڵدا هات و وتی: تۆپەکە دەخەینە



سووچیکی ئەو تابووتەی لە پەنایەکی چەپەکی دیوارێکی مزگەوتەکەدا دانراوە و کەس نایبینێت. من زوو ڕام لەسەردا، پێکەوە چووپەکەمان فش کردەوە. توند بە چەرمەکەوە نوساندمان و لە سووچێکی تابووتەکە دامان نا.
دەبێت لێرەدا سەرنجی گریمانەیەکی زەق بدەین کە هیچ کام لە ئێمە هەستی پێ نەکرد. یان ئەگەر هەستیشی پێ کردبێت نەی درکاند. ئەوییش ئەوەبوو ئەگەر لە ماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا یەکێك مردوو تابووتەکەی بۆ بەکارهات چارەنووسی فتبۆڵەکەی ئێمە چی دەبێت؟! یان ئەگەر بەڕێکەوت یەکێك ڕێگای لەوێ کەوت و تۆپەکەی برد ئەویان چۆن؟ بەهەرحاڵ ئەم گریمانانە بۆ هەندێك چرکەساتی ژیان وەك ئەوە وایە خۆت بە ژماردنی ئەستێرەوە خەریك بکەیت یان لە مشت و مڕی ئەوەدابیت کە ئایا مریشك




لە هێلکەیە یان هێلکە لە مریشکە. ئێمە دوور لە هەر گومان و دوودڵیەك فتبۆڵە تازە و خۆشەویستەکەمان دایە دەست ڕێگای هات و نەهاتی ناو تابووتێك کە بە ڕواڵەتیا لەوە نەدەچوو چەند مانگێك بێت مردوو ڕێی تێ کەوتبێت.
عەسری دوو ڕۆژی دوای ئەوە کە من و هاوڕێکەم بەپەلە ڕۆیشتین تۆپەکە بێنین بەسەر تابووتی خاڵیدا چووین. ماوەیەك ئەملا و ئەولای بۆ گەڕاین و بێ سوود بوو. هاوڕێکەم (کە لە من زیاتر حەزی لە فتبۆڵێن و باشترییش یاریی دەکرد) بە شەرمێکەوە چوو بە لای مجەوەری مزگەوتەکەوە و وردەوردە دواندی. تا گەیشتە باسی شاردنەوەی فتبۆڵەکە. مجەورەکە بە بێزاریەکی زۆرەوە وتی بۆ ئەمە مزگەوتە یان پەنای حەشاردانی تۆپی منداڵە وردکەیە! پاشان وتی شەوی پێشوتر یەکێك مردووە و بەو تابووتە گواستویانەتەوە بۆ سەرقەبران.
ئیتر ئەو هیچی تری لێ نازانێت.
ئەو ڕۆژە هەموو یاریکەرانی هاوڕێمان بەو کۆستە دڵیان گیرا و تاوانەکەیان خستە ئەستۆی هەردووکمان. بەڵام هاوڕێکەم (من و ئەو تێکەڵیی خێزانیمان



هەبوو، تەنانەت هەندێك شەو لە ماڵی یەكتر دەنووستین) وەك ئەوەی هەست بە غەدرێكی ناڕەوا بكات یان بە ڕۆحە كون پشكنیەكەیەوە بەدوای نهێنیەكدا وێڵ بێت، بێ ئەوەی ئێمە پێی بزانین كەوتبوە پەیجور و سووسەكردنی ماڵە مردوەكەی ئەو ڕۆژە. تا دوای چەند مانگێك گەیشتبوو بەم ئەنجامە و چیرۆكەكەی بەم جۆرە بۆ گێڕاینەوە:

ئەو شەوە پیاوێك لەو نزیكانە مردوە، چەند كەسێك هاتوون بۆ تابووتەكە و تۆپەكەیان تیا بینیوە. یەكێكیان سەیری پێ هاتوە و دوای بیركردنەوە بەوانی تری وتوە ئەمە نهێنیەكی خواییە. چونكە مردوەكە كۆنە یاریكەرێكی تۆپی پێ بووە، ئێستا بوونی تۆپەكە لەو تابووتەدا ڕازێكە و نابێت هەر ئاوا ئاسان بەسەریدا تێ پەڕن. بۆیە قەناعەت بە هاوڕیكانی دەكات كە پێویستە تۆپەكە لەگەڵ مردوەكەدا بنێژرێت. بۆ ئەمەیش دەبێت بە دزیەوە ئەم نهێنیە لە مەیت شۆرەكە بگەیەنرێت. كە باسەكە بۆ مەیت شۆرەكە دەگێڕنەوە زوو بڕوایان پێ دەكات و دۆخێكی وا دەڕەخسێنێت كە لەكاتی كفن كردنیدا جگە لەوان كەسی وای لە دەور نەبێت. پاشان وەستایانە تۆپەكە بە پشتی تەرمەكەوە دەچەسپێنێت و وایش بە پشتێنەكە دەیجەڕێنێت كە لەژێر كفنەكەوە كەس هەستی پێ نەكات. بەو جۆرە تۆپەكە لەگەڵ مردوەكەدا دەخرێتە گۆڕەوە و تا ئێستایش لەگەڵیایەتی.

ئێستا من بێگومانم كە دوای زیاد لە پەنجا ساڵ. ئێسك و پروسكی ئەو مردوە لە ژێر خاكدا وردوخاش بوە. بەڵام چەرمی تۆپە تازەكەی ئێمە هێشتا بەرگەی چەند شوتێكی لوی میسی و كریستیانو ڕۆناڵدو دەگرێت. دەشێت ئەم چیرۆكە لای هەندێك خوێنەر واقیعی بێت، لای هەندێكی تر تەواو خەیاڵیی. من كارم بەسەر تێگەیشتنی ئەوانەوە نییە. چونكە بەرانبەر بە هەردوو هەڵوێستەكە من هەر بێدەنگیی هەڵدەبژێرم.

**تشرینی دووی ٢٠١٣**

# ڕۆکسالانا ئاناستاسیا لیسوفسکا

## تەوراتی ئەولیا بەختی ڕەیحانیی



**توانا ئەمین**
**ستۆکهۆڵم 2012**

**سیفری دروست بوون**

ماوەیەك بوو بیرم لە دروستکردنی حیکایەتێك دەکردەوە کە پاڵەوانەکەی بەدەست بێ قەراریی ناو بێ خەوییەکی کوشندەوە دەناڵێنێت. کاراکتەرەکەم هەرگیز دروست نەکرد، ئەو چانسەی بێتە ژیانێك لە دەرەوەی ویستی خۆی، نازانم بڵێم بەخۆشحاڵییەوە یان بەداخەوە، لێ سەندەوە. ئیدیەکەم وەك بیرۆکەی دروستکردنی ئەو بوونەوەرە وا بوو کە خودایەك، جارێك، تەنیا یەکجار بەزەینیدا دێت بیخولقێنێ و نایکات، ئاوا ڕاگوزەر و



خێرا خەیاڵەکەم؛ کە شتێك بوو وەك تەمی ناسکی جێماوی حیکایەتێکی کۆن لەسەرمدا، هات و ڕۆیشت.. دەمویست تەدارەکی کارەکە وا ڕێك بخەم، کە خوێنەرەکەی ببێت بە بەشێك لە حیکایەتەکە، لە من و کەسێکی تر؛ هەر کەسێك کە ڕۆژێك لە ڕۆژان و بەڕێکەوت لە وڵاتێکی دوور و تەریك و لە کتێبخانەیەکی چەپەکدا ئەم چیرۆکە بخوێنێتەوە و خۆی لێ ببێ بە ویژەرەکەی، بە پاژێك لەو دێڕە خواروخێچانەی لەبەردەستیدایە.. چیرۆکی ناو خەیاڵدانی بێ باکی من، تەنیا بە نووسین بە پایان نەدەگەیشت و ئەوە تەنیا نووسراوی دنیا بوو کە ئاتاجی خوێندنەوەی بە کەس نەبوو.

من مژۆڵی ناو گێرۆدەیی لۆچاولۆچی خۆم بووم و خەریك بوو لە دەرگا دارینەی قاوەخانە چکۆلانەکەی شەقامی "سۆدێرباری" دەچوومە دەرەوە، کە کچێکی ئاڵی موو کایی، بە دەنگێکی شەهوانیی، کە وات دەزانی لە دڵێکی تەنگەوە دێتە دەرێ، هاواری لێ کردم: "Ursäkta {بێ زەحمەت...!}" بروسکەیەکی گەرم بەسەرمدا هات و سارد سارد لە سەری پەنجەکانمەوە دەرچوو، کچەکە لەبەردەمم دا کتێبێکی بەرگ چەرمینی کۆنی پێیە و دەڵێت کە لەسەر مێزەکەی من جێماوە..! کتێبەکە لەو پەڕاوە کۆنانە بوو کە هێزێکی موگناتیسی گەورەیان هەیە و بەجۆرێ سەرنجی وڕ و تاساوی بونیام ڕادەکێشێت کە ناتوانی حاشا لەخاوەنداریێتی بکەی، من پاش ئەو ڕوداوانە و دوای ساڵانەی ساڵ لە دۆزینەوەی نهێنییەك، هێشتا بۆم ڕوون نییە، ئەو ئێوارەیە؛ کە ئێستا ناوی دەنێم "ئێوارەی فریو"، کتێبەکە خۆی، یان ئەوەی بەدەست کچێکی کاڵی قەشەنگەوە بووە، تەلیسم و کەمەندکێشی ناو ئەم کاغەزە زەردانەی کردووم، کە هێشتا دەرچوون لێیان وەك ئەمەلی ئاوە لە سەرابستان.

یەکەمجار کە شەیتانم لەو کافێیەدا لە ستۆکهۆڵم بینی؛ ئەو لە بەدلەیەکی کاڵی کارکردن و من لە قەرقەشەیەکی ڕۆحیی گەورەدا بووم؛ ئەو ڕۆژانە لەگەڵ ژنی هاوڕێکەمدا لە ئاریشەی لەباربردنی سکەکەیدا تێدامابووین، کە وا بەو پایزە باردە و وەك کۆرپەیەکی جێ بەخۆنەگرتوو هێکرا هێکرا لەقەی لە سکی ڕووتی دایکی دەدا و بەڕێکەوتێکی ناخۆش لە من پڕ ببوو! ئاهـ... ئێمە ئەو ڕۆژانە خەراپ گیرمان خوارد بوو.. شەیتان لەو دیدارە کتوپڕ و بێ ژووانەدا کوڕێکی چاوبادامی گەنج بوو، هەرچەند یادەوەریی

خۆمم دەگوشی بۆ ئەوەی بیناسمەوە سیمایم لەبەرچاو غەریب نەبوو؛ شێوەی لە ئەکتەرێکی فرانسی دەچوو کە ئێستا ناوەکەیم بیرچۆتەوە.. شتێك لەودا هەبوو کە هەرکەسێکمان بیدیبا، هەستمان دەکرد پێشتر لە کات و جێگایەکی تردا بەخزمەت ئەم دەموچاوە گەیشتووین. داهێزران و نیگەرانییەك لە چاویدا بوو، کە هی زۆر نووستن بوو، خۆی گوتی: "من یەکەمجار بە باری تەعالام وت ئەم هەموو نازە مەیە بە ئینسان، ئەم ماخۆلانە بچووکە ناسرەوێت، دەست بۆ هەموو دونیا دەبات؛ ئەوانەی وا هی خۆین و ئەوانەی هی ئێمەن، شتەکان وا تێکەڵ دەکات من و ڕەبلعالەمینیش سەرمان لێی دەرناچێت". ئەوەی لە شەیتاندا دەیترساندم؛ ئەو جوان قسەکردنەی بوو بە کوردی زارەوەی سۆرانی، من هەمیشە لەو کەسانە ترساوم کە بە هەموو زاراوەکانی زمانێك بە پێرفیکتی دەدوێن و ئەوەم وەك جۆرێك لە حەربایی سەیرکردووە. وەك ئەوەی زۆر لە خۆی بکات بە خاوو خلیچکییەکەوە کە دەمی بۆ لەیەك هەڵ نەدەپچڕا، وتی: "هاوڕێکانت ڕۆژانە لە تخوبی مندا ئیشەکانی خۆیان دەکەن.. ڕۆژگاری من تەواو بووە، گوزەشتم، مامۆستا بەسەرچووم... من یەك ئیشم هەیە؛ ئیتر دەبێ بنووم"!. ئەوەتا من سەرم لەم دیالێکتە تێکەڵەی سوڕماوە، بەڵام خوێنەری خۆشەویست دەبێت پێت بڵێم "نووستن" پڵۆتی ئەم چیرۆکە نییە و خەیاڵیشت ڕەحەت بێت، من و تۆ ئیتر تا کۆتایی شەیتان نابینینەوە.

**سیفری دەرچوون**

((بەناوی خوای گەورە و مەزن..

من کە بەندەیەکی بچووك و بێ نرخ ئەولیا ناوم و قەزدی سەفەر و گەڕانی دنیام هەیە بەیارمەت خوا یەکەم ڕۆژی مانگی جیمادی یەکەمی ساڵی١٠٦٥ شاری ئۆسکۆدارم بەجێهێشت و بەدوای مەلیك احمەد پاشادا رووم کردە ولایەتی وان ئەمەش بەسەرهاتی ئەو گەشتەیە: ))

٣٥٤ ساڵ لەمەوبەر، ئەولیا چەلەبی لەم بەرگەی (سیاحەتنامە)کەیدا، کە ئێستا وا لەبەردەستاندا و وەك دیاریەك لە دوژمنی خوداوە گەیشتۆتە من، لە فەسڵی (اشباح في مرآة)لە باسی حەکیمێکی سەیر دەکات کە شەوێکی سارد و تاریك لە ناوچەیەکی کوێستانی، لە دامێنی زنجیرە چیایەکی زنار و گردەڵە، لە باکوری خۆرئاوای (ورمێ)، لە ڕەشەبایەکدا چاوی پێی کەوتووە. حەکیمەکە لەگەڵ کاروانێکدا بووە کە یاقووت و یەتیمی





لاچینیان بە سەفەرێکی تولانیی و تاقەت پڕوکێندا لە "سەرنەدیبە"وە بردووە بۆ "بولغارستان". ئەولیا لە وەسفی ئەو حەکیمە غەریبەدا دەڵێ: ((لەپێشچاوم هەم ئاشنا بوو هەم ئەغیار موو کاڵێکی میانەساڵی نەحیف هەموو عەردی خوای تەقاوتەق دابوو بەحاڵی دنیا دیدە بوو بونیام سەری دەهاتە خوروو)) ئەوانەی ئەم بەشەیان لە سیاحەتنامەشدا خوێندۆتەوە و بەخزمەت چەلەبی خۆی گەیشتوون، دەڵێن؛ کتومت ئەوە وەسفی ئەولیایە بۆ خۆی..!
سەفەرنامەکەی چەلەبی کە وا بەدەستی منەوەیە و تۆش دەیبینی، نومرەی قەبووڵی لە قەرائەتخانەی تۆپقاپی لە ئیستانبوڵ وەرگرتووە، بەخەتێکی باریك بەڵام درشت نووسراوە، من لە فەرهەنگە گەورەکەی خەتدا کە "شەمسەدینی سامی" نووسیویەتی، دیتم ئەمە خەتێکی فارسی ـ عەرەبی قەدیمە و لەبەرئەوەی ئەلیفەکانی درێژ و کۆتایی پیتە خوارەکانی تەنك و تیژە بەناوی ڕوەکێکی بۆنخۆشەوە ناونراوە.. لە حاشییەدا چەلەبی نووسیویەتی: ((وەلەو ئەسرارە لاکین نەکا لە یەومی پسلانا لەبەردەم خوای خۆم رووسیاهـ بم باید حەقیقەتی پشتی سەفەرەکەم کە تەعبیرە لە کەشفی ئەعشابێکی شیفاهـ بۆ لەبارخستنی سکی "خەدیم"ی ژنە بچووکی سوڵتان سەلیم خان کە بە فیتی شەیتان لە مەلیك احمەد پاشا پر بووە بۆ پەیدۆز و خۆنەوارانی دوارۆژ سەجل بکەم)).
من دوای ماوەیەکی زۆر سۆراخ، لە قاموسی "بورهانی قاتیع"دا و بەرێکەوت لە گەڕان بەدوای واژەکانی تری خیانەتدا ئەو سەرەداوەم کەوتە دەست؛ کە ئەم کتێبە بۆ بۆنی ڕەیحانەی لێ دێت..؟

**سیفری ئەولیا**

لێرەدا و وەکو خۆی ـ تەنها ڕێنووسەکەی دەگۆڕم ـ یەکێك لە گفتوگۆ قووڵەکانی ناو کتێبەکەی بەردەستم دەنووسمەوە، کە حەکیم و چەلەبی شەوێك لە بارەی ڕۆحەوە لە گوندی "گویزەل سو"ی نزیك ورمێ، لە سەرسنوری مەملەکەتی فارسدا کردوویانە و وابزانم ئەولیا ویستویەتی لەسەر ئیزنی حەکیمە نەناسەکە، گیایەکی لەباربردن بۆ ژنی سوڵتان؛ کە بەخیانەتێکی قورس لە نزیکترین هاوڕێی خۆی پڕبووە، دەستبخات:
((جەنابی حەکیم.. کە پیاو نوتفەیەك دەخاتە لەشی ژنێکەوە وەکو ئەوە وایە تۆوێك بخاتە

ناوعەردەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ ئاوی بدات، تا ئەم تۆوە سەوز ئەبێت و پەل ئەکوتێ و دێتە دەرەوە و ئەبێت بە درەخت، بەڵام هەروەك چۆن تۆوەکە درەخت نییە، ئاوهاش نوتفە ئینسان نییە))

((درەختەکە خۆی تۆوەکەیە بەڵام لە حاڵ و بارێکی ترا، عەرزت بکەم لە هەوایەکی ترا، ئەوەی ئەسڵە تۆوەکەیە نەك دارەکە، نوتفەش هەم تۆو و هەم گەوهەری ئینسانە لە پاکترین و شیاوترین باردا))

((حەکیمی نەناسی بەختی من.. مەسەلەکە بۆ مناڵی زۆڵ فەرقی هەیە، ئەمە بۆ سەر زەمین عبوری غەزەبە. وا لەدایکبوو بە شەش پەلەوە، وا خوا ویستی ئەو دوو زیناکارە بە جەزای تولفێکی نوقسان بات، شتێك بێتە دەرەوە وەکو عیبرەت. وا ئینسانێکی جیاوازمان لە ئینجازی ئەم خیانەتە بینی))

((ئەولیا.. ئەرخەیانبە، تەبیعەت ئەوەنەی پێی کراوە لە غەدری بەشەردا درێغی نەکردووە، لە جنوبی شەرقیەوە تا شیمالی غەرب، بە فەرقێکی کەمی سوڕەت و کاوکاوێ قەوقیافەمان، هەمووومان تەشابیهین.. تۆ ئەفەرمووی ئینسانی جیاواز..! ئینسانی جیاواز کوا..؟ کەسێك لە قورتوبە و من لە خۆراسان و بەندەیەکی خوا لە چین‌وماچین وەکو یەك واین.. هەرسێکمان دوو دەست و دوو قاچ و یەك سەرمان هەیە، هەندەسەی ئەعزای بەدەنمان کتومتە.. کەی تەفاوتی مابەینی دوو بەشەر وەکو فەرقی نێوان خەرگوش و زەرافەیە..؟ لە کاری ئیلاهی سەرم ئەسوڕمێ، سەدەها چەشنی پەڕەندەی هەڵداشتۆتە ئەو عاسمانە، کەچی ئەم حەشاماتە ئەحسەن تەقویمەی خۆی کە ئیسمی لێناوە بەشەر، لەسەر ئەم عەردە خڕە، بەیەك نەوع خەلق کردووە..! لاکین دەر مەوزوع نوتفە گەوهەرە، مەعدەنێکە کە ژەنگی ژیان نەیگرتووە، ئەینا برای ئەلعان و قیامەتم، ئینسانی جیاواز کامەیە..؟))

((جەنابی حەکیم.. ئەگەر ئەو گەوهەرەی جەنابت دەفەرمووی، ڕۆژێك تەشریفی هێنایە ئەم دنیایەوە و سەیرمان کرد؛ زاڵمە، بینیمان خوێنخۆرە، تماشامان کرد؛ گورگێکە لە خۆیدا و وەحشییەکە بۆ ئەو ئەهلە، ئێمە لەم سەرەوە بۆ ئەو دڕندەیەی موستەقبەل پەت نەکەین..؟ بۆ بییەڵین بێت..؟ ئاخر پیاو برێ فامی هەبێ، ئەم ئاگرە بۆ لەماڵی خۆی بەردا..؟))

((ئەولیا بەگ.. ئەویان لە عیلمی بچووك و ناچیزی ئینساندا نییە، پیاوی ژیر ئەگەر و مەگەر ناهێنێتە جەڕ و بەحسێکەوە کە خۆی دەستی تیای نییە، لاکین...))





((حەکیم ئاغا.. هەموو شتێ بڵێ و بەس مەفەرمو ئەمە لەدەست خودایایە، ڕجا ئەکەم ئینسان لەم زووڵمە کەبیرەی کە هەروا خەریکە لە خۆی دەکات، بێ بەری مەکە..!))
((ئەفەندی.. ئەمە پێی دەڵێن ئیزهاری نەزەر! ئەولیا.. تۆ پیاوی خوای، نامومکینە زاتی ئیلاهیی لەم جەڕ و بەحسە بکەینە دەرەوە، درووستە پێشتر قەرارەکە لە دەست ئینساندایە، بەڵام کە ئابی حەیات کەفتە ڕەحمی مادەرەوە، ئیشەکە نقڵی بەردەم تەعالا ئەبێ.. خوا خۆی زاهیر و باتینە، پێی خۆش نییە ئەم بەندە بچووکە دەستبخاتە ئیشییەوە، وە ئەما بەعد با مناڵەکە تەشریف بفەرموێ؛ چوزانین نابێ بە نوور بۆ ئەهل، وا ناکات برێ ئازاری بەنی ئادەم کەمتر بێ، نابێ بە بەرەکەتێ کە پێچێك لەم حەیاتە توندەی ئینسان شل بکاتەوە.. چۆن تولفێك دەکوژیت کە عیلمت لە حانیا سفرە، ئەوە بەشەرعی خوا قەتڵی نەفسە و بەشەرعی خەڵکیش عەمدە))
((بێ قەزابی حەکیم.. ئەو تۆپەڵە خوێنەی ناو سکی لەیلەدۆنەیەکی بەکەڵی میسلی خەدیم، ئینسان نییە، عەقڵ و شعووری نییە، چۆن فڕێیان و لەکۆڵخۆکردنەوەی دەبێتە قەتڵ..؟))
((مادام واتان فەرموو، ئەبێ ڕوخسەت بفەرمووی سوئالێك لە خزمەتاندا عەرز بکەم: کە ئایا بەنی ئادەم، کەسێکە عەقڵ و شعوری هەبێ..؟ ئەی ئەوەی نەیبوو، یان ئێمە وامانزانی نییەتی، یان هێشتا پێنەگەشتبوو، لەدەرەوەی جنسی بەشەرە..؟ پیاوی خوا! کەرامەتی ئینسان ئەوکاتە درووست نابێ کە پەلەکانی درووست دەبن.. من کە ئەم دەستکردە جوانەی خوا دەبینم چاوم پڕ دەبێ لە ئاو.. من ئینسانم خۆش ئەوێ و ئیمانم پێیەتی لە عانێکدا نەخەمڵیووە و لە زەمەنێکا گەشە دەکا و لە کاتێکا تەواو دەبێ))
((جەنابی حەکیم.. بە هەوای ئەم شاخە ساردەی هەردووکمان بە ڕێبواریی ڕێمان تێیکەوتووە، منیش ئینسانم خۆش ئەوێ، هەربۆیە ئەم سەفەرە تووشەم بۆ خستۆتە بەر خۆم.. بەڵام دنیاگەڕی گەورە، نوتفە لەم مەرحەلەیەدا ئینسان نییە))
((ئەولیا.. وردە وردە بەرچاوم ڕوون دەبێتەوە کە هەرشتێ ئینسان نەبوو؛ تۆ قەتڵی بە موجاز دەزانی..!))

((.........، ....................................، ......................
))
((...................، ............؟))
((..........................!))

**سیفری ڕەش**

من کە ناچار بووم هەموو مێژووی عوسمانیەکان، لە بیرۆکە سەرەتاییەکەی خواجە ئەحمەدی یەسەویەوە و بە عوسمانی کوڕی ئورتۆغڵدا تا عەبدولمەجیدی دووەم بۆ تێگەیشتن و سەر لێ دەرکردنی ئەم نهێنییە چەندین جار بخوێنمەوە.. هەمیشە و لە چەند شوێنی جیاوازدا دەکەوتم بەسەر ئەو ڕووداوە نادیارەی کە مێژوونووسان ناویان نابوو "گرێکوێرەی ئیمپراتۆر". گرێکە گوزارشت بوو؛ لە ڕق لێ هەڵگرتنێکی ناکاوی سوڵتان سەلیمخانی کوڕی سوڵتان سولەیمانی قانوونی، لە نزیکترین برادەری خۆی بە ناوی مەلیك ئەحمەد پاشا، کە بە ڕێکەوتێکی باوەڕنەکردە لە شمشێری سووری جەلادی دیوانی "هۆمایۆن" لە ئیستانبوڵ فریادی دەبێت و سەڵتەنەت لەسەدری ئەعزەمی دەخات و دووری دەخاتەوە بۆ ویلایەتی وان.

لە گەڕانمدا لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات جارێك وەك کۆچبەرێکی تاراو و جارێك وەك چیرۆکنووسێك، توانیم بگەمە شوناسی ڕاستەقینەی خەدیمی سوڵتان؛ لە مۆزەی مێژوویی سۆفیا دا و لە دیکیۆمێنتێکی زەرد و پواودا کە باڵوێزی ڕووس لە کوشتاندینا وە ناردویەتی، نووسراوە؛ ((خەدیم لە ڕاستیدا کیژی کەشیشێکی ئارتودۆکسی ئۆکرانییە و ناوی ڕۆکسالانا ئاناستاسیا لیسوفسکایە و لەشەڕی خاچپەرستەکاندا وەك غەنیمە لە گوندێکی بچووکی سەرسنوری مۆڵداڤیا دەگیرێت و لەبەر جوانی و چاوکەژاڵییەکەی هەر زوو دەگاتە حەرمسەرای سوڵتان)) بەوەشدا ماهی دەوران؛ گوڵبەهارخانی ژنە گەورەی سوڵتان ئیرەیی پێ دەبا و لەغەمی قوورسی پایەکەی خۆی و مەترسی داگیرنەکردنی مێردەکەی، دەکەوێتە شەڕێکەوە لەگەڵیدا، کە بەسەرکەوتنی کچە کریستیانەکە و شکانی خۆی و دوورخستنەوەی بۆ شاری پورسا لەسەر دەریای ڕەش، کۆتایی پێ دێت.

**سیفری خیانەت**

شەوێك لە گفتوگۆیەکی دوو قۆڵیدا لەگەڵ گەڕێدە و تاقە مێژوونووسی ئیمپراتۆر، لە باخەکانی میرعەبداڵخاندا لە بەدلیس،





مەلیك دەفەرمووێت: ((خیانەت بۆنی هەیە و بۆنەکەی شتێکی فێنکە وەك بۆنی ڕەیحانە)) ئەولیا زۆری دەبا، تا شتێکی زیاتر لە نهێنییەکەی ئەو و ڕۆکسالانا چنگبخات.. ئەحمەد پاشا لەژێر کاریگەریی قورسی شەرابی شیری مایندا و لە وەڵامی پرسیارێکی زۆرزانانەی چەلەبیدا کە: ئایا خیانەت، بەخسوس بۆ عالی مەقامان شتێکی دروستە یان نا..؟ مەلیك هەناسەیەك هەڵدەکێشێت کە ئاهی ڕۆژگارانی زووی لێ دێتە دەرێ و وا جواب دەداتەوە کە خیانەت: ((قەرارێکی ڕاستە، ئەمما لە زەمەنێکی غەڵەتدا..)).

**سیفری ڕۆح**

ئەو کتێبەی شەیتان لەسەر مێزی کافەیەك لە شەقامی سۆدێرباری لە ستۆکهۆڵم بۆ منی جێهێشتبوو، جۆرێکە لە جادوو، جادوویەکی ڕەش.. هەموو جارێك لاپەڕەکانی دەگۆڕێن، بەوەدا ژمارەیان لەسەر نییە دۆزینەوەی چیرۆکێك تێیدا زۆر دژوارە.. چەلەبی لەم کتێبەی شەیتاندا سەعات و بەرواری ڕووداوەکانی بەشێوەیەکی تەمومژاوی و قژقژ نووسیوەتەوە، بەشێوەیەکی ئاڵۆز شەو و ڕۆژی دابەشکردووە بەسەر ١٠٠ سەعاتدا و هەر سەعاتێکی بە ١٤ دەقیقە و نزیکەی٤٠ چرکە مەزەندە کردووە. لەم کتێبەدا پاراگرافەکان جێگە دەگۆڕن و جاری وا هەیە لە ناوەڕاستی بەسەرهاتی گەشتێکدا دەوەستێ و بەدوایدا چەند لاپەڕەیەکی سپی دێت، وەك ئەوەی نووسەرەکەی بخوازێت چیرۆکەکە بە کەسێکی تر تەواو بکات..! نازانم بۆ پاش ئەو دیدارە کورت و لەپڕە؛ وا هەست دەکەم شەیتان بیەوێت بە ستراتیژی خۆیدا بچێتەوە و ئەمجارە وەك دوژمن نــا، بە ڕاستی وەکو دۆستێك هاوڕێیەتی ئینسان بکات..! ئەولیا لە زاری شەیتانەوە نووسیویەتی: ((ئایا خالیق ڕێگە دەدات بەم کاریسەیە و لە زدی خۆی لوعبەکە نیهایەت بێت و ئیتر هەمووان تەجرەبەی نەوعێکی تر لە حەیات بکەن.. حەیاتێکی موتەهەر کە نە ئەوی تێدابێت و نە من..؟)) تیۆری ژیانی خاوێن؛ ژیانێك بێ خودا و بێ شەیتان بەشێك بوو لەو کونپشکییەی من لە بیرۆکەی هەمیشەیی پشتی کتێبەکەدا هەنوکە دەیخوێنمەوە.

**سیفری خۆشاردنەوە**

من ئێستا وا خەریکە ئەم لاپەڕە پەرش و پەرۆگەندانەی لەبەردەستمدایە، بە وەستاییەکی چیرۆکنووسانەوە پێکەوە بنووسێنم و لەتەکنیکێکی کۆلاجیدا فیلێك لە ئێوە بکەم و بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن، خۆم و ژنی هاوڕێکەم؛ یانی تازە دۆستی من، بە سکێکی نۆمانگییەوە هەڵبێین لەم دونیا ڕەقەی ڕیاڵەوە بۆ بەهەشتی کاغەز، سەرزەمینێك کە چاوی کز و کەمتینی ئێوە ناتوانن بمانبینن. بە ئەمانەتیشەوە دەبێ ئەوە بیڵێم کە ئەم دەستنووسە موڵکی من و شەیتانە بەیەکەوە، ئەوا بە ئاگاداری خۆیان و لەسەر ئیزنی ئێوە، من جارێکی تر ئەم چیرۆکە دەنووسمەوە و ڕەنگە ناوی بنێم؛ تەوراتی ئەولیا بەختی ڕەیحانیی.. کتێبێك؛ کە ئێوارەیەك بە ڕێکەوت لە کافێیەکی چکۆلانەی شەقامی سۆدێرباریدا لە ستۆکهۆڵم، نیشانی شەیتانی بدەمەوە، شەیتان؛ ئەو گەنجە چاوبادامییەی لە ئەکتەرێکی فرانسی دەچێت و ئێستا ناوەکەیم بیرچۆتەوە..





# جێ پێ

**جەلال ئال ئەحمەد**

**و. لە فارسییەوە: بابەك سەحرانەوەرد / تاران**

هەوا سارد بوو و منیش لە چاوەڕوانی پاسدا لەسەر بەفری شەقامدا لەهاتووچۆدا بووم و لە ژێر باڵتاوەکەم هەڵئەلەرزیم. دوو رۆژ دەبوو بەفر دەباری و چاوانم هێندە لە بریقەی بەفر ئازاری نەدیبوو کە ئەو ڕۆژە دیبووی. چاوانم هێشتا لە بیری بریقە ناخۆشەکەی بەفری ڕووناکیی رۆژدا ئازاری ئەدی و جارجار واق دەوڕما. ئەو پۆڵەی کە تێیدا وانەم دەوتەوە سۆپای هەبوو و گەرمیش بوو. بەڵام چ قازانجێکی نەبوو. خۆ

گەرما لەگەڵمدا نەدەهات. هەمیسان شەقام و بەستەڵۆکی سەر شەقامەکان و ساردی و سەرما و چاوەڕوانیی بۆ پاس. وانەکەم هەر زوو بەئەنجام گەیاندبوو. شەکەت نەبووم، بەڵام سەرمام بوو .

هەستم بە لەرزە لەرزی ئێسقانی شانەکانم لە ژێر باڵتاوەکەمەوە دەکرد. منیش یەخەی باڵتاوەکەم تا سەرەوە هەڵدابووەوە و لە چاوەڕوانی پاسدا، لە گوێی جوگەلەی شەقامەکەدا دەهاتم و دەچووم. هێشتا بەفر هەر دەباری. بەرەبەرە دەبوو بە تەرزە. دەنکە بەفرەکان ورد و قورس بوون. منیش هەستم بە سەرما ناخۆشەکەی دەنکە بەفرەکان دەکرد کە لە درزی یەخەکەمەوە دەنیشتە سەرملم. دوو پاس هاتن و تێپەڕین و چاوی منیش لە تاریکایی شەودا شوێن دەنکە بەفرەکان دەکەوتە سەر عەرد و سەرلێشێواو بە شوێن دەنکە بەفرەکان کە هەر دەهاتوو قورس تر دەبوون و سەرمایەکی دڵتەزێنی بەشوێنەوە بوو. تایەی ئۆتۆمبیلەکان بەفری سەر شەقامەکانی ماڵیبوو، بەڵام هێشتا بەفری پێوە مابوو.

منیش هەستم بە نەرمایی بەفرەکەی ژێر قاچەکانم دەکرد کە دەپەستراییەوە و ئەم دەنگەم لە بێدەنگییە نائاساییەکەی نیوەشەو دەبیست کە بیستنی نەرم بوو. لە ژێر تیشکی گڵۆپەکانی شەقامدا کە لێڵ بوو، کڵۆبەفرەکان



لە نێوان تاریك و ڕوونی هەوادا، داوی سپییان بەدووی خۆیانەوە جێ دەهێشت. کلۆ بەفرەکان دەتگوت داوی خەیاڵی سپین و بە هیچ شوێنێکی ئاسمانەوە بەند نین و تەنیا لە تاریکایی شەو گیانی دەگرت. شەقامەکە چۆڵ و هۆڵ بوو. کەسێکی دی لەوێ وەستابوو و چاوەڕێی پاس بوو. نیگای وێڵ و سەرلێشێواوم لەگەڵ کڵۆ بەفرەکاندا بەرەو عەردەکەدا دەگەڕا.

جارێك کە لە ژێر ڕووناکییە لێڵەکەی گڵۆپەکە وەستابووم، ڕوانیمە بەفرە تازە باریوەکە. لە پڕدا نیگام لە جێگە پێیەك هەڵەنگوت! جێ پێیەکی گەورە و پان و پۆڕ و تازە بوو، هێشتا بەفر بەتەواوەتی پڕی نەکردبۆوە. لە ناکاو بیرێك یەخانگیرم بوو: "یانی دەشێت؟ دەشێت ئەمە جێ پێی من بێت؟... خۆزگە جێ پێی من بایە!...".

لەناکاو هەستم کرد چەندە پێم خۆش دەبوو ئەوە جێ پێی من بایە... دیم کە چەندە خولیام هەیە جێ پێی من لەسەر عەرز مابێتەوە. چی وای نەمابوو گرەو لەگەڵ خۆشمدا بکەم کە ئەمە جێ پێی منە، بەڵام کەسێکی دی لەوێندەر بوو، بەدەم چاوەڕوانی پاسەوە هاتوچۆی دەکرد. دیسان نیگام لە نێوان داوە سپییە




خەیاڵییەکاندا وێڵ بوو. بیرم دەکردەوە کە: "یانی دەشێت ؟... یانی جێ پێی منیش لەسەر عەرد دەمێنێتەوە؟... خۆزگە جێ پێی من بایە!".
پڕوشە بەفر بەنێو هەڵمی هەناسەمدا دەهاتە خوارێ و هێور هێور ئەو جێ پێیە کە چاوم لێ ڕوانیبوو پڕی دەکردەوە و خولیای جێ پێ دڵی هێناومە جۆش و هەوا سارد و سڕ بوو و من هێشتا لەژێر باڵتاوەکەمەوە هەڵدەلەرزیم و بەدەم چاوەڕوانی پاسەوە، بەفر و بەستەڵەکی سەر شەقامەکەم دەکوتایەوە. لە پڕ وەرچەرخام و بە جێ پێی خۆمدا هەوراز بوومەوە. نیگام لە جێ پێیانی دیکە هەڵەنگوت. جێ پێیەکان ڕوویان لە من بوو و هێشتا کڵۆبەفرە قورسەکان پڕی نەکردبوونەوە.
خولیای دڵم کەوتە جۆش و خرۆشی زۆرترەوە و نیگام بێ ئاگا لەسەر پێڵاوی کابرای پەنام گیرسایەوە کە هێشتا لەچاوەڕوانی پاسدا لەهاتوچۆدابوو. جووتێك نیو پوتی بریقەداری لەپێ کردبوو و پاژنەکەی گرنجدار بوو. جێی پوتەکەی لەسەر بەفرەکە نەخش بوو و هێشتا بەفر بەتەواوی پڕی نەکردبووەوە.
ئەم جێ پێیە کە پان و گەورە بوو، گرنج گرنج نەبوو. ساف بوو، پاژنەکەی بەرز بوو و جێگەی حەوت کونی چکۆڵە بە پاژنەکەیەوە دیاربوو. بیرمە کە ئیدی سەرمام نەبوو. دیارترین جێ پێم دایە چاو و بە ئارامی لێی چوومە پێشەوە. جێ پێی ڕاست بوو. پێی ڕاستم هەڵبڕی و لە تەنیشتییەوە دامنا و کاتێ هەستم کرد جێ پێم لەسەر بەفرەکە نەخش بووە، ئەوسا بە ئەسپایی پێم لابرد: "چەندە باشە!... یانی دەشێت ؟...بەڵام لە کوێنە!..." و ئەو کەیفە خێرایەی کەوتەوە نێو دڵ و دەروونم ئیدی گەرمی نەدەکردمەوە و شانەکانم لەژێر باڵتاوەکەمەوە دەلەرزی. هۆڕنی پاسێك وەئاگای هێنامەوە. لاکەوتم. تایەی پاسەکە ڕێك بەسەر جێ پێیەکاندا تێپەڕی و کەمێك ئەولاتر وێستا و من سەرکەوتم. هێشتا هەڵدەلەرزیم. پاسەکە چۆڵ و ساردبوو. قامکەکانی پێم لەنێو پێڵاوەکاندا ڕچی بوو. لەدرزی پەنجەرەکەوە کزەبایەکی سارد

وەژوور دەکەوت و هەر جارە کۆمەڵێك پرۆشە بەفری لەگەڵ خۆی دەهێناو ئەکەوتە بەردەمووچاوم. نیگام بڕی بووە پێشەوە و هەر کە دەگەییە جامە بەفر گرتووەکە، ئەویش لە جێگەی خۆی دەیبەست و بە جامەکەوە دەچەسپی.
کەوتمە بیرەوە: "یانی... خۆ ئەمەش لەسەر بەفر بووا جێ پێی لەسەر بەفر بوو، ها! جێ پێی سەر بەفر چ خۆشییەکم پێ دەدا؟ ها! یانی ئەمە دەکرێ؟ بەم سارد و سەرمایە! بەم پێیە لەحنەتییە ڕچیوانەوەم؟ یانی دەشێت؟ ئاخر چۆن دەبێت؟...".
نێو پاسەکە ساردبوو. جامەکان جووڵەیەکیان پێ دەکەوت و دەنگێکی قێزەوەریان لێوە دەهات. زنجیری تایەکان بەسەر بەستەڵەکی شەقامەکەدا دەکوترا و زرەیان لێوە دەهات و لەولاوە شاگردی شوفێرەکە بەدەنگی زۆر بەرزەوە قسەی دەکرد و تاو تاو سەری دەکێشایە دەرێ و بانگی دەکرد.
لەچوار ڕێیاندا دابەزیم. کتێبی بەرباخەڵم خەریك بوو دەکەوت. تەنانەت قاچیشم دەلەرزین. چی وای نەمابوو بخلیسکێم. ددانەکانم جیرکردەوە. یەخەی باڵتاوەکەم زۆرتر هەڵکێشا و کتێبەکەی بەرباخەڵم قایم کرد و خۆم گەیاندە نانای شەقامەکە کە بەفرەکەی بەستبووی و ڕەق ببوو و ئەمزانی جێ پێم لەسەری نامێنێتەوە. نانای شەقامی چوارڕێیانەکە قەرەباڵغ بوو. خەڵك هەموویان بە خێرایی دەڕۆیشتن. هەموو دەستیان خستبووە ناو گیرفانیان و هەناسەکانیان وەکو



هەناسەی ئەسپ هەڵمی لێ هەڵدەستا.
هەموو خەڵك چەتریان هەڵدابوو و سەرمایان نەبوو.
ڕووت و قووت و پێخاوس و هەژارەکان بەدەرەوە نەبوون. یاخود مردبوون و ژێر بەفر کەوتبوون، ئەمە چ خەرجێکی نەخستبووە سەر دەستی خەڵکییەوە و یا خزیبوونە نێو کۆلیت و ژێرخانەکانیانەوە کە خۆیان گەرم کەنەوە. تەنانەت سەروبیچمی ئەو کەسانەی کە بەلامدا تێدەپەڕین دەمبینی کە سوور هەڵگەڕاوە و گەرمن، وەك ئەوەی لە ژوورێکی گەرمەوە یان لە گەرماوە وەدەرکەوتوون. دەتگوت گەرماکەیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە. هەموو گەرمایان بوو. دەستکێشیان لەدەست کردبوو و شوێن پێیان بەسەر بەفری تازەباریوەوە وەدیار ئەکەوت یان بەدیار نەئەکەوت. من کارم بەمە نەبوو. بیرم لە جێ پێی خۆم دەکردەوە. بیرم لەخۆم دەکردەوە کە لەژێر جلەکانمەوە هەڵدەلەرزیم و لە هەڵمەتی سەرما رام دەکرد و بیرم لە خۆم دەکردەوە و سەرکۆنەی خۆم ئەکرد:
"دەبینی؟ دەبینی ئەی قەل پیاوا هەموو



خەڵکان بەکەیف و گەرم و گوڕن. تەمی هەناسەیان لە هەڵمی هەناسەی ئەسپ دەچێت، دەبینی؟ دەبینی چەند بەهێزەوە هەنگاو هەڵدێنن؟بەڵێ؟ ئەی تۆ چ دەڵێی؟ تۆ، تو خەریکە لە سەرما مردار دەبیتەوە. تۆ کە خەریکە گیانت دەرئەچێ و ڕەق دەبیتەوە و جێ پێکەت لە هیچ شوێنێ دیار نامێنێت، لەسەر چ شتێك نامێنێتەوە! نە لەسەر بەفر، نە لەسەر عەرز! بەڵێ شوێن پێت لەسەر بەفریش وەدیار ناکەوێت. تێدەگەی؟ تەنانەت لەسەر بەفریش!".

لەجامخانەی دووکانی رۆنفرۆشەکەی سەرچوارڕیانەکە کە لەناوەوە هەڵمی کردبوو و داوی ڕووناکتری لەزەمینە لێڵەکەی دەهاتەخوارەوە، ڕووناکییەکی لێڵ بەدی ئەکرا و لەڕووناکییەکەیدا شەقامێ کە لە نێوان پیادەڕێدا خۆی درێژ و پان کردبوو، دیاربوو. ڕەنگە جێی دوو ڕێبواری تێدا دەبووەوە.

رەچەڕێیەك کە لە ئاکامی هاتووچۆی ڕێبوارانەوە کرابووەوە. شوێن پێیان تێکەڵ و پێکەڵ بەسەر یەکتردا کەوتبوون، پاژنەیەکی ناڵچەسواو، بنی کورت و باریکی پێڵاوێکی ژنانە، جێگەی چوار قامکی ڕووتی پێیەکی خاوس، گرنجی بنی پێڵاوێکی لاستیکی گەورەی پیاوانە کە بە دڵنیاییەوە لەجێی خۆیدا بەرجەستە ببوو و تەنانەت مارکی کارخانەکەشی بەدیارکەوتبوو.

هەموو جۆر پێیەکی دی لەسەر ڕچەڕێیەکە بە پاڵ یەکەوە و بەسەر یەکدیدا نەخش ببوو و منیش کتوپڕ کەوتمە بیرێکی تازەوە: "دەبینی؟ دەبینی چ ڕوویداوە؟ شوێن پێی چ کەسێك بە تەواوی نەماوەتەوە. جێ پێی کێ بەتەواوی دیارە هەتا هی تۆ دیار بمێنێتەوە؟ جێ پێی خەڵکی پێویست ناکات بمێنێتەوە. جێ پێ بۆ کردنەوەی ڕێگاکەیە. گرینگ ئەوەیە کە ڕێگە بکرێتەوە. بەفرەکە بشکێ و ڕێگە بکرێتەوە. ئەوسا ڕێگە بکرێتەوە، ئیدی جێ پێ بەکەڵکی چی دێت؟ جێ پێی تۆش هەروایە. گریمان جێ پێی تۆیش ون ببێت، لە بری ئەوە دەبێ بە بەشێك لە ڕێگەکە. گەر ونیش بێت لە نێو ڕێگەکەدا ون دەبێ. لە نێو ڕێگەیەکدا کە خەڵکی هاتوچۆی پێدا ئەکەن. گریمان جێ پێت ون

ببن، بەڵام شەقامەکە دەکرێتەوە ...".
ئەم بیرۆکەیە کەیفۆکەیەکی دەدامێ و خەیاڵی پتر ئاسوودە دەکردم. دەیتوانی بیرم ئاسوودە بکاتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا کە بیرم لەم کەیفۆکەیە لەبەر خۆوە ئەکرد، لە جێگەیەکی تری زەینم شتێکی دی دەگوزەرا. شوێنێکی دی کە چوزانم. ڕەنگە هەر ئەو شوێنەی زەینم بێت. ڕەنگە هەر لەوێوە ئەم بیرەم پەڕەی سەندبێت. بەڵام ئەم شتە ڕوونتر و وەئاگاتربوو و لەسەر یەك لە دەرگەی بیری دەدام: "ها؟ بەڵام ئەوە ڕێگە کراوەتەوە! بەڵێ؟ جێ پێی تۆ بزر بێت باشترە هەتا ڕێگە بکرێتەوە؟ ئەها؟ ڕێگە، ڕێگە ئەویش بۆکەسانێك دەڵێی تازە لە گەرماوە دەرکەوتوون و هەناسەیان دەڵێی هەڵمی هەناسەی ئەسپە! بۆئەم کەسانە؟ ئاخر بۆ ڕێگە بکرێتەوە؟ بۆ هەموو خەڵکان مل بە بەفرەکەوە نەنێن؟ مەگین پێڵاویان نییە؟ مەگین شەلن؟ بۆ دەبێ تەنیا جێ پێی تۆ بزر ببێت؟...".
ئیدی بە بیرۆکە دڵخۆشکەرەی خۆمەوە پێدەکەنیم. پێکەنینێکی زۆر تاڵ و قێزەوەر. بە پێکەنینێك کە نە بە روخسارمەوە دیار دەما نە دەچووە قووڵایی دڵمەوە. بە پێکەنینێك کە لەژێر دیانەکانمدا پلیشاندمەوە و ئەگەر بۆم بکرایە دەمخستە ژێر پێمەوە.



پیادەڕێکە تاریك بوو و منیش بە ڕچەڕێی نێو بەفرەکەدا ڕێم دەکردەوە. هێشتا لە ژێر باڵتاوەکەمدا هەڵدەلەرزیم و خۆم سەرکۆنە دەکرد و قەشمەریم بە کەیفە کەرانەکەی خۆم دەکرد.
ئەو کاتەی چوومە کۆڵانەکەوە کە لەژێر گڵۆپەکان شەوقدارتربوون، سەیرم کرد کڵۆ بەفرەکان درشت تر و فشەڵ تر بوون، دەتوت تۆپەڵە لۆکەیە و بەدەمکەوانی هەلاجانەوە دێتەخوارەوە و سووك لەعەرزدا دەگێرسێتەوە. لەبن عامودی کارەباکە جەستە ڕەق بووەکەی پشیلەیەکی ڕەش کەوتبوو.
منیش دڵم خورپا: نەبا پشیلەکەی خۆم بێت ؟نەبا ؟..." و چوومە پێشێ، ویستم بەنووکی پێڵاوەکەم بیجوڵێنم. بە بەفرەکەوە قەرەسابوو و نەدەجولا. پشیلەکەی خۆمان بوو. هەر ئەو پشیلە ڕەشە تەمەڵە ڕەزا قورسەی خۆمان بوو کە هەر هێندەی لەدەس دەهات لە ڕارەوە تاریکەکدا بە بن دەس و پێیاندا هەڵێت و لە دەرگای دانەخراوی ژوورەکانەوە بە دزییەوە سەر بکێشێتە ژوورەوە. ئەو پشیلە نەوسن و مڵ و مۆکەرە بوو کە سەرەتا زۆرم جەخت کرد ببمە هاوڕێی و لە ئاکامدا هەر نەمتوانی. لەبەر ئەمە هەمیشە لەمە دەترسام






رۆژێك لە راڕەوە تاریکەکەدا وەبن دەست و پێم بکەوێت و هەناسەی لەبەر ببڕم. دڵم گیرا. خەمێکی نادیار دڵی فرە گوشیم و دەمویست هەموو گرێ کوێرەکانی دڵم بەسەر ئەم تاوانبارەدا هەڵڕێژم: "کە ئاخر بۆ چوویتە دەرێ؟ ئاخر بۆ؟ ئەویش بەم تۆف و سەهۆڵبەندانە. بەم بەفرە کە خەڵك خەریکە ڕەق دەبنەوە. ئاخر بۆ چوویتە دەرێ؟...".

هەروا کە لە ژێر باڵتاوەکەمدا هەڵدەلەرزیم و بە پیلکانە تاریکەکاندا لە هروژمی سەرمادا سەردەکەوتم، کلیلی ژوورەکەم لە نێو دەستمدا دەتگوت پارچە سەهۆڵێکە. دڵم گیرا. خۆم سەرکۆنە دەکرد و لەوە دەترسام کە: "نەبا جێ پێکەم نەمێنێتەوە...لەسەر عەرز نەمێنێتەوە ...".

سەرچاوە:

از مجموعه داستان زن زیادی، نوشته جلال ال احمد، تهران، چاپ دوم: **1367**



# دەبێت شتێك بگێڕمەوە

باران
ستۆكهۆڵم
Januari 2014

ئای خوایە، دەبێت شتێك بگێڕمەوە، دەبێت شتێك لە باری سەرم سووك بکەم. دروست فەرمووویانە بیرکردنەوە ئازارکێشە، چجای، ئەوەی دەماخت دەکرۆژێت، باسێك و دووان نەبێت. چجای، ئەوەی دەبێتە گرێ کوێرەی دڵت، دۆست بێت و بێگانە نەبێت. ئاخر من یادەوەریم پڕە لە ڕووداو، هەناسەم بە تۆزی زەمەنێك تەنگە، تژییە لە پێلەقە و لە داو. من خەیاڵم، لەگەڵ چیرۆکگەلێکدا ڕۆیشتووە، بە دەگمەن دەگەڕێتەوە لای خۆم. کەمن، ئەو



ساتانەی قۆڵم لە
قۆڵی خۆمدایە و بە
تەنها پیاسە دەکەم، بەتەنها چا
دەخۆمەوە و بەتەنها دەنووم. من کەم جار لێرەم و
ئێستا دەژیم، هەمیشە یان لە ڕابردوودا جێماوم یان نووقمی
ئەگەرەکانی داهاتووم.

زۆرم هەیە بۆ وتن و نازانم لە کوێوە دەستپێبکەم. دەبێت شتێك بگێڕمەوە، لەبەر هیچ شتێك نا، لەبەر خۆم. تەنها بۆ ئەوەی لە ئێستادا شتێك بکەم و بۆ ئەوەی ژانەسەرم کەمتر بێت.

دەڵێم چیرۆکی پڕ کەسەری ئەو ژنە بگێڕمەوە کە لە هەرزەکاریدا، هێلکەکانی خۆی فرۆشت. ئەو ژنەی دواجار، خۆی نەیتوانی ببێتە دایك و تا دوا ساتەکانی تەمەنی، هەمیشە بە دەنگی دەرگا دادەچڵەکی و چاوەڕێی هاتنی ئەو منداڵانەی بوو کە قەت نەیبینیبوون ...

یان با چیرۆکی ساتە سەختەکانی ئەو پیاوە بگێڕمەوە کە بە هۆی دەرئەنجامی هەڵەی تاقیگەی پزیشکییەوە، دوانزە ساڵی ڕەبەق، بێ دواندن، بە ئامێرێکەوە لە "کۆما"دا ژیا و دواجار بۆیان دەرکەوت کە بە درێژایی ساڵەکان، ئەو هۆشی بە خۆی هەبووە و لە کۆمادا نەبووە، بەڵکو توانای هیچ ئاماژەدانێکی وەهای نەبووە کە بڵێت بەخەبەرم ...

نا، چیرۆکی ئەو کچە وردیلەیە دەگێڕمەوە کە شەوانە بە خەیاڵی ئەوەوە دەخەوت، هاوڕێ شیرینەکەی، بەڕاستی ببێتە خوشکی. ئەو کە حەزی دەکرد یەك خێزان بن

و خۆشەویستی پتەو و بێخەوش کۆیان بکاتەوە، هەموو ڕۆژ داوای بەستنی پەیمانی خوشکایەتی دەکرد بەڵام هاوڕێکەی تەنها لە ماڵەباجێنەدا ئەمەی لەگەڵ دەکرد، هەمیشە کە دەهاتنە سەر ڕاستی، یارییەکەی تێکدەدایەوە و دڵ و خەونە پەمەییەکانی کچە وردیلەکەی وردوخاش دەکرد ...

ئەی بۆ باسی ئەو کوڕە نەکەم کە لە بیمارستان، دراوسێ ژوورم بوو. ئەو گەنجەی دکتۆرەکان لە تیمارکردنی برینەکەی ناو مۆخی دەستەوەستان بوون و ئەوەندە داوودەرمانیان بۆ بەکارهێنابوو کە ئیدی بۆی نەبوو تەنانەت حەبێکی هێورکەرەوەش بخوات. کوڕەکە لە بەهێزی ئازارەکەی، زریکەی دەگەشتە عەرشی عەزیم، ئەو لە بێچارەییدا، چ نەبوو بیکات، ئەوەندە نەبێت کە بۆ ئەبەد لە هاواردا بوو ...

نا نا لە چیرۆکی (بۆبی) دەدوێم، ئەو سەگە بچکۆلەیەی کە بە منداڵی وەفادارترین هاوڕێم بوو. ئەو سەگەی کە بە بخۆری جوجەڵەی دراوسێکان مەحکوم کرا و وەك تۆڵەسەندنەوە لە قێزەونترین تاوانبار، شەوێك هەموو پیاوە زەبەلاحەکانی گەڕەك بە پاچ و بێڵ و تفەنگ و حەیزەرانەوە، ڕاویاننا و تا لە خوێنی خۆیدا نەیانگەوزاند، کەفوکوڵیان دانەمرکایەوە. وای لە سامناکی ئەو شەوە، وای لە دڵەکوتەی (بۆبی) بە دەم ڕاکردنەوە و وای لە قاقای ناقۆڵای گەمژەکان کە پێیانوابوو قارەمانێتییان ئەنجامداوە و بێئاگا بوون لەوەی ئەوەی دەستی کردبوو بە خواردنی جوجەڵەکان، پشیلەیەکی ڕەش بوو، نەوەك بۆبی جوان ...



ئای، ئەوە پەپوولەیەك هاتووەتە سەر پەنجەرەکەم، پەپوولەیەك دەیەوێت یادم بهێنێتەوە کە دەتوانم چیرۆکی ئەو کچە شیکپۆشە بگێڕمەوە کە بۆ ماوەیەکی کورت هاتە ژیانمەوە و بیرەوەری زۆری لەلا بەجێهێشتم. ئەو کچەی چوون ئەکتەرەکانی هۆلیود، ڕۆژێك لەبەردەم دەرگاکەی مندا، لە سەیارەیەکی بێ سەقف دابەزی و داوایکرد بۆ ماوەیەکی کاتیی کارم لەگەڵدا بکات. هەڵبەت ئەوەی دەیویست ڕوویدا بەڵام ئەوەی لەو کچەدا سەرنجی منی ڕادەکێشا، ڕووخساری قەشەنگ و ڕوواڵەتی نەبوو بەڵکو ئەندێشەی پڕ بەسەرهات و پەپوولەکانی بوو. ئا بەڵێ چیرۆکی ئەو کچە و پەپوولەکانی تەواو هەستبزوێنە و هەر دەبێت ڕۆژێك بیگێڕمەوە ...





ئێستا با بچمە سەر یەکێك لەو چیرۆکانەی کە وەکوو شتێك دڵنیام لە داهاتوودا ڕوویانداوە! ئەگەر بڵێم لەوێوە هاتوومەتەوە، ڕاست ناکەم. گەر بشڵێم هێشتا پێیان نەگەشتووم، درۆ دەکەم بەڵام من دەبینم، دەبینم منداڵێك لەسەر شۆستەیەك دەگری، باوکی لەسەر چۆك لەبەردەمیدایە و سەیارەیەك لە دوورەوە دێت ..... ئاخ، نەفرەت، نەفرەت لە بینینی من کە هەردەم دڵ دادەخورپێنێت ...

ئای خوایە چەند بیری خۆم دەکەم بەبێ هیچ پاشبینی و پێشبینی کردنێك. ئاخر من قەت نەمزانیوە ڕووناك بیربکەمەوە. قەت نەمتوانیوە یادەوەرییەکی خۆش لەگەڵ خۆمدا هەڵبگرم و جار جار داڵغەمی پێ ئاسوودە بکەم. پێموایە ئەگەر بیرکردنەوە پشتڕاستکردنەوەی بوون بێت، مەحووکەرەوەی تەنهاییشە. ئا بەڵێ، ئەوەی بیر بکاتەوە تەنها نییە. ئەمە خۆی لە خۆیدا دەستکەوتە بەڵام من لە جەنجاڵی یادەوەریم و لە دەنگەدەنگی بیرکردنەوە بە ئێشەکانم ماندووم، ماندووم و حەز دەکەم کەمێك تەنها بم. من سەرم هێندەی سەری ئەو کوڕەی بیمارستان قورسە و هەست دەکەم لە ناوەوە ئاوساوە. ڕووداو لەسەر ڕووداو ڕێم پێ دەگرێت و لە ساتێکدا لە چەندین زەمەن و شوێنی جیاوازدام. دەزانم کە ئاوها نابرێتە سەر، من دەبێت ورد ورد بچمە ناو چیرۆکێکەوە، دەبێت لە ئێستادا شتێك بگێڕمەوە ...



# دوو چیرۆك

فەرهاد موستەفا

## كیژێك لە فرمێسك

پیاوەكە مانەندی ڕۆژانی دی، سڵاوی نەكرد، گۆرەوییەكانی بۆنیان دەهات. قایشەكەی كردەوە.. لە كن كتێبخانەكەیەوە ڕاكشا. هاوسەرەكەی وەك هەمیشە بەخێرهێنانەوەی نەكرد:

ـ ئەمڕۆش دەستەكانت ناشۆیت؟.

ـ برسیمە. بەیانیش هیچم بۆ نەخورا.. پێچێكی ئازاراوی بە ڕیخۆڵەكانمدا دێت.

ژنەكە چوون شاگرد لۆقنتەیەكی تەممەڵ، كە نەخوازێت موشتەریەكان بیخەنەوە بەر كەوێڵی ئیشكردنەوە،



به بۆڵەیەکەوە وتی:
ـ مەگەر نەتتوانی پێنج خولەك تەرخان بکەیت؟.
ـ من لە خواردنی خواردن بێزارم، تۆش وانیت؟.
پیاوەکە ئەوەی وت.
ژنەکە تا ئەوکاتە وەك ڕووخساری ئەو پیاوە بە ئاوێنەیەك بچوێنێت و بە ڕوانینی ئارایشتکردنەکەی تەواو بکات، بە لاپەنجە تووتەیەوە کەمێك لەو ئارایشتەی لالێوی سڕی کە دەم ولێوی گەورەتر دەردەخست:
ـ بیرت لە شتێکیتر کردۆتەوە؟
ـ نا.. پێموانییە.. ئەسڵەن شتێکی وا شك نابەم ـــ پاڵکەوتنەکەی گۆڕی بە دانیشتن ـــ ئەمڕۆ کچێکیان هێنا، بۆنی دۆشاوی تووی لێدەهات.. نا.. لەوانەیە بۆنی کونجی سوتاوی لێهاتبێت.. بەر لەوەی پرسیاری لێبکەم.. وەك دڵۆپی فرمێسکێك دەهاتە پێشچاوم. فیلمەکەی (شارلی شاپلن)م بیرکەوتەوە. کە خەنیمەکەی وەك مریشکێکی گەورە لێیدەڕوانێت.. دەمویست ئەو چاوە بدۆزمەوە.. کە ئەو فرمێسکەی داباراندووە!.
ئەو نەیدەسەلماند فرمێسك نییە. کە پرسیارم لێکرد.. پێیوتم:
ـ قژم ڕابکێشە تا دڵنیابیت. دەقیژێنم تا گومانت نەبێت.
پەراسووەکانی وەك پەراسووی پشیلە باریك و لاواز بوو. سنگی نەبوو.. هیچ.. تەنیا فرمێسکێك بوو.. فریای ونبوون و وشکبوونەوە نەکەوتبوو.
ژنەکەی وتی:
ـ ئەی چۆن حاشای دەکرد فرمێسك نییە؟
ـ ئەوە هۆکاری پەستکردنم بوو.. بێشەرمانە دەیوت: خودا بەدەمی تۆم لەگەڵ بکات.. ئەگەر فرمێسکێك بوومایە ئەم سوکایەتییەم پێنەدەکرا.
ژنەکە وەك ئەوەی لە لێکۆڵینەوەکەدا ئامادەیی هەبێت بە تووڕەییەوە وتی:
ـ واتە ئەو لێکۆڵینەوەیەی بە سوکایەتی دەزانی؟
ـ نازانم. ئەو ڕوانینەی هەبوو. یان پێیوابووە؟. بەلای کەمەوە بەو جۆرە ڕوانینەکەی دەربڕی.

ـ نەدەبوو ئەوەی بوتبایە. یان هیچ نەبایە نەتهێشتایە ئەوەی بووتبایە. ئەوەی کە درکاندووە واتە بیری لەوە کردۆتەوە کە تۆ لێپرسراوی ئەنجامدانی ئەو سوکایەتی پێکردنەی؟، سوکایەتیش کاتێك ئەنجام دەدرێت کە کەسێك ئامادەبێت ئەو سوکایەتییە ئەنجام بدات. لێرەوە دەگەینە ئەوەی.. کە سوکایەتییەکە بەشێکە لە کردەی سوکایەتی پێکردنەکە.

ـ هەمان سەرنجم هەبوو. پێویستم بەوە نەبوو بەهانەیەك ببینم بۆ بەهەڵەداچوونی سەرنجەکانی. زیاتر خەیاڵم لەسەر ئەو دۆشاوی تووە بوو. ناوەکە لەخۆیەوە هاتە بەر زەینم. لەوانەیە دۆشاوی تووش شتێك بێت..دەرفەتێك هەیە بۆ ئەوە... .

ژنەکە.. ئیدی بە ژوورەکەدا هاتوچۆی نەدەکرد، دروست.. وەك ئەوەی لە مێژ بێت ئارایشتکردنەکەی وەلانابێت، بە بزەوە وتی:

ـ بتەوێت یان نا.. ئەو سووکایەتییە.. نەسەلمێنراوە.. مانای ئەوەش نییە کە بوونی نییە.. یان کۆتایی پێهاتووە.. ئەمەش ڕەنگە وەك ڕەوتاری ئەوفەریکە سۆزانیانە.. کە هێندەی لە خەمی بێ بنبوونیانەوە دەناڵێنن.. ئەوەندە لە زایەچوونی ژیانیان بەخەم نین!.

پیاوەکە پانتۆڵەکەی لە پێکردەوە.. پێڵاوەکانی. پێکەوە سواری ئۆتۆمبیلەکە بوونەوە:

ـ لێکۆڵینەوەکە بەردەوامە.. بەر لە دوایین فیلتەر دەبێت بیسەلمێنێت.. فرمێسك نییە..

ژنەکە شان بەشانی هاوسەرەکەی گەیشتنە بەردەمی ڕیستۆرانتە پێنج ئەستێرەییەکە، بە دەنگی بەرز وتی:

ـ بێگومان بۆی ناسەلمێت!!.

## خەونکوژ

کیژەکە بەر لە خۆکوشتنی، خەونی بینی. لە خەونەکەیدا زیپکەیەك بە لاڕوومەتیەوە بوو. چەند بەخەم بوو تا ڕووخساری ناشرین دەرنەکەوێت!.





هەوڵیدا زیپکەکە بتەقێنێت. هێشتا زەرد نەبووبوو تا کێماو و ڕەگەکەی بە گوشینی پەنجەی دەربکاتە دەرەوە. دەرزییەکی هێنا.. دەرزییەکەی لەسەر دەمی زیپکەکە دانا.. کسپەیەکی پێبەخشی، چوون ئەوەی هەرگیز لەوەوبەر تامی ئازارێکی وا بێ مروەتی نەچێشتبێت، هەوڵیدا بزریکێنێت.. بیری کەوتەوە خەونە.. خەونیش تێدەپەڕێت، تەنانەت کە بەئاگا هاتەوە دەتوانێت سوپاسی خۆی بکات کە لەبەردەم ئازارێکی ئاوادا خۆی ڕادەگرێت.
دڵۆپێك خوێن لە شوێنی زامداربوونی دەمی دەرزییەکە هاتە دەرێ.. دڵۆپێکی دیکەش.. ویستی بە چمکی ملیوانی کراسەکەی بیسڕێت. هەرواشی کرد. دڵۆپە خوێنەکە زیاتر بوو.. وەك پەنجەیەك  لە ناکاودا بقرتێت.. بازرەقەی کرد. هەترەشی چوو. بە خۆی وت: پێویستە خەبەرم بێتەوە.
ڕاچەنی. بەشێکی بالیف و بیجامەکەی خوێن بوو. پەنجەی برد بۆ خوێنەکە تەڕ بوو. چووە بەردەمی ئاوێنەکە، شوێنەواری هیچ زیپکە تەقاندنێك بە ڕوخساریەوە نەبوو. لێ.. شوێن دانانی قاچەکانی گەرم بوون.. وەك سەرتوێژێك بە بنی قاچیەوە خۆی مەڵاس دابێت، هەنگاوەکانی خزتر کرد.
بە شڵەژاوییەوە، دایکی لە ژوورەکەی ئەودیو بەئاگا هێنا. خەونەکەی بۆ گێڕایەوە، پۆشاکە خوێناوییەکەی بەری پیشاندا. دایکی وتی:
ـ ناتوانم ڕزگارت بکەم.. هەتا کەسیان پێیان نەزانیووە بڕۆ!.
کیژەکە بە شپرزەییەوە وتی:
ـ بۆ کوێ بڕۆم؟ ناتوانم ئاوا بڕۆم. چی بڵێم؟.
دایکی بە غەمگینییەوە وتی:
ـ هەر کەسێك پرسیاری لێکردیت، خەونەکەتی بۆ بگێڕەرەوە.
ـ دەتوانم خەونەکەم بۆ هەموویان بگێڕمەوە!.
کیژەکە وای وت.
دایکی بە پاڕانەوەوە، تەوێڵی کچەکەی ماچکرد:
ـ هەمان چارەنووست دەبێت. قەیناکە نەتبینم!. ئەوە گرنگە نەمریت!. بڕۆ.. تا ئەوکاتەی پێویست بە ڕۆشتن بکات، بڕۆ!.

قۆمیسەرەکە کە تەماشای تەرمی کیژەکەی دەکرد، یەقینی وابوو لە سەروەختی بە ڕێوەهاتنیان ئەو کیژە زیندوو بووبێت. بە تەواوی ژوورەکەدا سوڕایەوە، شتێکی نەبینی کە ئاماژە بدات ئەو کیژەی پێکوژرابێت.

تاکی پەنجەرەی چەپی ژوورەکە بە ئاستەمێك پێوە درابوو. پەنجەرەکەی کردەوە.. هەوایەکی تەڕ خۆی کرد بە ژووردا وەك ئەوەی پێشتر بارانێکی بە خوڕەم باریبێت.

دایکی لە وەڵامی پرسیارێکی قۆمیسەرەکەدا وتی:

ـ تەنانەت هەستمان بە زریکەیەکی نەکرد، وەك ئەوە وابوو.. لە ناو خەوندا خۆی کوشتبێت!.






# نامەیەکی مەنغانشین

**پشتیوان هەڵەبجەیی**

سڵاو دایە گەورەیت ماچ دەکەم ، ئێستا کە ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنوسم لەیەکێك لە فارغۆنەکانی شەمەندەنەفەرێك دانیشتووم و بەرەو شارۆچکەیەکی دووره دەست دەچم ، دەمەوێت خۆم لە جەنجاڵی شارەکان بشارمەوە بەڵام کیژێکی چاوشینی قژ ئاڵتونی کە دیارە ئەویش تەنهایە و بۆ هەمان ناوچە دەچێت داوای لێکردووم لەتەنیشتم دانیشتیت و بەدرێژایی ڕێگاکە تەنهایی بڕەوێنمەوە ، کیژێکی ناسك

دیارە ، ئەو نازانێ کە من بڕیارمداوە بەدرێژایی ڕێگاکە نامەیەك بۆ تۆ بنووسم ، نزیکەی نیو کاتژمێر پرسیاری ئاسایی لێکردم و من وەڵامی ئاسایم دایەوە و ئیستا خەوی لێکەوتووە و سەری لەسەر شانی چەپم داناوە و بە ئەستەم بەدێڕی خوار و خێچ هەوڵ دەدەم تا وەئاگا دێتەوە بەشێك لە نامەکە بۆ تۆ بنووسم .
دایە دەزانم ئێستا بەهۆی دووری و نادیاری منەوە ڕۆژانە خەندەیەکی دەستکرد لەسەر لێوت سەما دەکات و ئاگرێك لە قووڵایی هزرتا دەسوتێت ، دەزانم هەمیشە لە نێو خەونەکانمدا دەتبینم ، ئاگام لە خەندە دروستکراوەکانتە و دەزانم شەوانە لە قوڵایی تارکیدا بەدڵ دەگریت و گەورەیت ڕێگا نادات بە فرمێسکەکانت کەس هەراسان بکەیت ، دەزانم هەندێ شەو کە ئەوان لەگەرمەی پێکەنیندا غەرقن  تۆ بەشوێن خەڵوەتێکدا دەگەڕێی تا نمەی فرمێسکەکانتی تیا سەر بڕیت ، هەندێ شەو خوشکە بچوکەکەم هەستت پێدەکات و مودەتێ بە ئاوازی گریانەکەی تۆ  دەگری .
دایە دەشێ بتوانی بمبوری ، دەزانم نمەی گشت فرمێسکەکانت لە ئەستۆی منە و من هۆی ئەو هەموو ناڕەحەتیانەی تۆم ، بەڵام دەشێ هۆیەك هەبێت بۆ لێبوردن ، دەشێ بتوانی لەم هەموو گوناهەی من ببوریت ، ئیدی من و نیشتیمان بەیەك ناگەینەوە و من ئیدی بوومەتە کوڕی مەنفانشین و چیدی کۆڵانە قوڕاویەکانی شارەکەم نامناسنەوە ، دایە یەکێ لە پەیامەکانتم پێگەیشت چاوی فرمێسکەکانت ماچ دەکەم و دەستی مەحەبەتت دەگوشم ، ببورە ئیدی من و نیشتیمان ئاشت نابینەوە و چیدی ئێمە دوو ڕاستەهێڵی تەریبین ، ئیدی دەڕۆم بۆ دوورترین شارۆچکە و خەیاڵەکانی پێشووم دادەخەم و حیکایەتەکانی منالّی لە هزرما دەسڕمەوە و ئیدی ناونیشانی جەنجاڵیەکان لە سەرما زیندەبەچاڵ دەکەم، و ناوی شار و وڵاتەکان ئەسڕمەوە ، ئیدی من سەر بە هیچ شار و وڵات و نیشتمانێك نیم ، ئیدی نابم بە کوڕی هیچ مەملەکەتێ .
نا هەرگیز ئەوە من نەبووم جۆلانەم لە لقی دارتووەکەی مزگەوت هەڵدەخست ، من نەبووم بەردم دەگرتە چۆلەکە پاسارییەکان، من هەرگیز داوەتی پشیلەکانم نەکردووە بۆ وردە ئێسکی کەڵەشێرەکان .ئەوە من نەبووم کە کیژە چاو ڕەشە نیگا گەرمەکان سەرنجیان ڕادەکێشام و نەسیمی بەیانی شارەکەم مەستی دەکردم ، نا ئیدی ناگەڕێمەوە و بیر لە هیچ ناکەمەوە ،



بیر لە تیشکی خۆر و مانگی چواردە و گوڵزاری بەهاران ناکەمەوە .
چەشنی پیاوە خۆپەرستە شەهوەت بازەکان کە بیر لە ئەنجامی گوناهی شەوەکانیان ناکەنەوە و بۆ چێژ و لەزەتی چەند شەوێك کۆڵان و بازاڕ و باڕو مەیخانە و مزگەوتەکان پڕ دەکەن لە منداڵ ، منیش ئاوا بیر لە نیشتمان و جوانی و ناشیرینی و ئازار و شادی ناکەمەوە . ئاخر دایە چۆن دەتوانم بێمەوە کە هەنوس کۆڵانەکان بە خوێنی کچە پاکیزەکان سوورن و شەقامەکان پڕن لە جەللاد و خوێن مژ، هەنوس باخچەکان پڕن لە جێگا پێی ئەهریمەن، دەشێ نەیەمەوە تا پۆساڵ بەسەر دڵی نیشتیمانەوە سەما بکات، تا لە چوار لاوە تفەنگ ڕووی کرابێتە دڵی خاك.
تا قەلە ڕەشەکان پاسەوانی مەعبەدەکان بن و داڵەکەرخۆرە نمایشی خوایەتی بکات و پیاوە گەمژەکان خۆیان بە خودا بزانن، تا باڵی پەپولەکان بەشەمعی گڕی خاك بسوتێ و ئاوازی گمەی کۆترەکان پڕ بکرێت لە گریان .
دایە تا ئەم فارغۆنە بۆ پێشەوە بچێت و دوورم بخاتەوە لە جەنجاڵی شارە گەورەکان من زیاتر هەست بە ئاسوودەیی دەکەم، دەشێ هەست نەکەی دایە من لێرە. لەم جەنجاڵی مەنفایەدا کە خاڵییە لە مەحەبەت و لەناو ساردی سیماکانی ئێرەدا خۆمم ڕووت کردۆتەوە لە ناشرینی و ئەو سروود و گۆرانیانەی کە بۆنی باروت و جەنگیان لێدەهات ، ئەو گۆرانیانەم لەبیر خۆم بردەوە کە مرۆڤیان ئامادەی سەنگەرەکانی مردن دەکرد. لێرە خۆمم تەکاند لەگەرد و تۆز و دووکەڵی جەنگە نەحلەتیەکان و دەنگی بۆمبای جەنگەکانم لە سەرما سڕییەوە و هیچم لە خۆما نەهێشتەوە جگە لەتۆ، ئێستا تەنها تۆ من بە خاکەوە دەبەستێ، تۆ بیانوی بیرکردنەوەی منیت لە نیشتمان.
دایە دەزانم ئێستا سەرزەنشتم دەکەیت و بەکوڕە هاروهاجەکەی مناڵی لێم تێدەگەیت، دەزانم لەدڵی خۆتدا دەڵێی ئەم کوڕەم هەرگیز گەورە نابێت، ئاخر دایە کێ لەو باخچانەدا ئۆقرە دەگرێت کە خاڵییە لە مەحەبەت و سەدای کەناری و بۆنی گوڵەباخ، کێ لەو شەقامانەدا پیاسەی پێدەکرێت کە تاریکی باڵی بەسەردا کێشاوە و پڕە لە گوی شەمشەمە کوێرە.



ئاخر دایە خۆت دادوەربە ئەو شارانە لەکوێ دەتوانن من بگرنە خۆیان کە زوڵمەت تیایدا نیشتەجێیە و هەتاو بەماڵەکانی نامۆیە ،
ئیدی بڕیارم داوە دوورترین مەنفا بدۆزمەوە و کە کەمترین مەخلوقی لێ بێت و هیچ پەیوەندییەکم بە دونیاوە نەمێنێت ئیدی دەشێت ئەمە دوا پەیامی من بێت بۆ تۆ ، ئیدی بڕیارم داوە لەم جەهەنەمی مەنفایە نیشتەجێ ببم و  نەگەڕێمەوە بۆ ناو بەهەشتە سوتاوەکەی خاك، ببورە دایە کە وشەکانم کەمێك خوار و خێچن، ئەم کچە پرچ زەردە جارجارێك دەجوڵێت و کلك بۆ وشەیەك دروست دەکات ، ماوەیەکە بەرێکەوتوین و ئەڵێی لەسەر شانی دەستگیرانەکەی پشوو دەدات ، لەهەموویشی سەیر تر ئەوەیە کە ئیزنی لێنەخواستم تا سەر بخاتە سەر شانم کە خەو شلی کرد خواربوویەوە بۆ سەر شانم،
دایە بالەم کچە چاوشینە بگەڕێم، دەمەوێت دڵنیابیت کە ناگەڕێمەوە تا پیاوەکانی کوڕی تاریکی  بەخوێنی سەری فریشتەکانی ڕوناکی تینوو بن و فریشتەکانی شاری خۆر جەستەیان بخەنە بەردەم کەڵبەی گورگەکانی سەدەی تاریکی ، تا بەرائەتی دزراو نەگەڕێتەوە بۆ رۆحی پەرییە سۆزانییەکان من ناگەڕێمەوە ، گەرچی دەزانم ئیستا شەوانە پاسەوانی بەر پەنجەرەیەکی ژەنگاویت و فرمێسکەکانت تا سەرسینەت جۆگەلە دەبەستێ ، سوێند بە پیرۆزیەکانت لێرەوە هەستت پێدەکەم و گریانەکانت لە گوێما دەنگ دەداتەوە و دەزانم زۆربەی شەوەکان خەونم پێوە دەبینیت، دەزانم هەندێ بەیانی بەدەم کوڵێ مەراقەوە خەونەکانت بۆ دارتووەکەی بەرماڵ دەگێڕیتەوە. هەست دەکەم هەندێ شەو لەخەو ڕادەچڵەکێی و دەرگای حەوشە دەکەیتەوە و چاوەڕێی من دەکەیت، دایە هەندێ ڕۆژ دڵتەنگیەکی سەیر ڕووم تێدەکات و هەست دەکەم تۆ لە نیشتیمان توشی سەرئێشە بوویت، دەزانم ئەو ڕۆژانەی کە تۆ لە نیشتیمان لە فرمێسکی خۆتا غەرق دەبیت ، من لێرە غەمگینیەکی کوشندە دڵم دەگوشێت.
بەڵام دایە ئیدی نیشتیمان لە هەنگاوەکانی من ناپرسێتەوە و خاك فرمێسکەکانی ئێمەی بۆ ناسڕێت، ئیدی دەبێت خودا پەیامبەرێکی نوێ بنێرێت بۆ شارەکەی ئێمە، پێغەمبەرێك تا ئەم بتخانەیە وێران بکات و ئەم خودا خورافیانە تێك و پێك بشکێنێ، نایەمەوە تا پەیامبەرێك لە عەرشەوە دانەبەزێت و





ماسکی سیمای ئەم خودا خورافیانە لانەدات ، ماسکی سیمای خوداکانی شەقام و باڕو مەعبەد و مەیخانە و شارو دێ و وڵات لانەدات ، پەیامبەرێك لە عەرشەوە دابەزێت و خودای شارە خوێناویەکان تێك و پێك بشکێنێ ، خودای شارە گواویەکان هەلا هەلا بکات ، خودای مەعبەدە دێرینەکان وردخاش بکات ، من ناگەڕێمەوە نیشتمان تا ئەم خودا لەوەهم داتاشراوانە حوکمی نیشتمان بکەن ، تا عەبای سەرشانی ئەم خۆبەخودا زانانە فڕێنەدرێت ڕاستی و دروستی ئاشکرا نەکرێت و سیحری سیحربازەکان بەتاڵ نەکرێتەوە من ناگەڕێمەوە بۆ شارەکەم .

ئێستا ڕۆژانە لە تیڤیەکانەوە دەبینم ئابڕوی فریشتەکان لە پێکە شەرابەکاندا هەڕاج دەکرێت و لەسەر مێزەکانی قوماردا قومار بە پاکیزەیی پەریەکانی شارەوە دەکرێت و کچە کاڵفامەکان لە نێوان پیاوە گرگنەکاندا وەك دیاری بۆ یەکدی ڕەوانە دەکرێن ، دەڵێن هەنوس هۆشی پیاوەکان کەوتۆتە خواری ناوکیانەوە و کچەکانیش هەنوکە دیلی مشتێ زێڕن، دەزانم ئێستاش دوای دەیان ساڵ لە مەنفانشینی هەنوس لە مینبەری مەعبەدەکانەوە خوێنی شاعیرەکان حەڵاڵ دەکرێت و خواناسان خودایەکی گچکە بەمرۆڤایەتی دەبەخشن خودایەك کە تا خەیاڵدانی خۆیان گچکە و نەزان و گەمژە، دەزانم ئێستاش خودا بچکۆلەکانی گەڕەك خودایەکی نێری گرژ و مۆنی ڕیشن دەخەنە کونجی مەعبەدەکانەوە ، دایە دەشێ من نەگەڕێمەوە نیشتمان تا خودا نەگەڕێتەوە بۆ دڵی شار.

دایە ئاگام لێیە ئێستاش لەشارەکەی ئێمەدا جوانیەکان شورەییەو نابوتیەکان جوامێرییە، دەزانی هەنوس هیچ پیاوێك ناتوانێ ئێوارەیەك لەسەنتەری شاردا بە دیار چاوی پیاوەکانەوە بدات لە قوڵپی گریان و فرمێسك بەسیمایدا جۆگەلە ببەستێ ، دەزانی دایە ئەگەر ئێوارەیەك من لەبازاڕێکی جەنجاڵدا بگریم هەموان پێکەنینیان بە فرمێسکەکانم دێت و هاوار دەکەن و دەڵێن ئەم گریانە چەند لە گریانی ژن دەچێت، دەشێ ئیدی من نەگەڕێمەوە نیشتمان تا پیاوەکان پێکەنینیان بە گریان بێت، تا فرمێسك قاقا دروست بکات ، تا پیاوەکان نەتوانن لەزەت لە ڕشتنی فرمێسك وەرگرن و گوێ لەناڵەی دڵ ڕاگرن.
بەڵام دایە ئەگەر هەستت کرد بەیانییەك لەشەقامێکی جەنجاڵدا

پیاوێك پڕ بەدڵ ناڵاندویتی و پیاوەکانی تریش فرمێسکیان بۆ ڕشتووە ، ئەو کاتە بەنمەی فرمێسکەکانتا نامەیەکم بۆ بنێرە تا بێمەوە و لە دەروازەی شارەوە تا ماڵەوە بە دەم گریانەوە ڕابکەم.

دایە جارێ ببورە کەمێك ڕادەوەستم ئەم کچە بەفر پۆشەی کە سەری لەسەر باڵم داناوە و خەوتووە جوڵەجوڵەکەی زۆر بوو وادیارە خەبەری دەبێتەوە، ئەها نەمگوت ئەوە خەبەری بوویەوە کەمێك حەپەساوە کە لەسەر باڵی من نوستووە ، ئیستا سەری لابرد و بەشەرمەوە لێم دەڕوانیت.

.دایە ئەم کچە  هێندە سەرسام نەبوو کەمن چاوەڕێم دەکرد تەنها لەدڵەوە سوپاسی کردم و گوتی هەمیشە وام لێدێت کە سەفەرێکم لەپێش بێت ئەو شەوە خەوم لێناکەوێت، پێشتر هەمیشە لە سەر شانی دایکم خەوم لێدەکەوت، سوپاس کەتۆش ئەمرۆ بوویت بەجێگای ئارامی بۆم ، دواتر دوو چا  و دوو لەفەی هێنا پێکەوە خواردمان، پاشان هەندێك قسەمان کرد، ئەو دەیگوت بۆ چی پیاوەکانی ڕۆژهەڵات بەتایبەت عێراقیەکان زۆربەی کاتەکان غەمگینن و ناتوانن سود لەکاتە خۆشەکان وەرگرن، بۆ هەمیشە ئاسایی دەرناکەون و ئەوکاتەی کە پێویستە شادی بکەن شادی ناکەن و بە غەمگینی خۆتانەوە چواردەوریشتان غەمگین دەکەن، تەنانەت ئێمەی کچانی قژ زەرد زۆرمان حەز لێیە هاوڕێیەتیتان بکەین کەچی کاتێ لێتان نزیك دەبینەوە پەشیمان دەبینەوە چونکە ئێوە بەکەڵکی خواست و ئارەزووەکانی ئێمە نایەن ،  من بۆ وەڵامێکی گونجاو دەگەڕام و نەمدەزانی چ وەڵامێکی بدەمەوە، دواجار توانیم بڵێم ئێمە لەمەملەکەتی ئاگرەوە هاتووین و پێش ئەوەی بگەینە ئێوە بەناو سەدان جەنگ و بۆمباران و قات و قڕی و وێران کاریدا تێپەڕیووین، ئێمە کوڕانی شادی نەبوون و نین، بەڵام ئەم کچە چاو شینە دەیگوت پێویستە ڕابردوو لەبیرکەیت و بیر لە نەهامەتیەکان نەکەیتەوە و چێژ لە ژیان وەرگریت، ئەو لەپەنجەرەی فارغۆنەکەوە سروشتی نیشان دەدام ، دەستی بۆ ئەو شارانە درێژ دەکرد کە قیتارەکە جێی دەهێشتن و ئەو دێهاتانەی نیشان دەدام کە بەناویدا دەڕۆشتین، بەڵام من لەو هەموو دیمەنە چێژم نەدەبینی و هەستم بەجوانی هیچ نەدەکرد تەنانەت هەستم بەجوانی ئەو کیژەش نەدەکرد کە دەتگوت لە ئاسمانەوە هاتووە و بەتیشیرتێکی پەمەیی و تەنورەیەکی کاڵی تەنکەوە سەری لەسەر شانم داناوە و دیمەنەکانم نیشان





دەدات، دەتوانم بڵێم هەست ناکەم کە کیژێك لەتەنیشتم دانیشتووە، ئەو ڕاست دەکات دایە من ئیستاش وابەستەی غەمگینیکی سەیرم غەمگینییەك کە نیشتمان بەدیاری پێمی داوە. دایە دوای ئەوەی دونیایەك پرسیاری لە من کرد و من چەند درێکی کورتم پێ بوو دووبارە هەر وەك ئەوەی کە سەری لەسەر شانم دانابوو خەوی لێکەوتەوە ، ببورە گەر هەندێ وشەم خوار بووبێتەوە و باش لێم حاڵی نەبیت ئەم کچە زور هارو هاج دیارە لە خەویشا جوڵە جوڵ دەکات لە کچەکانی لای خۆمان ناچێت کە لەشوێنێ دانیشت ئاقڵانە جوڵە نەکەن.

هاتمەوە سەر نامەکەم و پێت دەڵێم گەر ئێوارەیەك تۆ لەناو پاسی شارێك بۆ شارۆچکەیەکدا کچێکت بینی سەری لەسەرشانی کوڕێکی نەناس داناوە و کوڕەکەش وەك ئینسان لێی دەڕوانیت و لێی دەگەڕێت بنوێت و سەرنجی لەش و لاری نادات، ئەوا هەواڵم بۆ بنێرە ڕەنگە بیر لە گەڕانەوە بکەمەوە، گەر بەیانییەك لە شەقامێکی گشتیدا کچێکت بینی بەڕوتی پیاسەی دەکرد و کەس ئاوڕی لێنەدەدایەوە و منداڵەکان بەبەرد شوێنی نەدەکەوتن و پیاوە پیرەکان تف و نەحلەتیان لێنە دەکرد، تۆ لەناو ئاپۆرەی خەڵکی جەنجاڵدا بەدوای مندا بگەڕێ، دەشێ من ئەو ساتە لە فڕۆکەخانە دابەزیبم.

دایە من ئێوارەیەك دێمەوە کە دەبیستم لەشارەکەی مندا پیاوەکان سەرنج نادەنە ڕووتی ژنەکان و گوێ لە هاواری ڕۆحی مەخلوقات دەگرن، ئەو ڕۆژە دێمەوە کە دەرگای سۆزانیخانەکان دادەخرێت و لەش فرۆش و لەش کڕ دەچنە ژوانی ئەویندارى و لە باخچەیەکدا دەست دەکەن بە گۆڕینەوەی ماچی پڕ لە مەحەبەت و کەس ئاوڕ لە درێژی ماچەکانیان ناداتەوە. ئەگەر ڕۆژێك لە مەعبەدەکانەوە بەرد بارانی تفەنگ کرا و گوڵ بە شانی سەرباز و جەنگاوەرەکاندا هەڵواسرا و فیشەکدانەکان پڕ کران لە نێرگز ، تۆ لەناو ئاپۆرەی ئەو مرۆڤانەدا چاو بۆم من بگێڕە کە چەپکێ گوڵیان بۆ یەخەی سەربازەکان ڕاگرتووە ، ئەگەر شمشێر لە ئالای وڵاتەکان دەرهێنراو گوڵ خرایە جێگاکەی و تۆپخانەکان کران بە شوێنی سەمای عاشقان تۆ لەوێ بەشوێن مندا بگەڕێ و چەپکێ

گوڵت لەبیر نەچێ. ئەگەر پۆساڵ لە پێی جەنگاوەرەکان داکەنراو کران بە ئینجانەی گوڵ من بە دوو ئینجانەی گوڵەوە دێمەوە بۆ باوەشی تۆ و دەبمەوە بە کوڕی کۆڵانەکان.
بەڵام دایە ئێستا منی بریندار بەم هەموو برینەی سەر دڵمەوە بۆ کوێ بێمەوە، بەدڵێکی هەڵاهەڵاوە بێمەوە چی پێشکەشی نیشتیمان بکەم ، دەزانم دایە دەیان ساڵی کەش بۆنی ئامێزی تۆم لێدێت و چی کچی چاوشین و قژکاڵ و لێو ئاڵی ئێرە هەیە ناتوانن وێنەکەی تۆ لە چاوما  کاڵ کەنەوە و بۆ هەمیشە پێویستم بەو خەونانە هەیە کە لەسەر ڕانی تۆ دەمبینی ، بەڵام دایە چی بکەم ئیدی ئەندێشەکانی من بەکەڵکی نیشتمان نایەت و خاك نامناسێتەوە و نامۆم بە کوچە و شەقام و شارەکان،
ببورە دایە ئەم کچە عەجولە زۆر دەجوڵێت ئەو  وشەیەش تەواو لار بویەوە، دایە کە دەڵێم چێژ لە هیچ شتێك وەرناگرم گوناهم مەگرە و سەرزەنشتم مەکە، تۆ هەست ناکەی من کوڕێکی نیوە دزراووم ، من زەمەنێ مەحکوم کرام بە جەنگی نێو کوچەکان، نێردرامە سەنگەرێك و تفەنگێکی ژەنگاویم بەدیاری پێدراو ڕووم پێ کرایە کۆمەڵێك پیاو کە تەنها لەبەر ئەوەی کە لە عەشیرەتەکەی ئێمە نەبوون،  دەبوو من بیانکوژم، من کوڕی سەردەمی ڕژانی خوێنی ئەزیزانم، کوڕی ئەو سەردەمەم کە هەر بەردەرگایەك تەرمێکی بەردەکەوت و هەرماڵێك پرسەیەکی تێدابوو ، کوڕی ئەو ڕۆژگارەم کە زۆرجار فریای هەڵکەندنی ئەو هەموو گۆڕە نەدەکەوتین و تەرمەکانمان پێکەوە دەخستە گۆڕەوە و لە مەعبەدەکاندا پێکەوە پرسەمان بۆ دادەنان لەبیرمە زۆرجار پرسەی دەیان هاوڕێم لە یەك مزگەوتدا بەڕێدەکرا. کوڕی ئەو سەردەمەم کە تەرمەکان وەك و گۆشتی خێر بەسەر ماڵەکاندا دابەش دەکران و بکوژ و کوژراو بەیەك غەریب بوون و دڵی گەورەکانیان خوش دەکرد، ئەم کچە نازانێ من کوڕی چ سەردەمێکم و چ غەمگینیەکم هەڵگرتووە، نازانێ ئەم تەمەی سەرسیمام تەم تومانی چ سەردەمێکی خوێناوییە، دایە ئەم کچە نازانێ من کوڕی سەردەمی ئاغاکانم، کوڕی دوای جەنگی کوێخاکان، ئەو جەنگانەی کە کوێخاکان لە دیوەخانەکاندا چای ڕەشیان دەخواردەوە و ئێمە لە بەرەی جەنگەکاندا مەحکوم بووین بە یەك کوشتن، دایە سەردەمی دوای ئەوەش هەمان سەردەم بوو بۆ ئێمە ، سەردەمی جۆگەلەی خوێنی شەقامەکان و کوچە و شارەکان، سەردەمی شەڕی سەر گردۆڵگەکان، دایە



من کوڕێکی نیوە دزراووم ، کوڕی
ئەو زەمەنەی کە لە شەو ڕۆژێکدا
سێ جۆر ئاڵا لە شارەکەماندا
هەڵدەکرا و سێ جۆر دەسەڵات
باجیان لەو پیاوانە وەردەگرت کە
بەشداری جەنگیان نەکردبوو،
کە نەچووبوونە سەنگەرەکانی
کوشتنەوە، ئەو سەردەمەی کە
دەبوو دەیان جۆر پێناس لە
گیرفانماندا بوایە و ئەگەر لە
بازگەیەك بەهەڵە پێناسێکمان
نیشان بدایە ئەوا تەرمەکەمان
دەگەڕایەوە بۆ شار.
دایە ئاگام لێیە ئێستاش
خاك لە ژێرپێی مەعبەدەکان
ڕزگار نەکراوە و هەنوس لە
میحرابەکاندا خوێنی کچەکان
حەڵاڵ دەکرێت، ئێستاش
کچە مەعشوقەکان بە بلۆك
دەکوژرێن و کوڕە عاشقاکان
دەبێت ببنە مەنفا نشین و لەوێ
حیکایەتەکان بۆ وێڵگەرد و
مەستی سەر شەقام بگێڕنەوە،
دەزانم نیشتمان ئێستاش لە
جەنگی جاهیلیەتدا ئەژی و



پیاوەکان وەك تفەنگ لەسەر پێن بۆ کوشتنی
یەکدی، دایە ببینە چیم لێهاتووە ، تەماشاکە دوای
ئەم هەموو ساڵە هێشتا خوێنی جەنگاوەرەکان
لەدەستم نابێتەوە، هێشتا هاواری بریندارەکان
لەسەرما دەزرنگێتەوە و ناڵەی پێش مەرگی مرۆڤەکان
هەراسانم دەکات ، هێشتا زوڵمەتی شارەکان لەچاوما
نەکوژاوەتەوە و بۆنی سوتانی شارەکان لەسەر لەشم
لانەچووە و ناتوانم خۆم بێ بەریکەم لە نابوتیەکانی
نیشتیمان، هەست دەکەم تا دور بکەومەوە لە نیشتمان
هێزێك هەیە نزیکترم دەکاتەوە، هەست دەکەم
ئەو شەوەی کە بڕیاری سەفەرمدا، ئەو شەوەی کە
کەلوپەلی سەفەرم پێچایەوە تۆ نیشتیمانت خستە
نێو جانتاکەمەوە، ئیدی لەبەر ئەمەیە نیشتیمان لە
هەمووشوێنێ لەگەڵمدایە، هەر چەند بمەوێت بیری
لێنەکەمەوە ئەو هەر لە گەڵمایە بەهەموو جوانی و
ناشیرینیەکانیەوە، بەبۆنی کانی و باروتەکانیەوە،
بە سپێدەو شەوەکانیەوە ، بە ئاهەنگ و
جەنگەکانیەوە، ئیدی دەشێ ئەمە بێت
ڕێگام نەدات هەست بە هیچ بکەم.
دایە کەمێك لەنامەکەم دەوەستم ئەم کچە
دووبارە خەبەری بوویەوە و پرسیارێکی
تایبەتی لێکردم، گوتی هێشتا باسی
ئەوەت بۆ نەکردووم کە ئەم
سەفەرە درێژە بۆچی ئەنجام
دەدەیت دەتەوێت بۆچی

بگەیتە دورترین شارۆچکەی ئەم وڵاتە ، من هیشتا باسی ئەوەم بۆ نەکردبوو ، شەرمم دەکرد بڵێم لەگەڵ کچێك ڕێککەوتنم هەیە تا کێڵگەیەك بەڕێوەبەرین دەترسام بڵێت ئەم هەموو ڕێگایە دەگریتە بەر تا بە کچێك بگەیت، ئەوەم بۆ باس کرد ، ئەو بە زەردەخەنەیەکی نەرمەوە تەماشای کردم و گوتی ئەگەر ئاوا بیدەنگ بیت هیچ کچێك ئامادە نییە لەگەڵت بمێنێتەوە ، کچەکان پیاوێکیان دەوێت وەك تیڤی قسەکەر بێت. دایە نازانم ئەمە چ قەدەرێکە لەوەتەی هەم ڕێبوارم و ناگەمە هیچ جێگایەك، لەوەتەی هەست بە خۆم دەکەم موسافیرم و سەفەری شارەکان کۆتایی نایە، ڕێگاکان هەر وەکو خۆیانن، لەکوچەیەك بۆ کوچەیەك و لەشارێك بۆ شارێك و لەڕێگایەك بۆ ڕێگایەك، دایە هەست دەکەم چی نابووتی دونیا هەیە لە جانتاکەمدایە هەست دەکەم زوڵمەت لەناو خۆمدایە، هەست دەکەم شەمشەمەکوێرە ئاسا چاوم بە ڕوناکی هەڵنایەت.

ئەفسوس هەنوس کوڕە نیوە دزراوەکەی زەمەنی مناڵیم و هەنوس هەنگاوێکم بۆماڵی شادی نەناوە خەندەیەك لە باخچەی دڵما نەڕواوە، ئیستاش کوڕی زەمەنی گوللە بارینەکەم.

ببورە لێرە ئەوین هیچ دەردێك تیمار ناکات ، ئیدی ئەوینی تۆ بۆ کوێ بەرم، کە موسافیرێکی ڕێگا تاریکەکانم ئەو ڕێگایانەی کە مرۆڤ ناگەیەننە هیچ جێگایەك ، هەمیشە لەو سەفەرە درێژخایەنانەم کە موسافیرەکانی دەڵێی لە دۆزەخەوە گەڕاونەتەوە و بەرەو ئەو پەڕی نائومێدی هەنگاو دەنێن و پڕن لە زوڵمەت و تەنهایی.

دایە دانی پیا دەنێم کە سەفەرەکانم بۆ هەموو ناوچەکانی جیهان خاڵین لە ئاسۆ و لەهەموو ڕێگاکاندا ئومێدم بەدەم زریانەکانەوە با دەیبات ، هەرگیز لە هیچ سەفەرێکمدا پێکەنین ناگەیەنمە کەناری کامەرانی و لەناوەڕاستی دەریادا پێکەنینم لێ بەجێ دەمێنێ و بەباوەشێ ماتەمینییەوە لەنگەر دەگرم. دایە دەکرێت بگوترێت من کوڕی شارێ بووم کە زەمەنی جوانییەکان بە جێی هێشتبوو، هیچ موسافیرێکی شادی ڕوی تێنەدەکرد ، شارێ خاڵی لە پیرۆزی، کوڕی ئەو شارەبووم کە کەس تاقەتی نەبوو بیر لە جوانی بکاتەوە و هەمووان هەوڵیان دەدا جوانیەکانی لە خاچ بدەن، ئەو شارەی مناڵەکانی توتکە سەگەکانیان تیا دەکرد بەدارا و پشیلەکانیان بەرد باران دەکرد و کۆتر و چۆلەکەکانیان دەکوشت، ئەو شارەی کەس تاقەتی





نەبوو ڕێگا بدات جوانیەك بمێنێتەوە، کەس مناڵەکانی فێر نەدەکرد کە پەڕەسێلکەی سەر تەنافەکان نەکوژن و هەرشەوەی تەرمی جوانییەکمان لێ دەناشت و ناومان نابوو شاری قەدەر.

دایە ... هەر لەو شارەدا نیوەی مناڵی من کوژرا، ئەوینی تۆ نامگەڕێنێتەوە سەر ئەو کوچانەی کە نیوەی مناڵی منی تیا لەسێدارە درا و نیوەی پیاوێکی گەمژەیان پێدام ، دەریایەك ئەوین خوێنی ئەو ڕۆژە ناشواتەوە کە لە نیوەی مناڵی کوژراوی من ڕۆشت، نا دایە خۆت سەرقاڵ مەکە بە خۆش ویستی منەوە، خۆت غەمگین مەکە بۆ دوری من، دەتوانی ئەم زستانە لەبری بیرکردنەوە لە من کڵاوێکی شلیلە بۆ کچێکی بچوك بچنیت، دەتوانی گوڵێکی نازناز لە ئینجانەیەکدا گەورەکەیت، ئیدی ئومێد مەخەرە دڵتەوە سەبارەت بە من تکایە ئاگات لە دڵت بێت ، چیدی ئەوین نامگەڕێنێتەوە بۆ زەمەنی پێش بەبەرد بوونی دڵ و یاخی بونی خەیاڵ و هەڵهاتنی عەقڵ ، ئیدی دڵ بوو بەبەرد خەیاڵ بەجارێ بەستی، هەست و ڕۆح تێکشکا و ئیدی ئەوین ڕوتم ناکاتەوە لەم هەموو نەگریسیەی کە لە جانتاکەمدا هەڵمگرتووە ، ئیدی هەمووشتێك بەسەر چوو ، زەمەنی بینینی جوانی تێپەڕی و ساتی هەست کردن بەشتەکان بەسەر چوو ، چیدی منی نیوە دزراوی ئەو شارە شەکەتە، منی کۆرپەی ئامێزی پڕ لە مەئویسی تۆ منی خاڵی لە ئەوین و جوانی، منێك کە تەنانەت لە ناو تۆشدا هەستم بە مەحەبەت نەکرد و ئیدی جگە لە مشتێ خۆڵەمێشی جەنگی گەورەکان هیچی دیکە نیم و وەك پاشماوەیەکی بێکەڵکی دوای جەنگ لە سەنگەرە چۆڵکراوەکاندا بەجێماوم، هەست دەکەم هەنوس لەناوجەرگەی بۆنی باروت و تەپ و تۆز و جۆگەلەی خوێنی دوای جەنگدام و هەست دەکەم بۆ ئەبەدی جەنگ لە سەری مندا بەردەوامە.

ئاخر دایە تۆ هەست ناکەی ئەو دەمەی پیاوەکانی زەمەنی تاریکی ، زەمەنی بەرد، نەوەی جاهیلیەت و کوڕی هابیل و قابیلەکان نیوەی مناڵی منیان کوشت، من لە نیوەی یارییە تەواو نەکراوەکانی منداڵیدا بووم، لەنیوەی چاوشارکێیەکی تەواو نەکراودا بووم ، نیوەی خەندەشم لێ وون بوو، چیدی نەدەکرا بەنیوەیەکی دزراوەوە دوای نیوەی گەورەبوون بکەووم، نەدەکرا بەو هەموو برینەوە کە لە سەر دڵی مناڵیم دروستیان کردبوو، ببم

بەپیاوێکی گەورەی، وەك سوراحیەکی ووردوخاش نەدەکرا کڕنوش بۆ پەرداخ بەرمەوە.
دایە دەبێت ڕاوەستم ئەم کچەی کە سەری لەسەرشانم داناوە بەخەبەرهات و پرسیاری ئەم نوسینەی لێکردم، حەزمکرد ئەم وشانەی نیوانمان بۆتۆش بنوسمەوە، من گوتم نامەیەك بۆ دایکم دەنوسمەوە، ئەو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و دایە پرمەی گریان ، وادیاربوو دایکیم بیر خستبوویەوە پاشان گوتی من **13** ساڵە هەواڵی دایکم نازانم ، پێم سەیربوو گوتم چۆناهی، چون ئەوە دەبێت، تۆ هێشتا کچێکی ناسکی چۆن بەرگەی ئەو هەموو تەنهایی و دابڕانە دەگریت، ئەو بەشێك لە حیکایەتەکەی بۆ گێڕامەوە و دەیگوت من **15** ساڵێك بووم دایکم عاشقی پیاوێکی دی بووە و ڕۆشتووە و باوکیشم لەگەڵ کچێکی نوێ هاوسەرگیری کردووە و **11**ساڵی تەواو لەگەڵ داپیرەم ژیاووم و دواتر **5** ساڵ دوای عیشقێکی هەرزەکارانە کەوتم و چەند ساڵێکە خەریکی کاری سەربەستم. پاشان دەیگوت ئێوەی ڕۆژهەلاتی هێندەی چۆلەکەیەك ئازاد نین و تا پیر دەبن هەر پابەندی باوەشی دایکتان دەبن، دەیگوت بەو پابەند بوونە هەم خۆتان و هەم دایکتان دیل دەکەن، کە گوتم من دەمەوێت دواین نامە بۆ دایکم بنوسم ، گوتی دەشێت نەتوانی، ئێوە وەك کۆتری ماڵی وەهان ، بگەنە ئەو سەری دونیاش هەر پابەندی ماڵ دەبن ، ئێوە ناتوانن تامی ئازادی و یاخی بوون بکەن.
دایە ئەو دوای دونیایەك قسە کردن و چەند وەلامێکی کورتی من ئێستا پێکێ شەرابی هێناوە و بەدەم خواردنەوەوە لە جامی شەمەندە نەفەرەکەوە چێژ لە دیمەنەکان وەردەگرێت و منیش بیر لە قسەکانی دەکەمەوە ، ( پیاوی ڕۆژهەلاتی بۆ هێندە لە ئازادی دەترسێت ؟ ) ئەوە پرسیارێکە و وەلامەکەی من دەکوژێت ، بیر لە خۆم دەکەمەوە، بیر لەوە دەکەمەوە کە ئاخۆ بۆ دەبێت من لە ئازادی و مەنفا بترسم، من دەمگوت خانم تۆ شارەکەی من ناناسیت، تۆ سروشتی پیاوەکانی من شارەزانیت و نازانی خەڵکی شارەکەی من چۆن بیر دەکەنەوە، دەمگوت خانم تۆ هەست ناکەی من لەتەمەنێکی زۆر کەمدابووم کە نیوەی منداڵی من دزرا و نیوەی پیاوێکی شەکەتم وەرگرت، ئیدی نەبووم بە پیاوێکی تەواو، نەبوومەوە بە مناڵێکی بزێوو، دایە ئەم کچە لە شارەکەی مندا نەژیاوە و لەوشەکانی من حاڵی نابێت و نازانێت چەند



ئەستەمە بێبەش کردنی مرۆڤ
لە منداڵی و جوانیەکانی منداڵی،
هەست ناکات ئەو زەمەنەی کە
مرۆڤ زەمەنی تێڕامانیەتی لە
جوانیەکان و ئاشنابوونێتی بە
پیرۆزی چ کارەساتێکە نیوەی
منداڵی لێبدزن و بێ بەشی کەن
لە نیوەی تەمەنی، ئەم کچە
تێناگات ئەوە واتا لە بەهەشتەوە
هەڵتگرن و لە دۆزەخ داتنێن ،
واتا لەتەمەنی هەشت ساڵیدا
هەڵتگرن و لەتەمەنی چل ساڵیدا
داتنێن.

دایە ئەم خانمە نازانێ من لە
چ کلتورێکەوە هاتووم ، نازانێ
سەر بەچ دونیایەکم، دەشێ
تۆ لێم تێبگەی کە ئەو دەمەی
ئەوان نیوەی منداڵی منیان
سەربڕی زەمەنی ئاشنایەتی
من بوو لەگەڵ گوڵ، زەمەنی
تەماشاکردنی جوانیەکانم بوو،
زەمەنی تێڕامان لە ماچی پەپولە
و گوڵ، زەمەنی گوێگرتن لە
گۆرانیە حەزینەکان، زەمەنی
بینینی کچەکاڵەکان، زەمەنی
گوێگرتنم بوو لە نەغمەی چۆلەکە پاساریەکان، لە
ناڵەی دڵی بولبولە دیلەکان، ئەو دەمەی کە دەبوو
چاوەکان بە ڕەنگی گوڵەکان بشۆمەوە و گوێچکەکانم
پڕکەم لە ئاوازی نەغمەی باڵندەکان، دەبوو دەستم
ئاشنای تەنها گوڵێکی سور بێت و قاچەکانم تا ئەو
سەری چاوشارکێکە بپێوێت . دایە تۆ دەزانی من ئەو
دەمانە ئاشنای نابوتیەکان نەبوو بووم و نامۆ بووم بە
ڕەنگە هەڵوەریوەکان و دونیاکەم لێوان لێوو بوو لە جوانی
و پاکیزەیی، ئەو دەمانە هێشتا چاوەکانم پڕ نەکرابوو لە
دیمەنی جەنگەکان، ئەو دەمانە هەنوس گوێم لەسەدای
بۆمبە خاپورکەرەکان نەبوو بوو، دەمویست باڵم لێ
بڕوێت و سنوورەکان بخەمە ژێر پێم، ئەو دەمانەی
دەمویست قەشمەری بە پیرۆزیەکان بکەم، ئەو دەمەی
پێکەنینم بە خوداکان دەهات، دەمویست باوەش بە
ئاسمانەکانەکاندا بکەم و چەشنی گوڵەبەڕۆژە ڕوو
بکەمە تیشکی خۆر، کەچی ئەوان هاتن و نیوەی
منداڵییان سەربڕیم و کردمیان بە شەمشەمە
کوێرەی ڕوو بە بەرە و زوڵمەت، ئەوان هاتن
لەیەکەمین چاوسور کردنەوە و هاوار و ناڵە
و توڕەبووندا، لە یەکەمین زللە و گرژکردنی
سیمادا بەرائەتیان لە یەخەی منداڵیم کردەوە
و کردمیان بە پیاوێکی زبری گەمژە.
ببورە دایە کە دەوەستم، ئەم
خاتوونە پێکە شەرابەکەی تەواو
کرد و پەرداخەکە دەباتەوە بۆ



ساقیەکە، دایە تەماشاکە دوای ئەم هەموو ساڵە هێشتا ناوێرم لێوو بۆ جامی بادەیەك بەرم ، ناوێرم شەوێك لەماڵی ژنێکی سۆزانی ڕۆژ بکەمەوە، ناوێرم لەسەر شەقامێکی جەنجاڵ بەکچێکی لاسار بڵێم وەیش کە جوانی، ئێستاش لەسیخوڕەکانی نیشتمان دەترسم، سیخوڕی کوچە و کۆڵان و شەقام و شار و مەعبەدەکانی نیشتمان، بەڵام دایە هەست دەکەم ئەم خاتوونە کچێکی ڕاستەقینەیە و هیچ جۆرە دەمامکێکی نەبەستووە، ئەوەی کە ئارەزووی لێدەکات بێ ترس جێبەجێی دەکات ، وەك کچەکانی شارەکەی من نیە کە دژی ویستەکان خۆیان بجوڵێنەوە و گرنگی بە ئارەزووەکانی خۆیان نەدەن، ئەم کاتێ هاتە نێو شەمەندەنەفەرەکەوە پێی خۆش بوو لەتەنیشت من دانیشێت و هاوسەفەرێکی کوڕی هەبێت، دڵنیام بێ دڵی خۆی ناکات هەرکات بیەوێت جامی بادە دەنێت بەلێویەوە حەزبکات جگەرە دەکێشێت، هەست بەتەنهایی بکات کوڕێك دەدۆزێتەوە و لەگەڵی دەچێت بۆ دیسکۆ و تا هیلاك بوون لەگەڵی سەما دەکات، سەمای ڕۆح و جەستە، هەرکات بیەوێت دەچێتە سینەما دەبێتە هاوڕێی کورسیەکەی تەنیشتی، بەڵام کچی شارەکەی ئێمە تەنها کچی مەتبەخەکانن و بەدونیایەك دەمامکەوە دەردەکەون و هەمیشە ئارەزو ویستەکانیان وەلا دەنێن و وەك پیاو دەردەکەون، لەگەڵ ئەوانەشدا دونیایەك ئارەزووی شەیتانی لەناوەوەیاندا شاردراوەتەوە و شەوانە لە خەونەکنیاندا لەگەڵ دەیان پیاو ڕووت دەبنەوە.

ببورە دایە جارجار لەنامەکە لادەدەم ببورە... دێمەوە سەر نامەکە و باسی ئەوانەت بۆ دەکەم کە مناڵیی منیان دزی و هەر بەوەشەوە نەوەستان، دەستی ئەو پیاوە زبرەشیان بڕی کە خۆیان پێیان بەخشی بووم، دەستی پیاوە زبرەکەشیان بڕیم بێ ئەوەی نیازم هەبوو بێت نزیکی سێوێکی حەرامی بکەمەوە، بەر لەوەی دەسکەنەی پرچی کیژێکی کۆڵانی پێ بکەم ، بەر لەوەی لیمۆیەکی کاڵی پێ بگوشم، ئەوان قاچەکانیشیان لێکردمەوە بەر لەوەی هەنگاوێکی پێنێم بۆ ژوانێك، بۆ ماڵی ژنە سۆزانیەك ، بۆ ژوری کچێکی دراوسێ، بەر لەوەی لە چواردەیەمین بەهاری تەمەندا نیازی دزینی گوڵێکم هەبوو بێت ، دایە ئەوان زوو هاتن، زۆر زوو، بەر لەهەر شتێك کە من نیازی ئەنجامدانیم هەبووبێت، هاتن هەموو شتێکیان لێ دزیم، ڕێگا و کوچە و باخچەکانی مناڵیيان لێبردم و شەقام و کۆڵان و جەنگەڵی پیاو بونیان



خسته ژێر پێم .
دایە تۆش کچی شارەکەی منی تێدەگەیت لە منداڵیدا هەست کردن بە گەورەیی چەندە ئازار بەخشە، تۆ لێم تێدەگەیت کە ڕۆحی من بەدەست ئەو پیاوە نالەبەرەوە کەبە سەرمدا فەرز کرابوو چەندە ئازاری چەشت، ئەم کچە چاوشینە یاسای شارەکەی من ناناسێت و نازانێت ئەو دەمانەی کە منداڵێك پێویستی بەوە هەیە لەگەڵ منالانی کۆڵان شەڕە بەفر بکات ناچاری بکەن لە مەجلیسی پیاوانی گەورەدا دانیشێت و گوێ لە درۆکانی کاتی لاویەتی و قارەمانێتیەکانیان بگرێت چەند ئەستەمە. ئەم کچە تێناگات کە ئەوە ئەستەمترین شتە کە تۆ حەزت لە میزەڵدان بێت و لە مەجلیسی پیاوەکاندا تەزبیحێك بخەنە دەستەوە و ناچارت بکەن بەدرێژایی چەند کاتژمێرێك دەنکەکانی بژمێریت، نازانێ چەندە ئەستەمە ئەو دەمانەی من حەزم لە چاوشارکێ بووە و مەحکومی جەنگەکانیان کردووم، جەنگ، لە هەموو لاکانەوە، ئەم نازانێ چەندە ترسناکە منالێ لە جەرگەی یاریەکاندا دەربهێنیت و بیخەیتە نێو جەنگەکانەوە.
دایە من ئەو منداڵە بووم کە لە بەرائەتی منداڵی داماڵدرام و فڕێدرامە نێوو جەنگەکانەوە،
ئیدی فەرموودەکانی ئەوینی تۆ هیچ لە ویرانیەکانم کەم ناکاتەوە ، ئاخر چی لە بەهەشتی ڕۆحی تۆ بکەم کە جەهەنەمێك لەمندا حەشاردراوە، ئاخر بەهەشت و دۆزەخ کەی لە سینەی منالێکدا جێی دەبێتەوە، چۆن منالێك دەتوانێت جەنگی دۆزەخی و بەهەشتی لەناو خۆیدا بەرپا بکات و هەم بەهەشتی و هەم دۆزەخیش بێت.
بەڵام دایە ئەو دەمانە تۆ بەردەوام بوویت لە بەخشینی هەناسەی بەهەشتی و مەحەبەت و سۆز و ئەوین و لەعیشقا غەرقت دەکردم و بە خۆشەویستی دەتکوشتم، ئەو دەمەی کە ئیدی مەحەبەت بە کەڵکی هیچ نەدەهات تو بە ئەوینت ویرانت دەکردم و توش جارێکی تریش لەت لەتت کردمەوە، جارێکی کە ئەو لەتەی کە لەوان بەجێمابوو کردت بەدوو لەتەوە، بەشێکی دۆزەخی ئەوان و بەشێکی بەهەشتی هی تۆ، ئیدی تۆ لەو تاریکاییەی کە لە ڕۆحما بەرپا کرابوو مۆمێکی ترسناکت داگیرساند ، ئەوان وەك کراسێکی چڵکن پیاوێکی گرگنیان بۆ دوری بووم و تۆ چەشنی منالێ خۆشەویستیت دەکرد بەدڵما.



ئەوان بەتوڕەبونەکانیان ، بەزللەکانیان ، بەچاوسورکردنەوەکانیان، ئاگاداریان دەکردمەوە کە چیدی دەست بەرداری مناڵی ببم و وەك پیاو شتەکان ببینم، کەچی تۆ لەبەرامبەبەردا بەماچ و مەحەبەت و ئامێزی پڕسۆز وێرانت دەکردم، ئیدی من لە نێوان بەهەشتی تۆ و دۆزەخی ئەواندا جگە لەهەڵهاتن هیچی کەم بەدەستەوە نەما، ئیدی دەبوو هەڵێم تا هەلاهەلا نەبم، تا نەبم بە هەزار پارچەوە، ئەفسوس لە شارەکەی ئێمەدا ئەوەی سڵاوێکت لێدەکات دەیەوێت پارچەیەکت لێبکاتەوە و هیچ کەس نایەوێت تەنها خۆت بیت.

دایە دوا جار هەڵهاتم و تاهەنوکەش لەشارێ بۆ شارێك لە هەڵهاتندام و دەمەوێت بە چۆرێ ئارامی بگەم، تا هەست بەخۆ بوون بکەم، ئێستا قەلەندەرێکی هەڵهاتووم، هەڵهاتوو، لەشار و شەقام و نیشتیمان و خاك و شارەکانی دونیا، هەڵهاتن لە ئاوەدانی، لە جەهەنەم و بەهەشت، بووم بە موسافیرێکی عەوداڵی ئازادی.

دایە لەم هەموو سەفەر و عەوداڵیەمدا تێگەیشم کە دەشێ نیشتیمان تەنها درۆیەکی دەمی سیاسەت بێت، دەگونجێت مرۆڤ بێ نیشتمان و بێ سنور و بێ ئاین و بێ یاسا و داب و نەریت بێت، دەشێت مرۆڤ وەك چۆن بەڕوتی دێت تا ئەبەد بە ڕوتی بمێنێتەوە، بەڵام ئەستەمە بێ ئازادی و ئارامی بێت، دەشێ عیشق و ئازادی و ئارامی لە هەرکوێ هەبوو نیشتیمانیش لەوێ بێت .

بەڵام دایە ئەوانەی نیشتیمانیان لێ حەرام دەکرێت، ئەوانەی لە نیشتیمان دەردەکرێن ، ئەوانەی نیوەیان لێ دەدزن هەرگیز تینوێتیان لە ئەوین ناشکێ و لەهیچ نیشتیمانێك ئاسودە نابن، ئێستا ئەو شەرابەم لە هیچ مەیخانەیەك دەست ناکەوێت کە لەمنداڵیدا بەدەستمەوە ڕشتیان، ئێستا نائومێدیم لێ لێدەچۆڕێت و پڕم لەڕق و توڕەیی و بۆنی نیگا گوماناویەکانم لێدەتکێت، ئاخر دایە گوڵ تەنها لەبەهاردا دەپشکوێت، لەبەهاردا خونچەکان چرۆدەکەن، لەبەهاردا نەمامەکان چڵ و پۆ دەردەکەن، من دەیان پایز و زستانم بەسەرهات و هەڵوەریم و پەشموردە کرام، چەند ڕەهێڵە و تۆفان و لافا و شەوی ئەنگوستە چاوی دەیجور بەسەر بەهاری مندا هات.

دایە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە من لەم سەفەرەمدا ئەم نامەیە بۆ تۆ دەنوسم ئەم کچە کاڵەی تەنیشتم ئەگەر لەسەر شانم نەنوێت، لە جامی فارغۆنەکەوە لەدیمەنە جوانەکانی دەرەوە دەڕوانێت، من ئیرەیی بەم کچە دەبەم کە چۆن بەبەردەوامی



دەتوانێت چێژ لە سروشتی ئەو ناوچانە وەرگرێت کە شەمەندەنەفەرەکەمان بەناویدا تێدەپەڕێت، ئەو چێژ لەدیمەنی شارەکان و دێهاتەکان و بیابانەکان و بانەکان و شاخەکان وەردەگرێت ، کەچی هیچ شتێك لەوانە هەستی من ناجوڵێنن ، تەنانەت هەستیش ناکەم لەناو فارغۆنی شەمەندەنەفەرێکدا لە سەفرێکی درێژ دا بم.

ئەو کە هەستی کرد کەمێ دەستم لە نوسینی نامەکە هەڵگرت، تەماشایەکی نامەکەی دەستمی کرد و گوتی زۆری ماوە تەواو بێت گوتم بەنیازم ئەوەی چەند ساڵێکە لە دایکمم شاردۆتەوە لەم نامەیەدا باسی بکەم ، ئەو کەمێك وەستا و دەستیکردەوە بە قسە و گوتی ناتەوێت لەدوایین پەیامتدا شتێ بە باوکت بڵێی، گەرچی من بۆ خۆم هەستم بەباوك نەکردووە، ئەم وشەیە منی خستە خەیاڵێکی قوڵەوە. ئیدی ئاگرێکی لەدڵی مندا بەرپا کرد و سەری خستە سەر باڵم و خۆی سەرقاڵ کرد بە تەماشاکردنی دیمەنەکانی دەرەوە.

دایە لێرەدا بیرم کەوتەوە کە پێویستە بەشێك لە نامەکە تەرخان کەم بۆ بابە و سڵاوی منی لێبکە، چاوی منداڵیەکەی ڕۆحی ماچ دەکەم و دەستی نیوە دزراویەکەی منداڵی دەگوشم، سڵاوم هەیە بۆ گەنجە کوژراوەکەی ناوەوەی، تکایە دایە وەك هەمیشە ئەم وشانەی لێ مەشارەوە و لەوە مەترسە کە بابەچی دەوێت و دڵی بە چی خۆشە و بەچی دڵگران دەبێت، ئەم وشانەی لێ مەشارەوە و بیر لەوە مەکەرەوە بابە بیر لە چی دەکاتەوە و بەچی دەکەوێتە پێکەنین و بەچی دڵگران دەبێت، مەترسە لە توڕەبوونە کاتیەکانی دەزانم تۆ ڕاهاتووی هەمیشە باجی بەشێك لەهەڵەکانی من بدەیت و لەبری من لە تۆ توڕە ببێت، لەو هەڵچونە کاتیە مەترسە و ئەم وشانەی پێ بڵێ، دەمەوێت هەست بکات ئێستاش هاوارەکانی لە سەرما دەزرنگێتەوە و هەنوس گڕی وشەکانی باڵەکانم دەسوتێنێت ، پێی بڵێ هەنوس شەوانە دەنگدانەوەی وشەکانی لەخەو ڕامدەچڵەکێنێ، ئێستاش نیگام پڕە لەوێنە ترسێنەرەکانی ئەو.

تکا دەکەم دایە ئەم پەیڤانە لە بابە نەشاریتەوە، تکایە وەك هەمیشە حەقیقەتی لێمەشارەوە، مەترسە لەوەی کە نائومێدی دەکەم، لەوە مەترسە ئەگەر بکەوێتە



قوڵپی گریان، ئەم نامەیەی بۆ بخوێنەوە و لە توڕەبونی مەترسە، لەهاواری مەترسە، بەڕێزەوە لەوشەکانم ئاگاداری کەوە، مەترسە ئەگەر هەموو یاساکانی هەڵوەشایەوە و لەهەموو ڕابردووی پەشیمان بوویەوە .

دایە حەقیقەتەکان هەمیشە تاڵن، هیچ کات ڕاستی دڵخۆشکەر نیە، هەوڵ مەدە بە درۆیەکی شیرین خەندەیەکی دەستکرد بخەیتە سەر لێوی، ئاساییە با لە بری ئەو خەندەیەش وەك هەمیشە جگەرەیەکی لەسەر لێو بێت، با قاقا بە درۆ شرینەکانت پێنەکەنێت، ئاساییە ئەگەر ڕاستیە تاڵەکان بیخاتە قوڵپی گریان، با چێژ لە ئەشکی حەقیقی وەرگرێت، با لە ناو فرمێسکەکانیا ڕۆحی بشواتەوە، دەزانی هەرگیز نەمبینی فرمێسك بڕێژێت تەنانەت بۆ مەرگی ئازیزانیشی، لێی گەڕێ با لە دڵەوە بگری با حەقیقەت نم نم لە چاوەکانیەوە دابارێت، با بۆ ئەبەدی هەست بە پاك بوونەوە بکات. دایە هەوڵ مەدە بەدرۆیەکی تەڕ و خەندەیەکی کاتی و ساتێ پێکەنین وێرانی بکەی ، وایلێ مەکە بەمردنیشی هەست بە حەقیقەت نەکات، دەزانی دایە گریانی پیاو واتە تاسنوری جوانی ناسك بوونەوە، دەزانی تۆ هەمیشە لەسنوری جوانی و ناسکیدا بابەت دەکوشت و ڕێگات نەدەدا بابە شەوێك بەدەم نمەی فرمێسکەکانیەوە خەوی لێکەوێت.

دەبوو ڕێگای بدەی هەندێك شەو پڕ بە گەروو بداتە پرمەی گریان و لە گریاندا دراوسێکان لە خۆی کۆبکاتەوە، کەچی تۆ هەمیشە بە درۆ تەڕ و شیرینەکانت وەك پیاوێکی گەمژە دەتخستە قاقای پێکەنین، دواجار مەحەبەتی تۆ هەموومانی وێران کرد، منی کردە گەریدەی شارەکانی دونیا ، هەوڵبدە هیچی لێ نەشاریتەوە، ناکرێت بابە دواین کەس بێت کە ئاگاداری من بێت، دایە هەوڵ بدە ئاگاداری کەیتەوە و پێی بڵێ بەرائەتی منداڵی من بەرگەی گەرمی هەناسەکانی ئەوی نەدەگرت، ئەو ساتانەی کە ئەو منی لە نیوەی منداڵی بێبەش کرد من لەوەش بچوکتر بووم کە فاریزە بخەمە نێوان چاکە و خراپەوە، ئەو منی لە یاری منداڵی دەرهێناو یاری گەورەکانی خستە بەر پێم و نەیدەزانی گەر نیوەی منداڵیم لێ بسەنرێت نیوەی پیاو بونەکەش وون دەکەم، بابە نەیدەزانی کراسی چڵکنی پیاو بوون بۆ ئەو زەمەنەم نەدەشا و گەورە بوو بۆ بەرم.

دایە پێی بڵێ لێرە کەس سیخوڕ بۆ هەناسەکانم دانانێت، کەس گوێ لە خەونەکانم ناگرێت، کەس ڕاڤەی خەیاڵەکانم





ناکات، کەس سنور بۆ هەنگاوی منداڵیەکەی ڕۆحم دانانێت و کەس پێوەند ناکاتە قاچی نیوە پیاوەکەم، لێرە کەس  سەر لە نیوەی پیاویەکەم و نیوەی منداڵیەکەم ناشێوێنێ. ئێستا نە ئەوەیە نیوەی منداڵە بە جێماوەکەی ڕۆحم گەورە بێت، نە ئەوەتانێ ئەو نیوە پیاوەی لە بابەوە بەدیاری وەرمگرت لەناوما جێگیر ببێت، ئیدی فەناعەتم بە خۆم کردووە کە نەدەتوانم بگەڕێمە سەر تەریقەتی کۆڵانە پڕ لە پەپولەکانی منالی، ئەو کۆڵانانەی بۆنی نەعنا و ڕێحانەیان لێدەهات، نە نیوەی پیاو بوون ڕێگا بە نیوەی  منالی دەدات چێژ لە قاقایەکی گەرم وەرگرم.

دایە ئێستا جەنگێ لەناو مندا بەر پابووە، جەنگی دوو بەرە  دوو بەرەی دوو نیوە، جەنگی بەرەی نیوەی منالی و نیوەی گەورەیی، ئێستا لە سەری مندا دوو لەشکر دەستە یەخە لە جەنگدان، لەشکرێك دەیەوێت وەك منالێکی چوار ساڵە دەست بۆ هەموشتێك بەرێت و هەمووسنورەکان بشکێنێت و گرنگی بە هیچ شتێك نەدات و میز بە وێنەی پیاوە گەورەکاندا بکات و جوێن بە شواربی کوێخاکان بدات، لەشکرێك کە بە چەکی منالیەوە دەیەوێت لە مەجلیسی پیاوە گەورەکاندا بە قونی ڕوتی بێت و بچێت و قەشمەریان پێبکات، بەڵام لەشکری دووەم هەمیشە لەجەنگدایە لە گەڵ لەشکری منالیما و هەمیشە دەڵێت بە ئەدەب بە ئاگات لە دەمت بێت و قونت بشارەوە ، دەیەوێت بەویقارەوە دەرکەوم، زۆر جار قات و ڕیباتم لەبەر دەکات، دەمباتە کۆبوونەوەی جەللادەکانەوە، لەسەر مێزی گەورەکان نانم پێدەخوات، ناچارم دەکات خەتی کراسەکەم ئوتووەکەی نەشکێت، ناچارم دەکات لەناو بازار بەهێواشی هەنگاو بنێم، ناهێڵێ دەست بە عەرەبانەی مەکینەکانەوە بگرم، ڕێگانادەت دوای سەگ و پشیلە و گوێدرێژەکان بکەووم.

لەشکری منالیم پێی خۆش بوو، ئەوکاتانەی کە پیاوە مەزنەکان لەسەروی مەجلیسەکانەوە دەست دەکەن بە گێڕانەوەی پاڵەوانێتیەکانیان و باسی کوشتنی شیر و پڵنگ و ئاسك دەکەن و دەکەونە هەوای خۆیان پڕ بەدەمی جرتێك لێدات و بڵێت حەلۆش تۆ ئێستاش لە پشیلە دەترسیت، ڕاوکردنی شێری چی، بەڵام لە شکری نیوە پیاوەکەم دەبوو لەوپەڕی ئەدەبدا گوێ لەو درۆیانە بگرێت  و خەندەیەکی دەستکرد بخاتە سەر لێوی، دەبوو

جارجاریش بڵێت ڕاست دەکەیت قوربان، دەبوو زۆر بە ئەدەب بێت، دەبوو بە نەعلەوە نەیەتە کۆڵان و بە بیجامەی خەوەوە نەبینرێت، دەبوو کە دەچێتە بازار جلێکی شیاو بپۆشێت و پرچی شانە بکات، و قۆندەرەکانی بۆیاخ بن، ئەرکی نیوە پیاوەکەم گەلێك قورس بوو ، لەشکری نیوە پیاوەکەم جگە لە مناڵەکەی ناوەوەم دەورە درابوو بە هەزاران دوژمن ، بەڵام لەشکری بەرامبەری لەو پەڕی ئازادیدا ئەژیا و  هیچ دین و نیشتیمان و سنور و چوارچێوەیەکی نەدەناسی، حەزی دەکرد کاتێ مەلای مزگەوتەکەیان دەڵێت ئاگری جەهەنەم هەزار هێندەی ئاگری دونیا سوتێنەرە، بڵێت حەلۆش گەر وایە بۆچی کەسێك بە قونی سوتاوەوە ناگەڕێتەوە بۆ شار.

دایە ببینە چۆن کراووم بە دوو پارچەوە، دوو پارچەی شەڕانگێز، دوو پارچە بەردەوام لە سەری مندا خەریکی جەنگن، ئیدی نامەوێت بێمەوە بە جەنگەکانی ئەمان باخچەیەك بسوتێنم، ئای لەچی دوو ڕیانێکدا بەجێمام، کەوتمە ناو چی بەرداشێکەوە. چی جەهەنەمێ لە ڕۆحی مندا بەر پابوو، دایە دەشێ لەم جەنگەدا بەردەوام بم، دەبێت هیچ بەربەستێك نەخەمە بەردەمی ئەم دوو لەشکرەی ناو سەرمەوە، لێدەگەڕێم لەشکری مناڵی و لەشکری گەورەیی باهەر لە جەنگدا بن، من لایەنگری لە هیچ لایەك ناکەم و نابمە ناوبژیوانی هیچ بەرەیەك، پێویستە دواجار لایەنێك سەرکەوێت، ئیدی لام گرنگ نیە ببمەوە مناڵەکەی ناو چاوشارکێ و لەسەنتەری شارەکاندا میز بە ناوچەوانی ئاغاکاندا بکەم یان ببم بەو پیاوەی کە مناڵە چەقاوە سووەکان میز بە وێنەکانمدا بکەن.

دایە ئێستا ئەم کچە چاوشینە پێم دەلێت کە خۆم کۆبکەمەوە، دەڵێت چەند دەقیقەیەکی تر شەمەندە نەفەرەکە لە وێستگەکەی ڕادەوەستێت لێرەدا لە نامەکە ڕادەوەستم و هەندێك شت ماوە دواتر کە گەیشتمە ئەو جێگایەی کە بۆی هاتووم بۆتی دەنوسم،

دایە ئەم وشەیە و لەگەڵ دێڕەکانی سەرەوە شەوێك نێوانیان هەیە، دوێنێ ئێوارە کە لە شەمەندەنەفەرەکە دابەزیم شتێکی زۆر سەیر ڕویدا ئەوەتانێ بۆ تۆشی دەگێڕمەوە و دڵنیام تۆش پێت سەیر دەبێت، دوێنێ ئەو کچە چاوشینەی کە هاوسەفەرم بوو داوای لێکردم بمگەیەنێتە ئەو ناونیشانەی کە پێم بوو ، ناونیشانی "ماری دێسپلی" ئەو کچەی کە لە ڕێگای ئینتەر





نێتەوە لەگەڵی ڕێك کەوتبووم تا ببمە هاوکار و هاوڕێی، ئەو کچەی کە بڕیاربوو لە کێڵگەکەیدا هاوکاری بکەم بە مانگانە و موچەیەکی باش ، دوێنێ ئێوارە ناونیشانەکەم دا بەو کچە و ئەویش بە تاکسی منی گەیاندە نەقڵیاتی پاسی ئەو شوێنەی کە لە ناونیشانەکەدا نوسی بووم و کە "ماری دێسپلی" پێی دابووم کە لەگەڵی گرێبەستێکم هەبوو ، بەڵام سەیر بوو ئەو کچە خۆشی لەگەڵم سواری پاسەکە بوو پاسەکە نیوو کاتژمێر بەڕێگاوە بوو هێدی هێدی دونیا تایکی دەکرد و پاسەکەش گەیشتە دەشتێکی سەوزو جوان دەشتاییەك کە من هیچ زانیاریەکم لە بارەیەوە نەبوو، نزیکی پازدە خولەکی تر ئۆتۆمبیلەکە بەڕێگاوە بوو کچەکە داوای لە شۆفێرەکە کرد پاسەکە ڕاگرێت، کە پاسەکە ڕاگیرا من و ئەم کچە بەو شەوە لە دەشتێکی چۆڵ و تاریکدا پێکەوە داینەوە من سەرسام بووم بە دیمەنەکە بەڵام کچەکە زەردەخەیەك لەسەر لێوی بوو بەنازێکەوە سەیری کردم و خانوویەکی لە بەرزی گردێك نیشاندام و گوتی ئەوێ ئەو ناونیشانەیە کە تۆ بۆی هاتوویت ، دایە هەندێك بەڕێگادا ڕۆشتین و گەشتینە کێڵگەیەکی گەورە، کێڵگەی کشتوکاڵ و بەخێو کردنی بەراز، پێم سەیر بوو هیچ ئاوەدانیەك لەوێ نەبوو هیچ مرۆڤێك دیانەبوو ، ئەم کچە دەرگاکانی هەمووی کردەوە و ڕۆشتە ژورەوە و بەرامبەرم وەستاو گوتی بەخێر بێی بۆکێڵگەی ماری دێسپیلی، و لەم کاتەدا دەستی درێژ کرد و گوتی من ماری دێسپێلی زۆر خۆش حاڵم بەهاتنت بۆ کێڵگەکەم من حەپەسابووم ئەو بە خەندەوە لێمی دەڕوانی و فەرمووی ژوورەوەی لێکردم.
ئێستا هەموو گومان و دودڵیەکان ڕەویوەتەوە و داوای لێکردووم ئەگەر لەگەڵی بمێنمەوە و بە جێی نەهێڵم، پێکەوە ئەم کێڵگەیە بەڕێوە دەبەین و دەڵێت ئەگەر پێت خوش نیە بەهەمان شێوەی گرێبەستەکە کاردەکەین، ئێستاش داوای لێکردووم کە دێڕێکی ئەویش بۆ نامەکە زیاد بکەم دەڵێت بەدایکت بڵێ کە کوڕەکەی بداتە دەست من و خەمی هیچی نەبێت، دڵنیام دایە توش ئەمەت پێ سەیر بوو ، ماری دەڵێ بەتایبەت هاتم تا هاوسەفەرت بم و بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بگەیتە کێڵگەکەم.
هەست دەکەم نامەوێت نامەکە هێندەی کە نامەکە درێژ کەمەوە،
هەست دەکەم بەرە و کۆتایی وشەکانم دەچم و ئیدی دەستی

موحیبەتت لەسەر شانم هەڵگرە، ئەم هەموو ئەوینەی تۆ تیشك نادات بە شەوی من، دەریای نازی تۆ هیچ ئێوارەیەکم ڕەنگین ناکات، عیشقی تۆ زیاتر غەمگینم دەکات، دەستم لێ هەڵگرە با تا دواین وێستگەی ئەم شەمەندەنەفەرە لەنیشتیمان دورکەومەوە و لەدواین شارۆچکەی ئەم وڵاتەدا ببمە شتێك هەرچی هەیە ، ئاخر دایە ئەم هەموو ئەوینەی تۆ لە کوێدا جێی دەبێتەوە ئەم هەموو ئەوێنە لە کوێدا هەڵگرم، تا کەی ئەم هەموو ئەو ینە شار بەشار بگێڕم، دەریایەك ئەوینی تۆ لە کوێی دڵما هەڵگرم، خۆرێك مەحەبەت لە کوێی ئەم شەوەمدا بشارمەوە، دەبێت ئەوە بڵێم کە دەتوانیت بە گەورەیت بمبوریت و دوای خوێندنەوەی ئەم نامەیە لە ڕۆحی خۆتدا بمکوژیت، بەڵێ بمکوژە وەك ئەهریمەنێکی نەگریسی نێو جەنگەڵەکانی ژیان، بەرد بارانم کە وەك ژنێکی داوێن پیس بەحوکمی شەرع، تا مردن بەردم بۆ بهاوە، بمکوژە و پەشیمان بە لەوشەوەی کە لەگەڵ بابە بڕیارتاندا من بێمە بوون یان هەمان ئەو شەوەی کە بێئاگابوون لە هاتنی من مومارەسەی هەستەکانی خۆتان کرد و من لە وێوە هاتم بێ ڕەزامەندی ئێوە ، ئیدی بمکوژە و پەشیمان بە لەو شەوە ئەنگوستە چاوەی کە بۆ یەکەمین جار چاومان بە یەکدی کەوت، تۆڵەی ئەو هەموو موحیبەتەم لێبکەوە و لەهزرتا بمکوژە و لەچاوتا وێنەکانم دەربێنە و ئیدی خۆت بە خاوەنم مەزانە ، هەست بکە شەوی بڕیاری هاتنم بابە مەست بووە و تا سپێدە پرخەی هاتووە، شەوێك لە خەونێکدا بمنێژە و بەیانی بۆ کانیلەیەکیشم مەگێڕەوە، ئێوارەیەك لە خەیاڵتا گۆڕێکم بۆ هەڵکەنە و هەرگیز هەینیەك سەردانم مەکە و مۆم و بوغورد لەسەر گۆڕەکەم دامەگیرسێنە.

دایە دەتوانی یەك شەممەیەك لە ناو فرمێسکەکانتا لە خاچم بدەیت و لەهیچ کڵسایەکیشەوە داوای بەخشین لە خوداش مەکە، بەیانیەك خەو هەستە و واهەست بکە هیچ کوڕێکی وەك منت نەبووە، وابزانە لە خەونیشدا منت نەدیووە، دەشێ ئەستەم بێت بەڵام ئەستەم تەنها وشەی ئەستەمە جگە لەوە هیچ شتێك بۆ مرۆڤ ئەستەم نیە، تۆ دەتوانی لەبیرم کەی تا منیش بتوانم برینەکانم لە بیرکەم تابتوانم ژیان لە بیرکەم، تۆ بمکوژە تا شەوێك دەیجور لە خۆما بکوژم تا ڕووناکیەکانی ناووم بکوژم، تا جوانی و ناشیرینییەکانم بکوژم، تۆ لەخاچم دە من بەرگەی ئەم هەموو خاچەی زەمەن ناگرم، دەتوانی هەست بکەی بەدەم ڕەشەبایەکەوە هەڵوەریم،



بەرگەی ماچی پەپولەیەکم نەگرت و پەشموردە بووم، دایە بەیانیەك لە خەو هەستە و هەست بکە من سەدەیەکە مردووم، هەست بکە شەوی ئاگر بارانەکە بەر گوللەی وێڵ کەوتم، هەست بکە لە تەقەی خۆشیدا تیاچووم، بەیانیەك لەخەو هەستە و خۆت بخەرە جێگای باجی مەنیج کە کوڕەکانی گۆڕ بزر کران، خۆت بخەرە جێگای باجی فاتمی دراوسێمان کە کوڕەکەی لەسەر عیشق کوژرا، خۆت بخەرە جێگای ئەو دایکانەی کە کوڕەکانیان لەشیرین خەودا گوللەباران کران، دایە دەتوانی هەست بکەی ئێوارەی سێو بارینەکە لەدڵی شار دوورنەکەوتمەوە و بەبۆن کەوتم، دەتوانی چیرۆکێك بۆ مردنم دروست بکەیت، چیرۆکی نەگەڕانەوەم لە عەرعەر وەك کوڕی هەموو ئەو ژنانەی کە ئێستاش ڕەش پۆشن، دەتوانی خەیاڵت کۆکەیتەوە بۆ پێش هاتنی من، دەتوانی زۆر شت بکەی بۆ سڕینەوەی من زۆرشت، هەرشتێك کە من لەخەیاڵی تۆدا بسڕێتەوە.

تکایە دایە لەڕۆحی خۆتدا بمکوژە و لەدڵی خۆتدا بمنێژە تا لەڕۆح و دڵی مندا بە نەمری بمێنیتەوە.

تکایە بمبورە دایە لەم کێڵگەیەدا لەناو بێستان و بەرازەکاندا پشوویەك دەدەم. پشویەك تا ئەبەد.

لە حەڤدەیەمین فیستیفاڵی گەلاوێژدا پلەی سێ یەمی پێبەخشراوە.





# ژنی نێو ئەشکەوتەکە

**مارگەریتا ئێکسترویم**
**و. لە سویدییەوە: عەبدوڵلا قادر دانساز**

ئەو کاتەی ئەوان لەناو لەپی دەستمدا هێما دەکێشن، دەبێت من باوەڕیان پێ بکەم: کە ئەوان چاویان هەیە! دەبێت باوەڕیان پێبکەم. من هێمای چاو دەزانم. ئاشنای هەموو پیتەکانیشم. هەموو خزانێکی گۆی گەرمی سەری پەنجەکان دەناسمەوە. ئەوان دەتوانن "ببینن"؟ باشە بینین مانای چییە؟ تۆ بڵێی بینین ئەو شتە نەبێت، کە مامۆستاژن بە "شتێکی میتافیزیکی" ناوی دەبرد؟ باشە من چۆن بتوانم جارێك لە جاران درك بەوە بکەم بەوەی ئەوان "دەبینن"؟ لەوانەیە ئەوان لەنێو ڕستەیەکی وێنەئامێزدا تەماشاکەر، خاوەن خەونی ئایندەبن، لەگەڵ خەونێك، کە کوژانەوەی بۆ نییە، خەونێك ئەوەندە بەهێزە، ئەوان ناچار دەکات



بە پەنجەکانیان وێنەی چاو بکێشن، ئەو وێنەیەی من بە پەنجەکانم دەیانخوێنمەوە، تا ڕادەیەك بە شێوەیەکی زۆر سەیر و سەمەرە، وێنەکە لە ناوەوەی تاریکاییەوە بەرەو تۆپەڵی تاریك و گەرمی مێشکم ڕۆدەچێت.
دەست لە بەرامبەر چاوەکانیان ڕادەگرم. جۆرە هەڵماتێکن لەدەست دەخزێن و ئاودارن. ئەو چاوانەی ئەوان پێدادەگرن لەسەر ئەوەی ئەوانە چاوێلێکن ئەوان "پێیان دەبینن" بەڵام من هەست بە هیچ شتێك ناکەم. ئەو کاتەی دەستم لەسەر پیانۆکە دادەنێم هەموو لەشم بەو شتەی ئەوان بە "دەنگ" نێوی دەبەن، دەکەوێتە لەرینەوە. هەروەها ئەوان لەسەر ئەوەش پێدادەگرن بەوەی ئەو پارچە قرتێنکە، بێکەڵکەی لە شێوەی گوڵی "مارزیپان"**1** ـە لەسەر لای دەرەوەی کەلەسەرمانەوە هەن، دەتوانن، دەنگەکان بقۆزنەوە، لێکی بدەنەوە و دووبارە ڕەوانەی بکەنەوە. بەڵێ، لەوێ لەنێو ئەو سندوقە لوسەی بۆنی وارنیشی لێ دێت و پیانۆی پێ دەوترێت شتێك ڕوودەدات. بەڵام لەبەر چاوی ئەواندا...
هەست بە بۆنی هەناسە دەکەم بە خوڕ لە کونە لوتەوە دێنە دەرەوە. یاوەکو ئەو با پان و بەرینەی لە هەناسە وەرگرتن و هەناسە دانەوەی دەمی بەلیك تەڕبوودا ـ ئەو دەمەی بە پەرژینی ددان تاریکی من و تاریکی تۆ جیادەکاتەوە دێتە دەرەوە. ئەو کاتانەی بە دەستەکانم لەسەر دەموچاوێکی تازە دەست بە نەرمەلۆقە دەکەم، دەڵێن ئەم ناوچەیە موڵکی تایبەتی کەسێکە. بەپێچەوانەی ددانەکان لێوەکان وەکو لمۆزی ئاژەڵ نەرمن و پەیامیان پێیە.
دەمەوێت دەست بە لێستنەوە بکەم، بەڵام ئەوە بە تەنها سەگەکان لەدەرەوەی ئەو پەرژینانەی لەسەریان نووسراوە موڵکی تایبەتی بەستراونەتەوە، خاوەنی هیچ ویستێکی خۆیان نین. ئەو کاتەی خاوەنەکانیان فەرمانیان پێ دەکەن زەردەخەنە بکەن، دەبێت ئەوان زەردەخەنە بکەن. ئەو کاتەی خاوەنەکانیان ڕست "**2**"ی ملیان ڕادەکێشن دەبێت ئەوان واز لە ناشیرین کردنی دەموچاوی خۆیان بهێنن.
لەبەردەم هەڵماتی چاوی پێڵوداریان دەستم ڕادەگرم، هەست بە هیچ شتێك ناکەم. تۆ بڵێی ئەمە شتێك نەبێت ئەوان بە خەیاڵی خۆیانیان هێنابێت؟ ئێخۆ من هەڵماتی مەمکەکانم هەیە. ئەو کاتەی دەستیان لێ دەدەیت زۆر خۆشە. زۆر بە لەزەتەوە دەخزێن، لەنێو چینی

بەزەکانیاندا دەخولێنەوە. مامۆستاژن بە گلاندی گەورەوەبوو نێوی دەبردن، کە دەتوانن شیر بەرهەم بهێنن. هەڵماتەکانی مەمکی من هیچ شیرێك بەرهەم ناهێنن. هەڵماتەکانی چاوی من هیچ بینینێك بەرهەم ناهێنن. جارێکیان دوگمەکانی بەر کراسەکەم کردەوە. بیرم لەوە دەکردەوە، کە لەوانەیە هەڵماتەکانی مەمکم توانای بینینیان هەبێت. بەڵام ئەوەی، کە ڕوویدا ئەوە بوو، یەکێ لەو خانمانەی چاودێریم دەکەن بەپرتاو خۆی گەیاندە من و زرمەی لێ هەڵساندم. پاشان، پەنجە ڕەق و زبرەکانی لەدامێنی مەمکەکانم کەوتە چنگەکرێ، قۆپچە و کونی قۆپچەکانی ڕادەکێشا، هەناسەی ڕەق و ئازاربەخشی دەدایەوە. دەستەکان دەلەرزانەوە. دەستم خستە سەر سەری بەڵام ئەو بەبڕیاردەرانە سەری لەنێو دەستم دەرهێنا. بەڵام هەر ئەو کاتە هۆشی ئەوەم پەیداکردبوو؛ مەمکەکانم توانای بینینیان نییە. هەرگیز جارێك لە جاران شیر لە چاوەکانی منەوە نایەتە دەرەوە!

ئەگەر بێتو من باوەڕیان پێ بکەم ـ بەڵام ئەوان ئەو تاقە کەسانەن، کە شتێك دەڵێن، ئەوەش دەبێ بە بەڵگە بۆ ڕاستی قسەکانیان؟ ـ ئەگەر بێتو من باوەڕم بەوان هەبێت بەوەی ئەوان دەڵێن من و چەند هەزار کەسێك لەنێو ئەو هەموو دەستوری مرۆڤایەتیانەی ئەم جیهانەدا شازین. زۆربەی مرۆڤەکان دەتوانن ببینن و ببیستن و دەتوانن بڕۆن. دەتوانن منداڵیان ببێت. دەتوانن ڕابکەن. دەتوانن مەلە بکەن. زۆربەیان. بەڵام ئەوە شتێکە کێ دەیزانێت؟ چۆن من بتوانم ئەو شتە بزانم، منێك لەنێو ئەشکەوتی ڕەشی لەشمدا بەندکراوم. زۆر باش ڕێی تێدەچێت ئەوە بەپێچەوانەی قسەکانی ئەوانەوە بێت ـ بەوەی لەوانەیە من یەکێك بم لە سەردارانی خەڵك. ئەوانەی دەسەڵاتدارن، ئەوانەی ڕاستەقینەن، ئەوانەی زۆر باش خولقێندراون. بەڵام من لەلایەن چەند کەسێکی بەستەزمانی ناشیرین خوڵقاوەوە بەندکراوم، کە لەلایەن جۆرێك لە جۆرەکانی بینین لە چاڵایی چاوەکانیانەوە بەشێوەیەکی خراپ ئازار دەدرێن، ئەوان لەلایەك، لەلایەن گوڵە لە قرتینکە پێکهاتووە ئاڵۆزەکانیانەوە، ئەوانەی بوون بە دەسکی تەشتی خڕی کەللەسەری ئەوان توشی تەشویش بوونە.

ئەوان ئێستا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن تا بەخەیاڵی خۆمیدا بهێنم بەوەی ئەو شتە ئاوەهایە. بەوەی چی؟ دەبێت ئەو بوونە بیت؟ من ئەو بوونەم؟ دەبێت من بوونم هەبێ. من شتێکی





ڕاستەقینەم، ژیانم لەبەردایە. بۆچی تۆ من بە هەڵەیەك نێو دەبەیت؟ تاریکی خۆم هی خۆمە، لەوانەشە لەگەڵ هەموو کەسێکی تردا ئەو تاریکییە بەش بکەم. شتەکە تەنها ئەوەیە، کە ئەوان نایانەوێت دان بەو شتەدا بنێن، کە شتەکە ئاوەهایە! مەسەلەکە لەوێدایە: ئەوان دەیانەوێت لەسەر خەیاڵی خاوی گەورەی خۆیانەوە لە بارەی ڕووناکی و دەنگەوە بژین ـ ئەوە ئەفسانەیەکی تازەی پرۆمێتیۆسە. بەڵام من. من لە هەموویان ڕوونبینترم و ئەوانیش ناتوانن بەرگەی ئەو ڕاستییە بگرن. لەبەر ئەو شتەیە من بەتەنهایی جیادەکەنەوە. هەموویان، هەر هەموویان لەنێو تاریکایی خۆیاندا، لە دەرەوەی من دەخولێنەوە. هەموویان، هەر هەموویان، فێری ئەوە بوونە بەخێرایی ئەو شتە هەڵبەستراوە چکۆلانەیەی پەنجەکانیان بە من بڵێنەوە: من دەتوانم ببینم. بەڵام تۆ تەنها بەهۆی زمانی پەنجەکانەوە دەتوانیت لەگەڵ مندا قسە بکەیت.
ڕۆژێك دێت وەڵامیان بدەمەوە: هەروەها منیش دەتوانم ببینم. ئیتر ئێوە ناتوانن من بە ئەفسانەکان هەڵبخەڵەتێنن. وەرن بۆ ئێرە و بەجیدی قسەبکەن. ددانی پێدا بنێن!
بەڵام من هەرگیز ددانپیانانیان لێ وەرناگرم. ئەگەرچی خەریکە لەنێو باوەڕی خۆمدا سەرسم لێبدەم: لەوانەیە ئەوان بەڕاستی توانای بینینیان هەبێت؟ ئێخۆ ئەو شتە لە ئامادەیی و خێرایی و توانای هەمەچەشنەیان و ئاگاداربوونیاندا ڕووندەبێتەوە. ئێ باشە تۆ پێم بڵێ دەبێت بینین چی بێت؟ ئەو کاتەی مرۆڤ دەبینێت چی شتێك ڕوودەدات؟ تۆ بڵێی بینین شتێکی ئەوەندە گرانبەها بێت؟ باشە تۆ پێم بڵێ لەو کاتەیدا من توانای بینینم دەبێت، تۆ بڵێی شتێك هەبێت تا من بتوانم بەشێوەیەکی ڕاستی تێبگەم، بەشێوەیەکی جیاوازتر حاڵی ببم لەو تێگەیشتنەی لە ئێستادا هەمە؟ باشە لەو کاتەدا، دەبێت چی شتێك هەبێت من بتوانم بیبینم؟ خۆم ببینم؟ بتوانم خۆم ببینم؟ ئەوانی تر ببینم. ئەوانی تر دەبینن؟ جیهان. جیهان ڕێگا دەدات ببینرێت؟
دەستەکانم توند چڵی درەختێك دەگرێت. هەست دەکەم ئاوی نێو چڵەکە وەك ترپەی خوێنبەری دەست لەژێر توێکڵەکەیەوە کوتە کوتێتی. من دەزانم چی ڕوودەدات لەکاتێکدا ئەو کەناڵانەی وەکو دەرزی باریکن شێ لەنێو خاکدا هەڵدەمژن، خۆراك دەپاڵێون، بۆ نیمچە کولاندنێك

بۆ نێو گەڵاکان دەیانگوێزنەوە. چۆن خاك، لیتاو و باران دەبن بە کلۆرۆفیل، ڕووەك، درەخت، گەمەی دەم بەپێکنینیان لەگەڵ باکاندا، لبادی دارستانەکان، ئەوانەی ڕووتوقووتی کیشوەرەکان گەرم دەکەنەوە. پاش مردنیان دەبن بە تەختەدار. دەبن بە خانوو و سووتەمەنیی و ڕووناکی و خۆڵەمێش و خاك، لیتاو و باران.
لەو کاتەی دەستەکانم توند، زۆر توند گرتووە بە چڵی ناسکی درەختەکەوە، هەر هەموو ئەو شتانە دەزانم و بیریان لێ دەکەمەوە. ئێ باشە ئەوان چی شتێك دەبینن. تەنها چڵێك، وەکو پەتێکی ئەستوور و پووکاوە دەبینن. ئەوان بە قاوەیی تۆخ نێوی دەبەن. یاوەکو شینی ئیسابێلایی. یاوەکو سووری توێکڵی دار. یاوەکو ساف و لووس وەکو ئاوریشم، گرێدار وەك پێستی فیل، لووس وەکو لاستیك. چی شتێکیان لەو شتە بردۆتەوە؟ بەو بینین و ناولێنانەیانەوە؟
لە کتێبی یەکێك لەو نووسەرانەی کتێبەکەی لە کتێبخانەی بریل "**3**" دا هەبوو، خوێندومەتەوە: "ڕەنگی قەدی دارەکان لە نێوان سەوز و نەرمترین بۆرەوە ڕەنگگۆڕکێ دەکەن، بەڵام لە قەدەکەی دەربچێت ئەوا هەنوکە لقەکانی بەرەو وەنەوشەیی ئاگری بەهاری گەرم داگیرساو گۆڕاوە، سەرپۆشێك لە نەشئەی ڕەنگ خۆڵەمێشی بەسەر بڕە دارەکانەوە پشوو دەدات و هاکا ئەو سەرپۆشی نەشئەیە وەکو گڕی زەردێکی سەوزئاماڵ لە بەری پشتەوەی دارستانەکە ڕووناکی بداتەوە." من وتم دارەکەی ئەو لە "**X**"ەوە بۆ نەرمترین "**Y**" ڕەنگگۆڕکێ دەکات. ئەو نووسەرە بە جارێك لەگەڵ گەلێك شتی نائاشنا ڕووبەڕووم دەکاتەوە.
من هەرگیز ئەو هاوکێشەیەم بۆ حەل ناکرێت. من بە خۆم لە بۆ ئەو مەتەڵێکم! کەسێکم بۆ هەتاهەتایە نەناسراو. ئەو هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان لە هەموو ژیانیدا بۆ تاقە ڕۆژێکیش چییە نە کوێر و نە کەڕ نەبووە. من لە بۆ ئەو هەم " **X**" و هەم " **Y**"م لە یەك کەسدا. ئەو هەرگیز ناتوانێ بەو هاوکێشەیە هاوکێشەکەی من بەرێتە دەرەوە. هاوکێشەکانی دەرچوونی من هەموو ئەو ڕێگا نەناسراوانەن: من بە تەنها ئەوەندەم پێ دەکرێت بەدوای شوێن پێی ڕەنگاوی چکۆلانە و ئارامی پالێتەکە بکەوم. من سندوقێکی ڕەشم، من دەخیلەیەکم کەسێك کلیلی داوە تاوەکو دوای ئەوە ڕێکوڕاست ئەو کلیلەی فڕێ دابێتە نێو فەزاوە. هەنوکە ئەو کلیلە وەکو باڵندەیەکی چکۆلانەی کێش قورسی بێ هێلانە لە فڕیندایە.





من نهێنییەکی زیندووم، موعجیزەیەکم. لەگەڵ ئەو هەمووەشدا وا پێدەچێت ئەوان، هەموو ڕەنگ کاڵ، هاتوهاوارکەر، ئەوانەی دەتوانن ببینن بێ سێ و دوو کردن باوەڕ بە من بکەن. هەموو ئەو تەپۆڵکە ژیاندارانەی بەسەر ئەو سەدان پەنجانەی ڕۆژانە بەر پەنجەکانی من دەکەون و پەیامی بێدەنگی خۆیان بەجێدەهێڵن. کاغەزی قۆپی ڕاستەوڕاست لەوبەری سنورەکانەوەیە. شفرەی جاسوسییە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر.
ئەی من. من لەنێو تاریگی گەرم، مووداری خۆم، لەنێو تاریکی پڕشنگداری خۆم، لەنێو خرەخڕ، زرم و کوت، گرمەگرمی بێدەنگی خۆم دانیشتووم و گومانیان لێ دەکەم. گومان لە چاو و گوێیان دەکەم بەبێگومان: ئەوە خەونێکی ئێجگار خۆشە، وا نییە؟ گوێیەکی لە قوڕ دروستکراو بنووسێنە گۆزە لە قوڕ دروستکراوەکە ئیتر یەکسەر گوێی لە ئاوەکە دەبێت لە نێو ئەودا شڵپ و هوڕ دەکات. هەڵماتێکی لە مەڕمەڕ دروستکراو بچەقێنە نێو پرتەقاڵێکەوە ئیتر ئەو پرتەقاڵە دەتوانێ تەماشای ئەو سەوزاییە تۆخ و سافەی دەوروپشتی خۆی بکات و ببینێ، لە لای ڕاستی گۆشەی چاویەوە دەتوانێت ببینێ چۆن دڵۆپێك ئاوڕینگ لەسەرەخۆ دەچێتە سەر لێواری گەڵایەکەوە و درێژ دەبێتەوە، دوودڵ دەبێت، بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە دەچەمێتەوە و لە پڕێکدا: دڵۆپەکە ون دەبێت.
بەڵام منێك، کە نابینم، دەزانم ئەو دڵۆپە بەربووەتە خوارەوە بۆ سەر تەوقی سەری قورباقەیەکی پیر و بۆ سێسەد ملیۆن پرش پارچە پارچە بووە، هەندێك لەو پرشانە "بینراو بوونە" و هەندێکی تریشیان بۆ "چاوێکی ڕووت" شتێکی هەست پێنەکراو بوونە، بەڵام تەڕاییەکی بریقەدار وەکو تاجێك لەسەر نێوچاوانی گیانەوەرە زارەتەرەکەکە مابووەوە لەو کاتەی هەناسەبڕکێی تێ کەوتبوو بە تەکان ڕووەو چارەنووسی خۆی لەبەرچاو ون بوو...
حیکایەتێکی دڵگیرە، ئەو حیکایەتەی لەبارەی سەدەفی چاو هەڵماتی چاوەوە بوو. لەوانەیە ئەوەیان ئەو کاتەی یەکەمین جار لە کەناری دەریا بووم خەونم پێوە بینیبێت. دەڵێن گوایە چاو وەکو ئاو وایە، گوێ وەکو دەریا هوژەی دێت. ئەمەیان ئەو کەسانەی باوەڕدارن وا دەڵێن. بەڵام من هێشتا پیرۆز نەکراوم. بە شێوەیەکی تریش من سنووردار نەکراوم. من لە

دەرەوەی گۆشەی چاو، دوور دوور لە کونی بیستن دەبینم و دەبیسم. بەڵام من تا ڕادەیەك ئەوەندە ژیرم تا بتوانم ئەو ڕازە نەدرکێنم! هەمدیسانەوە ئەوان، لەسەر هەموو بابەتێك قسەی بێسەروبەر دەکەن، دەستەکانیان وەکو چەقۆی لە قوڕ دروستکراو دێن و دەڕۆن، شەیدای فێرکردنی منن، بەردەوام ئارەزووی هاواری بە زەوقی خۆیانن "نابینی؟"، "ئایا بیستوتە، کە..." بۆ من بکەن.
وەکو چۆن شاژنێك دەسەڵاتی بەسەر شانشینی خۆیدا هەیە منیش دەسەڵاتم بەسەر ژیریی خۆمدا هەیە. من لە بەرامبەر کەسانی ئازیزی خۆمدا بەرپرسیارم: چۆن ئەوان دەتوانن بەرگەی ئەو هەموو ڕاستییە بگرن؟
کوێریی جگە لە دیوی پشتەوەی خەونی چاوەکانی ئەوان بەولاوە چی شتێکی ترە؟ کەڕی: ئەو پشووە گەورەیەیە، لە کاتێکدا قسە و قسەڵۆکی ئەوان کۆتایی پێ دێت. من نامەوێت لە ڕووناکی ئەواندا هاوبەشبم. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت بێبڕانەوە هاوبەشی تاریکی و بێدەنگی ئەوان بکەم. لەوانەیە من ئەو ترسە سامناکە پەنهانەی ئەوان بم، بە سۆزەوە بۆ گۆشەی شەرمەزاری بوون پاڵی پێوە نرابێت؟
من نامەوێت بەردوام بە هۆی بوونی ئەوانەوە بژیم. لەوانەیە من لەنێو ئەواندا بژیم؟ ئەوکاتەی ئەوان چاو دەنوقێنن: ئەوەتا ئەوە منم. ئەوان دەست لەبەر گوێی خۆیان ڕادەگرن: ئەوەتا منم. ئەوان دەستە بێچارەکانیان لەنێو بۆشاییەکەدا درێژ دەکەن: ئەوەتا ئەوە منم. وای چاو و گوێ ئازیزەکانم! مەترسن! من، هەردەم لێرەم. ئێخۆ من لەبەر خاتری ئێوە لێرەم. من کونی ئەو گێژەنگەم لە بنی گۆمەکە ئاو هەڵدەمژێت؟ تەنها وەکو گێژەنگێکی هێمن لەسەر ئاوەکە بەدەردەکەوێت. دەشزانم! ئێوە هەر هەمووتان حەزتان لێیە ئەوەندەی دەکرێت لە نزیکی منەوە مەلە بکەن. ئێوە نە دەتوانن گوێتان لە من بێت و نە دەشتوانن بمبینن، بەڵام ئێوە هەست دەکەن من لە نزیك ناولەپی بێزەواڵتان دام و بەرەو قوڵایی ناولەپتان قاش دەکەم و ڕاستە و ڕاست پێستەکانی تاریکی خۆم لەنێو دەستە بێدەسەڵاتەکانتان دەنووسمەوە.
بەڵام ئەوە ڕاست نییە! ئێمە هەر هەموومان لەنێو دەریاکەداین. هەر هەموومان مەلەوانین و بەرەو بنی دەریای نەناسراو مەلە دەکەین. هەر هەموومان قومی گەورەی ڕاستی دەچێ بە





قورگمانا و لەوە بەدواوە ناتوانین بەسەر سەری ئاوەوە بژین. دە دەستێکم بۆ درێژ بکە تا من بتوانم یەکسەر بەر لەوەی بخنکێم هیمای "فریام کەوە"ی تیا بنووسم. بەڵام ئەگەر من بە هەڵە لەسەر گەڵای نیلۆفەرەکە ئەوەم نووسی، ئەوە لەبەر ئەوەیە، کە هەموو ئەو مرۆڤانەی چاو و گوێیان هەیە دەمێکە لە ئاوەکە دەرچوونەتە دەرەوە و چوونەتە سەر کەناری دەریاکە و پشتیان لە من کردووە، چونکە هەورێکی قورس لەسەر قەراغی دارستانەکەدایە و سێبەرەکەی وەکو زبانێکی ڕەشی مۆر تا ناوەڕاستی دەریاکە دەرکردووەتە دەرەوە.

کێ هەست بە زایەڵەی گێژەنگێکی وا چکۆلانە دەکات؟ جگە لەوەش نەختێکی تر هەموو شتێ هێور دەبێتەوە. هەموو یەکێك لەوان دەتوانێت ئەو شتە ببینێ. بێدەنگی. هەر هەموویان گوێیان لێیە. دەبێ ئەوان باوەڕ بەچاو و گوێی خۆیان بکەن. لەکاتێکدا من لە تواناما نییە بە گومانەکانم ئەوان سك پڕ بکەم دەبێ چی شتێکی تر هەبێت جێگای باوەڕی ئەوان بێت؟ ئێستا هەر زوو دەتوانم تروسکایی نیمچە تاساوی تەسکینی شاراوەی، وەکو لە شەرماندا سوور بوونەوەیەکی بە بێ ئارەزووی ئەوان بەسەر ڕووی دەموچاویانەوە ببینم.

من بەهەڵە بینینێك بووم، ئێستا ئەوەیان لەکۆڵ بووەتەوە. من وەهمی گوێبیستنێك بووم، هەنوکە ئەو هەڵەیە نەماوە. ئەوان سەعاتێك دوای ئەوە لەشی مردووی منیان لە دەریاکە دۆزییەوە و گەمژانە چڵی گوڵە نیلۆفەرێك لەنێو مشتی توند گرتووی مندا بوو. من دەیانبینم و گوێم لێیانە، وەکو چۆن ئەوان دێنە بەرچاو و دەنگیان لێوە دێت.

بەڵام من هێشتاکە هەر لێرەم. هەتاوەکو ئێستاش بیر دەکەمەوە. خۆپارێزی دەکەم. من ئەوەم و هەر بەوەشەوە دەمێنم. بارانی پاش نیوەڕۆ بە قورسی لەسەر لەشم، کە لە سەدان کونی پێستی چاوبرسییەوە هەناسە دەدات، دەبارێت. لووتم باسی شادی هێمنی گەڵاکان، مەلەی لەسەرخۆی وردە چەوەکان، لە بارەی ئەو سەگەی پەنای بۆ بەر هەیوانەکە بردووە و بەتەواوەتی بە پێستی مودارییەوە بەتەنیشت منەوەیە. هەنوکە سەگەکە زۆر بە سۆزەوە لووتی بە دەموچاومەوە دەنووسێنێت و منیش دەزانم ئەو سەگە دەڵێت: ناتوانیت قسە بکەیت؟

من ساتی لەخۆبایی بوونی خۆم هەبووە. هەنوکە خزمەتکارەکانم، کە سەر بە خانەوادەی باڵان دێن (میرە ڕووسەکان بوون بە سایەقی

تاکسی) دەستم دەگرن و دەمبەنە ژوورەوە. بە جۆشەوە بۆم دەگێڕنەوە دەستی بە باران بارین کردووە، "کارۆ" بەتەنیشت منەوە دانیشتووە، باران بارین دوای بێبارانییەکی وا درێژخایەن زۆر خۆشە هەروەها سبەی بۆ مەلە کردن بە سواری سەیارە دەچین بۆ سەر دەریا.

سەرچاوە:
Margaretta Ekström, Husliga scener, Kvinnan i grottan, p.25-34, Bonniers, 1964.

"**1**" مارزیپان: جۆرە شیرینییەکە وەك توێژاڵ دەخرێتە سەر چەند جۆریك لە کێك و کولیچەی تایبەتیشیان لێ دروست دەکرێت.
"**2**" ڕست: پەتێکە دەکرێتە ملی تانجی کە ببرێ بۆ ڕاو. ڕستکردن: پەت خستنە قەڵاتەی ملی تانجی بۆ ڕاکێشان. (فەرهەنگی خاڵ).
"**3**" بریل: مەبەستم لە نووسراوی بریلە، کە نابیناکان پێی دەخوێننەوە.

مارگەرێتا ئێکستروێم: نووسەر، وەرگێڕ و ڕەخنەگرێکی سویدییە. لە ٢٣ی ئەپرلی ساڵی ١٩٣٠ لە شاری ستۆکهۆلم لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٦٠ یەکەم بەرهەمی خۆی (ئێواران



له سانت پێتەرس بۆرگ) بڵاوکردەوە. هاوکات بەردەوام به نووسینی حیکایەتەوە خەریك بووە و له گۆڤاری (بلاند تۆمتەر ئۆك ترۆل) بڵاوی کردوونەتەوە.
وەك ڕەخنەگر له ڕۆژنامەی ئێکسپرێس له ساڵانی ١٩٦١ ـ ١٩٨٣ و هاوکاری ئەدەبیی له ساڵانی ١٩٧٤ ـ ١٩٨٢ له ڕۆژنامەی سیدسڤێنکه هاوکات گۆڤاری ئاڵت ئۆم بوێکەر و گۆڤاری (خوێنه هیم) کاری کردووە.
یەکێکه له کۆڵەکەکانی چیرۆکنووسین به زمانی سویدی. هەرگیزاو هەرگیز ناتوانرێ ئەنتۆلۆگیایەك بۆ چیرۆکی سویدی بکرێت و یەکێ یان دوان له چیروکەکانی ئەوی تیا نەکرێت.
مارگەرێتا خاوەنی چەندین کۆمەڵه چیرۆك و ڕۆمان و حیکایەتە.



یۆستاین گاردەر

# کۆشکی بۆق

وەرگێڕانی

سیروان مەحمود



2014



# بەدزی هەموو دنیاوە

لازۆ

درەنگە، هەموو شتێك شەوی پۆشیوە، منیش خۆم خزاندۆتە جێگاکەمەوە و بە دزی هەموو دونیاوە دەستم کرد بە نووسینی ئەم نامەیە بۆت.

پەنجەرە بچوکەکەی تەنیشتم کراوەتەوە، پەردەی تەنك و مۆری ژووری خەوتنمان دەشنێتەوە، هەوایەکی نەرم و ئارام دێتە ژێر جلەکانمەوە و پێستم گرژ دەبێت، هەست دەکەم برینەکانم بریسکەیان دێت و خوێنیان پیادا دێتە خوارێ.

هەموو شتێك ئارام و مات تێدەپەڕێت، شەو وەك باڵندەیەکی ڕەشی گەورە باڵەکانی خۆی کردۆتەوە و باوەشی بە زەویدا کردووە. جارجار دەنگی ناخۆشی ئۆتۆمبێلێك لە خەیاڵ و بیرکردنەوەکانی خۆمم دەپچڕێنێ و دەمهێنێتەوە ناو ڕاستییەکان کە ئیستایە، واتە ساتی جوڵە نەرمەکانی پەردەی مۆر.



ئەمشەو لەگەڵ هاتنی ئەو هەوا تەڕو شێدارەی دەرەوەدا من لەرز دامدەگرێ و دەنگی ئەو کوڕە سەرخۆشانەی گەڕەکی خۆمانم دێتەوە یاد کە شەوانی هاوینیان پڕ دەکرد لە خەم و تەنیایی.
بەو دەنگە حەزین و بریندارەیانەوە هەموو کچانی گەرەکیان لەژێر جێگاکانیان دەهێنایە دەرەوە، بە دزییەوە لە سەربان و حەوشە و تەنیشت تەنکی ئاو و بن درەختەکانیشەوە خۆمان گرمۆڵە دەکرد و گوێمان لێیان دەگرت، لەگەڵ کەوتنی سپێدەشدا هەموو چاوخەواڵوو کۆدەبوینەوە و دەمانویست وێنە بۆ خاوەنی ئەو دەنگانە دروست بکەین.
زۆرجار شەڕمان دەبوو لەسەر یەکێکیان کە من بە هی خۆمم دەزانی و ناومنابوو تەیمور.
تەیمور وای لە تەیمور، کە گوێت لە دەنگی دەبوو وەك ئەوە بوو تلیاکت بدەنێ، گێژ دەبویت و دەگریایت هەر دەگریایت و نەتدەزانی بۆ. ئێمە کچانی گەڕەکی سابونکەران کە "جادە چۆڵ و سێبەر بوو کاتی بەیانی، دەرۆیشتین خەیاڵاوی دەمانڕوانی"، چونکە شەوی پێشتر تەیمور گۆرانی گوتبووا!
نوزەیەکی حەزین لە دەنگیدا بوو، هیچ شەوێکیش گۆرانییەکەی لەبەر گریان بۆ تەواو نەدەکرا، هەموو لەبەر خۆمانەوە دەمانگوت خودایە گریانی عەشق نەبێت، خودایە بیپارێزە لە ئەڤینی بەد، ئینجا من دەمزانی ئەو دەگری، دەمزانی بریندارە، دەمزانی نامورادە.
بیری تەیمور دەکەم باران، ئەبێ ئێستا چ خاکێك قوتیدابێت؟
تەیموری کراس ڕەش و ڕیش هاتوو، تەیموری من.
وێنەکان خۆڵیان لێنیشتووە و هیچ شتێك وەك جاران نەماوە،
وای باران وای وەك ئەوەی جادوم لێکرابێت، وەك ئەوەی دەستی لە ناو دەستمدا بێت و هاوکاریم بکات بیرم

بکەوێتەوە، چاوم دادەخەم و هەست دەکەم دەستم بەر ڕیشە تەنك و تازە هاتووەکەی دەکەوێ.
ئێمە کچانی سابونکەران زۆر بۆ تەیمور گریاین ئەو کاتەی چوو بۆ ئێران، کە لەبەر هەژاری ناردیان بۆ خشت بڕین.

پارەمان بۆ کۆکردەوە تا پەشیمان بێتەوە و نەڕوات. هەریەکە و خوماندایە ئیشێك، خەیاتی، ئیشی ساڵۆن، لفکە چنین، نان کردن ودوعا کردن بۆ ئەو ژنانەی منداڵیان نەدەبوو، بۆ ئەوەی تەیمور نەڕوات، بۆ ئەوەی بەجێمان نەهێڵێت، بۆ ئەوەی یەکێکمان بخوازێ و گۆرانی بۆ هەمووومان بچڕێت.
وەی تەیمور چۆن دڵی هەموومانی یەك یەك خوارد،
چۆن بۆ ئەبەد گۆرانی لە خوێنماندا کردە سەڕەتان.
بیری کۆڵان و حەوشەی ماڵی خۆمان دەکەم،
بیری"تەنور"ە شکاوەکەی نەنکم دەکەم کە هەر بە بینینی بۆنی کولێرە بەڕۆن و پەنجەکێشی پڕ کونجی بیردەخستمەوە.
بیری خۆڵی سەربان و دار هەنجیرەکان دەکەم.
بیری تەناف و چۆلەکە و مێشولەکانی ئەو ماڵە دەکەم.
بیری قەوزەی ژێر مەرکانە و بۆنی ئاوڕشێنی بەردەرگا و ئێوارە خەمبارەکانی ئەوێ دەکەم کە هەمیشە لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی مامە کوژراوەکەمدا تێدەپەڕی.
بیری کرمی باخەکەمان دەکەم، بیری دەرگای حەوشەکەمان دەکەم کە بۆ ئەبەد بە یەکەم پیتی ناوی کوڕ و پیاوە دڵتەڕەکان ڕەشماندەکردەوە.
بیری دەنگی مەلا و بانگی ئێواران دەکەم.
بیری چونە بەردەرگا و دڵی پڕخورپە و بینینی لەپڕی تەیمور دەکەم.
بیری دەستە زبرەکانی نەنکم دەکەم.
بەرماڵ و دەنگ بەرزکردنەوەی باپیرم لە نیوەی نوێژدا.
بیری لەدەرگادان و هاتنی دۆستێکی دێرین دەکەم.
ئای بارانی ئازیز جا بموکوژە توخودا، من بیری هەموو شتێك دەکەم.
بیری دڕندەی کۆڵان و زوقمی بەیانیانی زستان دەکەم





بیری شاردنەوەی نامەیەکی بە نرخ و تایبەت دەکەم لە ناو ستیانەکەمدا.
بیری وەرگرتنی نیودینار دەکەم لە پورم؛
کڕینی لەبزینە و لوقمی شروبی لە نەجمەدین-ی دوکاندار کە هەمیشە
زۆر بە گران بە ئێمەی دەفرۆشت و شێتی ئەوروپاش بووبوو.
بیری ڕەحلەکانی مەکتەبی مەحوی دەکەم، چاڵوچۆڵی ئەو کۆڵانەی ڕۆژی
سەدجار تیایدا دەکەوتین،
ناوساجی ئێواران و دڵفراوانی دراوسێ.
باران جا من چی بکەم توخودا من چی بکەم؟
بیری سروە دەکەم کە هەمیشە بە بێدەنگی بەو قژە درێژ و خاوەیەوە
ماڵی پاك دەکردوە و هەر بە بێدەنگیش نەوتی کرد بە خۆیدا و خۆی
سوتاند.
هەمووومان لەیەکتر ون بووین و تەیمورمان نەدۆزییەوە. کچانی
باجی سازگار کەسیان شویان نەکرد و تەیمور نەگەڕایەوە.

سێ ساڵ بە دوای یەکدا قوربانیمان بۆ کرد و لە هیچ شوێنێکەوە
دیار نەبوو. دڵی من نەگەڕایەوە.
تەیمور هی من بوو، هی من و بەس
بەڵام من وام نەدەگوت؛
نەمگوت ئەو شەوەی بەڕێکەوت، بەردێکی کونکراوی هەڵدایە
سەربان بۆ من، لێی نوسیبوو:
نەکا نەگەڕێمەوە
نەکا جارێکیتر گوێت لە دەنگم نەبێت
نەکا لە ناو زوڵمەتی زەماندا ببمە تۆز
پەتێکی تێبکەو بیکە ملت
لەبری دەست و مەچەکی من بیکە ملت.

تەیمور هی من بوو؛
کەس خاوەنی تەیمور نەبوو من نەبێت
با ئیتر هاوڕێ دێرینەکانم ببنە دوژمنم،
با پشتم تێبکەن و نەمدوێنن
بەڵام با بزانن تەیمور هی من بوو هی من و بەس.

شەو ڕەشتر و باران بەخورترە، حەز دەکەم دەرگای ماڵەکەم بکەمەوە و ڕابکەم، بگریم و ڕابکەم، حەز دەکەم لە چاوتروکانێکدا هەموو شتێك وەك خۆی لێبێتەوە.

باران، بیری میهرەبانی و ماچە لەپڕەکانت دەکەم، وا من چیرۆکەکانی خۆم بۆ تۆ دەگێڕمەوە؟ تۆ هێشتا گوێم لێدەگریت؟ ئەمشەو تۆش گوێت لە دەنگی تەیمور بوو؟

خۆشمدەوێت
لازۆ
٢٠١١/١/٨





# کاتارینا فرۆستێنسۆن

**ئامادەکردن و وەرگێڕانی: باران**
**چاوپێکەوتن: پۆنتوس دالمان**
**ڕانانی کتێب: ئامێلین بیۆرک**

”تا ئێستاش بەردەوام سەردانی ئەو گەڕەکە دەکەم کە کاتێك منداڵ بووم، ماڵمانی لێبوو. دەچم لە ڕێگا و قادرمە و کێڵگە و هەورازەکانی ئەو ناوە دەڕوانم. چوونەوەم بۆ ئەوێ و جولانەوەم تیایدا، بۆ من فرە ئەفسوناوییە. ئەو ناوچەیە هەمیشە دەمباتەوە ناو یادەوەریم، وەك ئەوەی وێنەکانی جاران، لەوێ دانرابن و چاوەڕێبن بچم بیانچنمەوە.“

ژنە نووسەری بەتوانای سویدیی "کاتارینا فرۆستێنسۆن"، ساڵی ١٩٥٣ لەدایك بووە، لە پێش هەموو شتێکەوە شاعیرە بەڵام پەخشان و دراما و دەقی ئۆپێراش دەنووسێت، هەروەها وەرگێڕیش بووە. ساڵی

١٩٧٨ یەکەم کۆشیعری چاپکردووە و تا ئەمڕۆ چەندین جار و بۆ چەندین کتێب و کار، خەڵاتی ئەدەبی وەرگرتووە و لە ساڵی ١٩٩٢ەوە بە ئەندامی ئەکادیمیای سوید هەڵبژێردراوە.

لە چاوپێکەوتنێکی تایبەتدا

کاتارینا فرۆستێنسۆن کە بۆ سێهەمین جار بۆ وەرگرتنی خەڵاتی ئاگوست پاڵێورا، وەك کەسێکی داخراو و سەخت ناوزەند کرا بەڵام ئەمە تەواو ڕاست نییە، وا لێرەدا "پۆنتوس دالمان" چاوی بە کراوەیی ئەو شاعیرە دەکەوێت کە سەرمەستە بە وێناکردنی هەستی شار و بارودۆخەکانی خەڵکی ...

کاتارینا لەڕیستۆرانی (گوندولێن) دانیشتووە قاوە دەخواتەوە و لە دیمەنێکی خەیاڵبەری ستۆکهۆڵم دەڕوانێت. مەیدانی سلووسن و سوێدەرمالم دەکەونە خوارووی ڕیستۆرانەکەوە. هەر وەك فەزای شیعری "زستانی سلووسن" لە کتێبی "قسە و باران"دا، دانیشتوانی شار لەوێوە بەرەو شەقامی یوێتگاتسباکێن سەردەکەون.

ڕووخسارەکانی سەدەی ناوەڕاست،
بێ خۆشەویستی، تەقەڵای سەرکەوتنیانە
بەسەر هەورازدا.
زرنگانە، بە کۆڵەپشتەکانیانەوە،
نێچیر بەرەو گوللە ڕاپێچ دەکەن،
لە و ێ



خەون، لە بیری بردنەوەدایە.

ئەمە وێنەیەکی دڵڕەقانەی خاوەن ئاپارتمانەکانی ئەمڕۆیە! درێژەی شیعرەکە دەڵێت:

کەش،
ناقس حەوت نمرەژێر بەختەوەرییە،
هیچ بەسەر توانای سەرمادا نایەت،
تا ئەو شوێنەی
هەست لەدەست دەدەین،
دەمانبەستێت.

کاتارینا دەربارەی ئەم شیعرەی خۆی دەڵێت:
کاتارینا: ئەمە شێوازێکی تابلۆی شارە، ئیلهامەکەیم لە نیگاری زستانی وێنەکێشی هۆڵەندی "بروێگێل"ەوە بۆ هاتووە. زستانێکی سەخت و چروک لە نێوان دێڕەکاندا هەیە، هەروەها هەندێك لایەنی کۆمەڵایەتیش بەڵام شیعرەکە باس لە خاڵی سفرێکیش دەکات کە دەشێت لەدایکبوونێکی تر و بوونێکی گەرمتری لێوە پەیدا ببێت. لەوێدا مرۆڤ ئەوەندە بە سەرمادا ڕۆچووە، گەیشتووەتە دۆخی بەستنێك کە ئیدی دەبێت وەرچەرخێ و پێچ بکاتەوە.

بڵێی "کاتارینای سەخت" ئەو شاعیرە سیاسییە بێت، کە توانیبێتی بەسەر کەشوهەوای قەیرانی ئابووری ئەمڕۆدا، سەرکەوێت؟ ئەو کە بە هۆی داهێنانە پڕ بایەخ و بێگەردەکانییەوە لە بواری زمانەوانیدا، لە ئەنسیکلۆپێدیای نیشتمانی بە خۆگر و توندوتۆڵ ناوبراوە... هەر چۆنێك بێت ئەمە شتێکی چاوەڕواننەکراو نییە.

هەر هەمان ئەو ساڵەی کۆمیدیای "هاوڕێی سەفەر"ی "لاسێ ئۆباری" چووە سەر تەختەی شانۆکان، ساڵی ١٩٨٠ شیعرە تورەکانی کاتارینا فرۆستێنۆنیش خوێندرانەوە. شیعرەکان دەربارەی وڵاتێك بوو کە تێیدا، "سەگەکان دەکوژران یاخود لە توالێتەکاندا لاقە دەکران"، "وڵاتێك کە بە قەرزی سپییەوە ڕقی لە تاریکیی دەبووەوە" ...هەر لەوێوە دەنگێك دەیوت:

لێگەڕێ با ئەوانەی کەوتوون بکەون



لێگەڕێ، ئەوانەی تاقەتیان هەیە،
خۆیان کۆیدەکەنەوە.
بەردەوامبە، سەربکەوە،
خاوەنی وڵاتی خۆت بە!

کاتارینا: کاتێك کۆشیعری "پاکیی وڵات"م نووسی، زۆر بەو بیرکردنەوانەوە سەرقاڵ بووم کە چۆن لە سویددا هەوڵ دەدرا هەموو شتە تاریك و بێزارکەرەکان دووربخرێتەوە. جۆرێك لە بیرکردنەوەی ئەندازیارانەی قووڵ لە ناو جەستەی کۆمەڵگاوە، بە باوەڕدارییەکی زۆرەوە، لە ئارادا بوو، بە جۆرێك کە بتوانرێت هەموو شت ڕێکبخرێتەوە. نازانم ئەگەر سوید ئەمڕۆ، بەو ئەندازەیە چاکسازی تێدا کرابێت بەڵام کۆمەڵگا لە زۆر ڕووەوە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە.

لە شانۆنامەکانیشمدا، زۆر وێنەی سوید و ڕەخنەی کۆمەڵایەتی بەرچاو دەکەوێت بەڵام بۆ من وەك نووسەر، ناتوانم ئاوها لە چەند دێڕێکدا باس لە نووسینەکانم بکەم، دەتوانم تەنها ئاماژە بەوە بدەم کە دەقەکانم پڕن لەو جۆرە وێنانە.

- مەبەستت لەوەیە نازانیت بۆچی ئەو وێنانە لە نووسینەکانتدا هەن؟

کاتارینا: بۆچی هەن؟! چونکە من تیایاندا دەژیم و تێبینییان دەکەم. دەڕەنجێم پێیان و دەمەوێت وێڵیان بکەم. بەڵێ بە دڵنیاییەوە ئەو وێنانە لەبەر ئەوە لە نووسینەکانمدا هەن. لەبەر ئەوەی بە زۆر شێوە کارم لێ دەکەن، بوونەتە بەشێك لە من و چوونەتە ناو من. هەندێك جار ڕستەیەك دەنووسم کە لە کاتی چوونمدا بۆ بازاڕ تووشم دەبێت. من هەرگیز وازم لەوە نەهێناوە کە بەدەم ڕێگاوە ببینم، ئەو خووە لە کۆڵەکە سەرەتاییەکانی نووسینی منە. هەندێك ڕۆژ لە هەموو لایەکەوە دەبینم، بیرۆکەم بۆ دێت، زۆر دەنگ دەبیستم، زۆر شت دەڵێن، هەموو ئەمانە دەبنە هۆکار و هەوێنی شیعر. ئەمانە دەکرێت دەربڕینی دەموچاوێك بێت لە شەمەندەفەرێکدا، وشەیەك لە لاپەڕەی هەواڵی ڕۆژنامەیەکدا یاخود شتێك کە کەسێك بەلایدا تێدەپەڕێت و لە پڕێکدا دەیڵێت.
کاتارینا فرۆستێنسۆن بە دیوانی شیعری ـ قسە و باران ـ بۆ سێهەمین جار خەڵاتی ئاگوستی بەدەستهێناوە. سەبارەت بەمە دەڵێت:

ـ کتێبەکەم پێشوازی زۆری لێکرا و بەرز ڕاگیرا، ئەمە جێگای دڵخۆشی منە و هی ئەوەیە سوپاسگوزار بم.

ڕابێژییەکان لەسەر نوسخەی کتێبەکانی فرۆستێنسۆن لە کتێبخانەی زانکۆی ستۆکهۆلم، پڕن لە ڕستەی دیاریکراو و خشتەی تێبینی خوێنەران. هەر وەك چۆن ژمارەی ئەو شیکارییانەی لەسەر شیعرەکانی کراون، ئێجگار زۆرن. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو لە دەمێکیشەوە لەوەدا سەرکەوتوو بووە کە بەشێك بێت لە پەنهانی!

کاتارینا ئەوە دەگێڕێتەوە کە بە منداڵی لە شوقەیەکدا گەورە بووە لە نهۆمی حەوت. ئەو کاتە ماڵیان لە هێگشتێن بووە، نزیکەی نیو میل لە باشووری خۆرئاوای ئەم جێگایەوە کە ئێستا لێی دانیشتووین. ئەوێ ناوچەیەکی پڕ سەوزاییە و جار دوای جار زیاتر لە کتێبەکانیدا دەردەکەوێت.

شاعیرەکەمان لەم بارەیەوە دەڵێت:
- تا ئێستاش بەردەوام سەردانی هێگێشتێن دەکەم. دەچم لە ڕێگا و قادرمە و کێڵگە و هەورازەکانی دەڕوانم. چوونەوەم بۆ ئەوێ و جوڵانەوەم تیایدا، بۆ من فرە ئەفسووناوییە. ئەو ناوچەیە هەمیشە دەمباتەوە ناو یادەوەریم، وەك ئەوەی وێنەکانی جاران، لەوێ دانرابن و چاوەڕێبن بچم بیانچنمەوە.

هەروەها دەڵێت:
- من دەربارەی دایکم و باوکم و خوشك و براکانیشم زۆر دەنووسم، ئەوان هەمیشە بە جۆرێك لە بیرۆکە لە شیعرەکانمدا دەردەکەون.

- ئەمە بۆچی؟
کاتارینا: چونکە ئەوان زۆر دەگەیەنن بۆ من.

- منداڵییەکی ڕووناکت هەبوو؟
کاتارینا: بەڵێ، بەهەرحاڵ تاریك نەبوو بەڵام من منداڵێکی هەستیار بووم. زۆر خۆم دەخواردەوە، ئاسان بە کەشوهەوای دەوروبەر کاریگەر دەبووم و بۆم قورس بوو بەرگری هەندێك دۆخ بکەم. پێموایە من منداڵێکی ناسك بووم، تا ئێستاش وام، لە بەرکەوتندا بێ پێست و لە بیستندا گەلێك بە هەستەوەرم. لەوانەشە هەر ئەم تایبەتمەندییانە بن کە مرۆڤ دەکەنە نووسەر. من زۆر دەڕۆشتم و خەیاڵم بە وشە و زمانەوە دەکرد. ڕەنگە هەمیشە تێڕامانەکانم



بە قووڵیی نەبووبێت بەڵام لەو سەردەمانەوە لەگەڵ زمان خەریکم.

ـ لە دێڕە شیعرێکتدا، باوکت دەڵێت:
"ئەی منداڵ، یاری بە وشە مەکە."

کاتارینا: بەڵێ بەڵام لە ڕاستیدا باوکم قەت وەهای پێ نەوتووم. نازانم بۆچی وام نووسی، ئەوە جۆرێك بوو لە ڕەخنەی خودی خۆم کە بەو شێوەیە دزەیکردۆتە ناو شیعرەکەوە. ڕاستتریش بڵێم، من زیاتر هاندراوم کە بخوێنمەوە و بنووسم.

کاتارینا لە کتێبێکیدا شیعرێکی بۆ دایکی نووسیوە. دایکی وەك ڕاوێژکاری کۆمەڵایەتی کاری کردووە. باوکی بە گوێرەی شیعرێك لە دیوانێکی ساڵی ٢٠٠٤یدا، نەخۆشی سەرجێگا بووە. باوکی وەك ئەندازیاری کشتوکاڵ، سەرقاڵی پرسی زەوی کشتوکاڵی بووە.

"ئاندێش فرۆستێنسۆن" کە شاعیرێکی ئاینییە و لەناو خەڵکدا ئازیزە، مامی کاتارینا فرۆستێنسۆنە. ئاندێش خاوەنی ئەو دێڕە شیعرەیە کە دەڵێت:

"عەشقی خوا،
وەك کەنار دەریا و وەك گیایە."

کاتارینا: سرووده دینییەکانی مامم و کارەکەی وەك پیاوی ئاینی، کاریگەری زۆریان لەسەرم هەبووە. من هاوبەشییەك لەنێوان کەشوهەوای نووسینی خۆم و وێنە شیعرییەکانی ئەودا بەدی دەکەم. ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هاوینانمان پێکەوە لە هەمان هەرێم بەسەردەبرد. بەڵام من هەرگیز سروودی ئاینی نانووسم، پێموانییە من ئەوەندە ئیمانم بەهێز بێت کە وەها نووسینێك دەیخوازێت.

لە چاوپێکەوتنێکی کۆندا، لە ڕێکەوتی ١٩٨٣/٨ لە ڕۆژنامەی "دەنگەکان لە ڕادیۆ"دا نووسراوە:
ڕووی دەدا، لە کاتی وانەی قوتابخانەدا، کاتارینا لەپڕ هاوار بکات و بڵێت: "قەپاڵ لە قورتمیان بگرە و بیانخۆ!"... ئەمەش دەکرا وتەیەك بووبێت لە ناو کتێبەکانتدا.

کاتارینا بە پێکەنینەوە دەڵێت:
ـ بەڵێ، تەماشای ئەو نووسینانەم بکە، بزانە چەنێك دەربارەی ددان و گازگرتن دەبینیتەوە.
ئێمە چەند قوتابییەك بووین خولیای ئەدەبی و هونەرییمان هەبوو، کاتێ لە

پۆلی هەشت و نۆ بووین، وەك شێتییەك ئەو ڕستانەمان بە هاوارەوە دەوت و خۆشیمان لێ دەبینی.

ـ لە چاوپێکەوتنەکەدا، نووسراوە کە تۆ جارێك لە دارشتنێکی قوتابخانەدا، باست لەوە کردووە کە حەزت لە شیعرە چونکە پێتوابووە شیعر "داخراو و تاکڕەو و کۆنەپارێزە".

کاتارینا: بەڵێ بەڵام لە بیست ساڵیدا، ئەو ڕایەم گۆڕا، دوای ئەوەی شیعری "گوننار ئێکێلوێڤ" و "سیلڤیا پلاس" و ... زۆری دیم خوێندەوە.

ـ دواتر لە شیعری ناو کتێبەکانتدا، تووشی گاڵتەجاڕی بوویت بە ڕەخنەی "داخراوی شیعر"؟

کاتارینا: بەڵێ تووشی بووم! بەس ... ئینجا؟ پرسیارەکەت چییە؟تۆ دەبێت بڵێیت پرسیارەکەت چییە، چونکە ئەمە گرنگە. من دەتوانم لە بەشێکی ئەو ڕەخنەیە تێبگەم، هەندێك لێڵی و ئاماژە و پەڕاوێزی لە نووسینەکانمدا هەیە بەڵام ئەمە تەنها بەشێکی ڕاستییە. ئەوانەی پێداگیری لەوە دەکەن کە نووسەرێتی من نارۆشنە و دژی دەوەستن، بە دڵنیاییەوە، هەرگیز زۆر و بەتایبەت شتی منیان نەخوێندووەتەوە. ڕەنگە کتێبێکمیان هێنابێت، چاوێکیان بە چەند پەڕەیەکیدا خشاندبێت و لایان سەیر بووبێت. هەڵبەتە لە نووسینەکانمدا زۆر ڕوونی و کراوەیی و پوختیش هەیە.

ـ ئەی بۆچی ئەو ئاڵۆزی و کەنارگیرییانەشی تێدایە؟

کاتارینا: وەڵامەکەی ئاسانە، من دوای ئەو هەست و بیرانە دەکەوم کە لەپڕدا و لەخۆوە بۆم دێن، لەبەر ئەوەیە شیعرەکان ئاوا دەبن. هەمیشە ڕێگام بە خۆم داوە ئەمە بکەم و لەو باوەڕەشدام کارێکی باش دەکەم چونکە ئەمە وا دەکات نووسەرێتی ڕێچکەی جیاواز بگرێتەبەر. نووسین تێکەڵەیەکە لە ویست و بیر بۆهاتن. چالاکی و ناچالاکی. پێموایە پێویستە لە ناویدا شتی ناقۆڵاش هەبێت کە لە ناو مرۆڤیشدا هەیە. ئاخر لە ناو ئێمەدا کۆمەڵێ زمان هەن، زمانی ڕێکنەخراون. من لەو



کەسانە تێدەگەم کە دەڵێن شیعرەکانت قورسن بەڵام ئایا ناتوانن بڵێن تایبەتن یاخود خۆکردن؟

لە دەرەوەی ڕیستۆرانەکە خۆر لە ئاوابووندایە و ڕووناکی خەریکە ون دەبێت بەڵام کاتژمێر تازە دەبێتە چوار. کاتارینا فرۆستێنسۆن لەسەر قەنەفە چەرمە ڕەشەکە هەڵدەسێ و بەدەم تەماشاکردنی دەریاکەوە دەڵێت:

ـ ئێستا دنیا تاریک دادێت، مەحشەریش لەسەر ئاوەکەیە! دیمەنەکە بەڕاستی جوانە ...

خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی سێ ڕێگا

لە کتێبی سێ ڕێگا دا کاتارینا فرۆستێنسۆن دەربارەی خەم و نیگەرانی دەدوێت. بە بۆچوونی ئامێلیێ بیۆرکی نووسەر و لێکۆڵەر، ئەم کۆشیعرە لە جوانترین ئەو کتێبانەیە کە خوێندرابێتەوە و پێیوایە هیچ شاعیرێك ئەوەندە بە پەرۆشی نەینووسیوە!

ئامێلی دەنووسێت: من هەمیشە باوەڕم بە کاتارینا فرۆستێنسۆن هەبووە بەڵام نەمدەزانی بە هونەری سێ ڕێگا کەی دەمگرێنێت.
با دروست لەو شوێنەوە دەستپێبکەم کە کتێبەکە لەوێدا دەستپێدەکات.

نووسراوە، شاعیرەکە لەبەردەم تابلۆی شیعرە شێواوەکەدایە. تابلۆیەکی ڕاستی کە شیعری "هێگشتێن"ی فرۆستێنسۆنی لەسەر نووسراوە. ئەم تابلۆیە، پێشتر وەك بەشێك لە کاری پرۆژەیەکی ڕۆشنبیری دروستکراوە. ئێستا کەسێك خەتی ڕەشی پانی بەسەر هەندێ وشە و پیتی کۆپلە شیعرەکەدا هێناوە، بە جۆرێك کە تەنها چەند وشەیەکی لێ دەرچووە و دەکرێت ئاوها بخوێنرێتەوە:

”تاریك بوو، دایکەکەی
شتێکی وا
کە بوو“

ئەم تابلۆ ڕەشکراوەیە، دەبێتە خاڵی یەکەم و سەرنجکێشی هۆنینەوەیەکی هونەرمەندانە. وەك جێگایەك دەتوانیت بۆی بگەڕێیتەوە و سوتەمەنی خەیاڵکردنێکی لێوە بهێنیت، کە ژیانی منداڵی و دڵنیایی دایك بهەژێنێت، هاوکاتیش بتگەیەنێتەوە بە خود و نووسین لە وەختێکی زوودا.

دیارە تێکدانی شیعرەکە، خانمە شاعیرەکە نیگەران دەکات بەڵام زویربوونەکەی لەوەی کەسێك دەستی چووەتە ئەوەی ئەو تابلۆیە بشێوێنێت، زوو دەگۆڕێت بۆ هەندێك تێگەیشتنی ئەرێنی و گرنگ دەربارەی پەیوەندی نێوان ئێستا و نەخێر و بنەماکانی زمان و گۆڕینی زمان لە کارەکانی سەردەمی زوویدا.

فرۆستێنسۆن زۆر جار لە شیعرەکانیدا توڕە بووە. ئێستاش بەزمانی منداڵێتیی، ئەو کۆپلەیەی لەبیرەکە دەڵێت؛

”دەستەواژەیەکی وشکی وەك پشکۆ،
لەناو دەمدا ماوە،
دەتوانێت تفی بکاتەوە و ببینێت،
لەسەر کێڵگەکە دەکوژێتەوە و دەمرێت.“

لێرەدا ئەو دەبێتە ئەو منداڵەی لە دۆزەخێکی بەردەوامدا، هەمان وشە دووبارە دەکاتەوە، هەتاوەکو ئاگرەکە لە سووتانیدا، کز و خامۆش دەبێت.

فرۆستێنسۆن شێتی وشەیە، شەیدای دەنگ و بۆنیانە بەڵام ئەو لەمامەڵەکردنی وشەدا، لەوەدا سەرکەوتووترە کە کارئەکتەر بداتە وشەکان و نواندنیان پێ بکات، نەوەك قسەیان لەبارەوە بکات و شەیداییەکەی پێیان بکاتە تێگەیشتن.
لە کتێبی "کەللەسەرەکان"یدا کە بە هاوبەشی لەگەڵ ئاریس فلۆرێتۆس دا ساڵی ٢٠١١ چاپیکردووە، توانای دیاریکردنی سنووری شیعر و پەخشان نابینرێتەوە، وەلێ ئاشکرایە لە زمانەوانیدا دەکرێت وشە بە دڵنەواییەکی لەسەرخۆوەی اخود بە هەستی ئەسیرکردنەوە بێتە ناو دێڕەکانەوە.

لە بەرامبەر تابلۆ شیعرییە شێواوەکەدا، کاتارینا دەگاتە ئەوەی بڵێت: ”لە ناو هەمموو کۆمەڵە شیعرێکدا، کۆشیعرێکی بچووکتر هەیە، کە بۆ ئەو کەسەی نووسیوییەتی بەرهەستە.“
ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە شیعرێکی دی لەناو شیعرێکدا دەرکەوتووە کە شێواندنەکەی بژاریکردووە؟! دەگەڕێمەوە بۆ شیعری "هێگێشتێن" لە کتێبی "بیرکردنەوەکان"دا کە لە ساڵی ١٩٩٤دا دەریکردووە. شیعرە پارچەکراوەکەی



سەر تابلۆکە بەراورد دەکەم بە تەواوی شیعرەکە و خەت بەژێر ئەو وشانەدا دەهێنم کە ڕەشکرابوونەوە:

”کچەکە تاریك بوو، دایکەکەی خەمگین.
ئیشتیاقێکی وا کە هەستی پێبکەیت،
لە بەردێکدا بوو،
کە هەم گەرم و هەم سارد بوو.“

لە دێڕی ناوەڕاستدا، دەست تێوەردانەکە زیاتر سەرنجڕاکێشە، چونکە نیوەی پیتەکانی "ئیشتیاق" ڕەشکراوەتەوە و لە پیتە هێڵراوەکانی وشەی "شت" ماوەتەوە.
بەڵێ دەستتێوەردانەکە لە ناوەندەوە دەپێکێت، لایەنی کەم لە ڕووی خوێندنەوەی منەوە بۆ ئەم کتێبە، کە پێموایە لە سەرەتاوە باسی دایك دەکات کاتێك موشتاق دەبیت بۆی، پاشان بەتەمەندا چوون و مردن دەبێتە شت؛ ئەمەش بە واتای بوونی ڕۆحلەبەرەکان بە بێگیان، کاتێك وەك بکەر کۆتایی دێت و لەگەڵ تەنی مردوودا دەبیتە یەك. تاسەکردنی مردن و مردوو بەجێمانی بکەرێکە لە هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی ئەو گواستنەوەیەدا.

هۆنینەوەکان لە کتێبی سێ ڕێگا دا، دەکرێت وەك سێ جۆر دەربڕینی نیگەران بخوێنرێنەوە. وەك وتمان بەشی یەکەم، یادەوەری دایك لە سەردەمی منداڵیدا بەئاگا دەهێنێتەوە. بەڵام بەشی کۆتایی هۆنینەوەکە دەکرێت شێوەدان بێت بە دۆخێکی نائاسایی لە وێڵبوون و دڵدانەوەدا، ئەمەش لە گەشتێکدا بەناو هەستیاری خاکی چارەنووسدا... هەروەها کاریگەریی، هونەری شڵەژێنەری "تزیان مارسیاس" کە پێشتریش لەلای فروستێنسۆن شێوەی پێدراوە، لەم پەرتوکەشیدا دەبینرێت.

لە ناوەڕاستی زنجیرە نووسینەکەدا، دەقێك بە ناوی "کەنارەکانی دەریا"، شیعریانەترین تێکستێتی. لەوێدا، لەو بۆشاییە بەئازارەدا کە لە نێوان شوێنی نووسەرەکە و مردووەکە دا هەیە، نووسەر زیاتر لە نزیك مردن و کۆتاییپێهاتنەوە دەوەستێت. لە لایەکەوە لە ناو ڕەشەبادا هاوار لەدەست دەدات و لە لایەکی ترەوە لە خودی کەمبونەوەی شتەکان خۆش دەبێت.

شوێنەکە کەنار دەریایەکە، لەوێ ئەو وەك مردووە نائامادەکە، کە دەشێت دایکی بێت، هەمیشە ئەو شتانە کۆدەکاتەوە کە دەریا هێناونی. بە پێی ئەم نووسینە، فرۆستێنسۆن،

کتێبی "کەنارەکان"یشی کە ساڵی ١٩٨٩ چاپ بووە، لەو خاڵەوە هاتووەتە بوون.

لەم کۆشیعرەدا، من شاعیرەکە دەبینم بە پاڵتۆکەیەوە، بە ڕاماوی بەرەو دەریاکە دەچێت؛ دەیبینم بەلادا دێت و دەکەوێت، قەپ لە لمەکە دەگرێت و دەگری و ڕوومەتی لەسەر بنچکە گیایەك دادەنێت.

ئەمە ئیشتیاقی بێئومێدی ئەوە، کە بە مەنەلۆگێکی بەڕێتم باسی لێوە دەکات. بەڵام ئەمە داهاتووی خودی منیشە کە دەیخوێنمەوە، بۆیە فرمێسك لە دڵمەوە فشار دەکات. لێرەدا سروشت دێتە ناو کۆبوونەوەکەمان و "شت"ەکانی بۆ پڕکردنەوەی کەموکوڕییەکانمان پێشکەش دەکات. ئەوەتا دەزوولە تاریکەکانی سەر لمەکە و چڵە دارە کەنارگرەکان، بۆ ساتێك باس لە ژیانی هەڵاتووی دایکمان دەکەن:

"ئازار، بەبێ ئازار پەیدا دەبێت،
هەر وەك ئەو لقە دارانەی
حەزت دەکرد کۆیان بکەیتەوە.
ئازیزترین دەست،
چوون چڵە سنەوبەری چەماوە،
پتر نوشتاوەتەوە."

ئەم زنجیرە شیعرە لە شێوازی خۆیدا، وەستانە لەو پڕۆسەیەدا کە تیایدا من دەبێتە سروشت. دەوێرم بڵێم، ئەمە لە جوانترین و بزوێنەرترین ئەو کۆدەقانەیە کە خوێندومنەتەوە. پێشتر هیچ کتێبێك بەم ئەندازەیە خزمەتی ئەدەبیی بە دایکی کچ نەکردووە. یادەوەری هیچ شاعیرێك لە نووسیندا، ئەمەندە پڕ پەرۆشی نەبووە، ئەگەرچی نووسەران "ئێڤا ڕیونێفێلت" و "شیێل ئێسپمارك"یش پێشتر لەم بارەیەوە کتێبی بەهێزیان هەبووە، بەڵام وەك دەبینین لەسەر خاکەکان، ناسکیی وشە، گۆرانی ژیانی نوێ دەچڕێت...

سەرچاوە
DN.SE & GP.SE







# " تەنها عاشقەکان بەزیندووی دەمێننەوە "

## نوێترین فیلمی جیم جارموش

ئاودێر کاکەی فەلاح

سەرەتای ٢٠١٤

بێگومان دروستکردنی فیلمی سەربەخۆ لەهەرلایەك بێت لە دونیادا، کارێکی ئاسان نییە. فیلمێك کە بەرهەمهێنەر و بڵاوکەرەوەی یەکێك لە کۆمپانیا گەورەکانی فیلم نەبێت، زۆر سەختە کارێکی وا لەدایك ببێت، ئەگەر ببێتیش، ئەوا بڵاوبوونەوەی زۆر سنوردار دەبێت و زۆربەی کات لەچوارچێوە تەسکەکانی هەرێمێکدا دەمێنێتەوە.

لەهەموو شوێنێکیش سەختتر بۆ هەڵسان بەکارێکی وا، دروستکردنی فیلمێکی لەم جۆرەیە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا. بوونی هۆڵیوود لەو وڵاتەدا بەشێوەیەکی زۆر ترسناك بەسەر هەموو بوارەکانی چۆنێتی فیلم دروستکردندا زاڵە، جا هەر لە بوارە پیشەسازییەکەیەوە بیگریت، تاکو لایەنی کولتوری و قبووڵکردنە کۆمەڵایەتییەکەی. ئەم باڵادەستییە هەناسەی لە فیلم و فیلمسازە سەربەخۆکان بڕیوە و هەموو ژێرخانێکی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کارە هونەرییانەی لێسەندونەتەوە. هەمیشە ئەو سیناریۆ و بیرۆکە فیلمیانەی کە لەگەڵ شێوازی گێڕانەوە باوەکانی سینەمای هۆڵیوودیدا نەگونجابن، لەلایەن کۆمپانیا گەورەکانی هۆڵیووددەوە ڕەتکراونەتەوە و یارمەتی نەدراون.

فیلمسازێك کە بتوانێت لە ژینگەیەکی وا دژواردا فیلمی سەربەخۆ دروستبکات، جا چ لەڕووی داراییەوە بێت یان لەڕووی ناوەرۆکەوە، هەڵبەتە جێی گرنگی پێدان و لەسەر وەستانێکی زیاترە. ئەو فیلمانە وەك دارێك وان لە دەرەوەی ژینگە سر و شتییە کە ی خۆیان بڕوێن، هەمیشە لەگەڵ هێزە دژوارەکانی دەوروبەریاندا لە شەڕدان.



هەڵبەتە لێرەدا لە کاری ڕوانەکەش گرنگتر ئەوەیە، کە دارەکە لەو سروشتە نوێیەدا بتوانێت بەری هەبێت و تەنانەت میوەکەشی بەتام بێت !

یەکێك لەو کەسە کەمانەی کە فیلمەکانی هەموو ئەو خاسڵەتانەی تیادا کۆبووەتەوە، فیلمسازی ئەمەریکی ناودار جیم جارموشە. ئەم هونەرمەندە وا بۆ زیاد لە سی ساڵ دەبێت بەبەردەوامی دژی شەپۆلی توندی سینەمای هۆڵیوودی مەلەدەکات و لەوانەیە لەڕۆژگاری ئێستاماندا تەنها فیلمسازی ئەمەریکی ناودار بێت کە بەفیلمە سەربەخۆکانی توانیبێتی شوێنپەنجەی بە مێژووی سینەمای ئەمەریکییەوە دیاربێت.

**تەنها عاشقەکان بە زیندووی دەمێننەوە**
**Only Lovers Left Alive**

دواهەمین فیلمی سینەمایی دەرهێنەرە و بەیارمەتی چەند وڵاتێکی ئەوروپی بەرهەمی هێناوە. جارموش زیاد لە حەوت ساڵی پێویستبووە بۆ ئەوەی بودجەی فیلمەکەی دابین بکات. لە چاوپێکەوتنێکدا دەرهێنەر باسی سەختی پارەپەیداکردن بۆ فیلمی





سەربەخۆ دەکات و ڕەشبینانە تەماشای داهاتووی فیلمی هونەری لە ئەمەریکادا دەکات.

فیلمەکە چیرۆکی خۆشەویستی دوو بوونەوەری خوێنمژە (ڤێمپایەر: ئەو بوونەوەرە فەنتازیانەن کە خوێنی مرۆڤەکان دەمژن، بەڕۆژ ناتوانن بێنە دەرێ، تەنها بە شەو چالاکن). ئەم دوو بوونەوەرە نەمرە کە چەند سەدەیەك دەبێت یەکتریان خۆشدەوێت، ئێستا دوور لەیەك لە دوو کیشوەری جیاواز دەژین. پیاوەکەیان کە ناوی ئادەمە لە ئەمەریکا لە شاری دیترۆیت دەژی، ئیڤای خۆشەویستی لە باکوری ئەفریقا لە شاری تەنجەی مەغریبی گیرساوەتەوە. هەرچەندە هەزاران کیلۆمەتر لەیەکەوە دوورن، بەڵام ڕۆژانە لەڕێگای ئینتەرنێتەوە پێکەوە قسەدەکەن. کاتێك ئیڤا هەست دەکات کە ئادەم زۆر لە خۆی و لە دونیا بێزارە و کەوتووەتە ماتەمینییەکی گەورەوە، بڕیار دەدات بەپەلە بە مەبەستی دڵنەوای دانەوە سەفەر بۆ لای خۆشەویستەکەی بکات. جارموش لە پاش بەیەك گەیشتنەوەی ئەم دوو بوونەوەرە، هارمۆنییەت و لەیەك تێگەیشتنی ئەم دوو عاشقەمان لە چەندین دیمەندا زۆر بە ڕوونی پێشاندەدات. ئادەم وەك وتمان لە شاری دیترۆیت دەژی، شەوانە لەگەڵ ئیڤادا دەچنە دەرەوە و شارە وێران و چۆڵەکەی پێشانی خۆشەویستەکەی دەدات. ئادەم کە خۆی موزیکژەن و کۆمۆنیستە، سکاڵای نەمانی کولتور و نزمبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری مرۆڤەکان لای ئیڤا دەکات (کە بە زۆمبی ناویان دەبات). لە دیدی ئەوەوە هەموو ئەو دەستکەوتە شارستانی و



کولتوریانەی ڕابردوو، وردە وردە هەڵدەوەشێنەوە و ڕوو لە نەمان دەکەن.

وەك ئاشکرایە شاری دیترۆیت یەکەم میترۆپۆلی گەورەی جیهانە کە بەفەرمی ئالای لاتبوونی بەرزکردۆتەوە. سەیرە بۆ شارێکی وا کە تا چەند ساڵێکی کەم لەمەوبەر سەنتەرێکی هێجگار گرنگی پیشەسازی سەیارە بووە، هەروەها سەنتەرێکی گرنگی کولتور و موزیکی سۆڵی ئەمریکی بووە. جارموش دیترۆیت وەك شاری جنۆکەکان پێشان دەدات، چۆڵ و ڕووخاو و تاریك.

یەکێك لەو شوێنانەی کە سەردانی دەکەن هۆڵی (مێشیگن سیەتەر) ە، کە لەسالانی بیستەکاندا هۆڵێکی سینەمای بەناوبانگ بووە و زیاد لە چوار هەزار کەس جێگایان تیادا بووەتەوە، بەلام ئێستا چۆڵکراوە و کراوە بە پارکی سەیارە !

لە چاوپێکەوتنێکدا دەرهێنەر باسی هۆی هەڵبژاردنی دیترۆیت بۆ فیلمەکەی دەکات و ئەم شارە وەك هێمایەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیمپڕاتۆریەتی ئەمەریکی سەیردەکات. دیترۆیت بە بەڵگەی بێبەزەیی ئەمەریکا ناودەبات، هەر پارچەیەکی بە پێی پێویست کاری خۆی نەکات، دڵڕەقانە وازی لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێت.

ئەم دوو بوونەوەرە بەرەگەز خوێنمژە، بە پێچەوانەی فیلمە هۆڵیوودێکانەوە، چەند سەدەیەك دەبێت وازیان لە خوێن مژینی مرۆڤەکان هێناوە و ئێستا خوێن لە تاقیگەی خەستەخانەکان پەیدا دەکەن. خوێنی پیسی مرۆڤەکان بۆ ژیان و تەندروستییان زۆر مەترسیدارە، بۆیە وەك وتمان تەنها خوێنی پاکی تاقیگەکان دەکڕن. پیسی ژینگە و لەناوچوونی شارستانیەت و فەوتانی کولتور، تەوەرە گرنگەکانی فیلمەکەن و هەروەها ناوەرۆکی زۆربەی دیالۆگەکانی نێوان ئادەم و ئیڤان. بەپێچەوانەی فیلمە ترسناکەکانیشەوە، ئەم دوو بوونەوەرە مایەی ترس نین و بەزۆر و زەبەنگ خوێنی مرۆڤە داماوەکان نامژن و نایانکوژن، بەڵکو بوونەوەرێکی کولتور پارێزن. سامانە کولتوری و فیکرییەکانی خۆیان و مرۆڤەکان، لە مرۆڤەکان خۆیان دەپارێزن. مرۆڤەکان بە زۆمبی و تێکدەری جوانێکان لە قەڵەم دەدەن.







جارموش ئەم بوونەوەرانە وەك شایەتێکی خوایی بەکاردەهێنێت. لەبەئەوەی تەمەنیان لەوانەیە لە هەزار ساڵ زیاتر بێت، بۆیە هەر ئەوانن کە شایەتێکی ڕاستەقینەی دروستبوون و گەشەکردن و لەناوچوونی دەستکەوتە مرۆڤایەتیەکانن. لەبەر نەمربوونیشیان شتێکی ئاساییە کە زیاتر بە پەرۆشی دونیاوە بن و خەمخۆرێکی گەورە بن. مرۆڤەکان کە تەمەنیان دیاریکراو و کورتە، ئەو توانا خواییەیان نییە و ڕەهەندی بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتیان وەك تەمەنیان کورتخایەنە.

جیم جارموش وا بۆ جاری سێهەمە ژانرەیەکی سینەمایی تایبەت بە شێوەیەکی تەواو جیاواز بەکاردەهێنێت. هەروەك چۆن لە فیلمی (دێد مان) دا سوود لە ژانرەی فیلمی کاوبۆی وەردەگرێت، بەڵام فیلمێکی تەواو دوور لە فیلمە باو و کلاسیکییەکانی سینەمای وێستەرن دروستدەکات. هەر ئاواش لە فیلمی (گۆست دۆگ) دا، شاکارێکی تەواو شاعیرانە لە ژانرەیەکی ڕەقی فیلمی پۆلیسی و تاوان دێنێتە دەرێ.




لەم فیلمە نوێیەشیدا هونەرمەند هەر بە هەمان شێوە ژانرەیەکی سینەمایی وەك فیلمی ترسناك و فیلمی ڤێمپایەر بە شێوەیەکی تەواو (جارموشییانە) بەکاردەهێنێت و کارێکی هونەری دانسقەی لێدروست دەکات.

جارموش ئەم جارەش ژانرە سینەماییەکان وەك چوارچێوەیەك بۆ کۆکردنەوەی وێنە فیلمەکانی خۆی بەکاردەهێنێت. ئەم فۆرمە سینەماییانە تەنها بیانویەکن لە ڕێگایانەوە چیرۆکی فیلمەکانی پێدەگێڕێتەوە. هەرچەندە چیرۆکی فیلمەکەی

ئەمجارەی لە ڕاستیدا زۆر ساکار و کەم ڕووداوە. بەڵام هەڵبەتە گێڕانەوەی چیرۆك بە مانا کلاسیکییەکەی مەبەستی سەرەکی ئەم هونەرمەندە نییە، بەڵکو زیاتر فیلمەکەی پێشاندانی بارودۆخی ژیانە لە کاتی ئێستاماندا. بیرکردنەوەیەکی پڕ پرسیارانەیە لە بارەی چۆنێتی ژیانمان و هەروەها چۆنێتی مامەڵەکردنمان لەگەڵ دەستکەوتە مرۆڤایەتی و کولتوریەکانماندا.
(تەنها عاشقەکان بە زیندوویی دەمێننەوە) زەنگێکی وریاکەرەوەیە، بەوەی ئەگەر ئاگامان لە خۆمان نەبێت، وەك زۆمبێکانمان لێ دێت، کە تەنها خەمی ئێستا و خەمی تێرکردنی ورگی خۆیانن.





# مەحموود مۆتەقیدی
## شاعیری هاوچەرخی ئێران

و. سازاندنی وتویژ: بابەك سەحرانەوەرد

دەسپێك:
مەحموود مۆتەقیدی لەدایکبووی ساڵی1946 لەباکووری ئێرانە و ئێستا لەگەڵ خاوخێزانی دانیشتووی تارانی پایتەختە. لەسەرەتای ساڵی1970 وە تا ئێستا چل ساڵە ئەنووسێت و خاوەنی بیست و پێنج کتێبە لە بواری شیعر و رەخنەدا. مۆتەقیدی لەڕیزی ئەو شاعیرانەیە کە بە شاعیرانی"حەفتاکان" ناسراون و شێوازێکی تازەیان لەشیعردا داهێناوە. لەم وتویژەدا، مۆتەقیدی لەمەڕ کۆمەڵێك پرس و پەیوەندییان بە شیعر و ڕەخنەی ئەدەبی و ئەرکی رۆشنبیرەوە ئەدوێت.



هەندێك لە بەرهەمە چاپكراوەكانی:

وەرزی خەونە ونبووەكان/ كۆمەڵە شیعری كورت. دەزگای تەوسەعە **1376**.

دەستێك لە نێوان پەنجەرە و باراندا / كۆمەڵە شیعر، دەزگای چاپار **1380**.

ئەڤین لە تەراتێندا بەردەوامە/ كۆمەڵە شیعر، دەزگای چاپار **1381**.

لەتە قەدەغەكراوەكان/ كۆمەڵە شیعر، دەزگای رۆژگار **1387**.

جیهانە لەتلەتەكانی نەسرەوتن/ كۆمەڵێك وتاری رەخنەیی، دەزگای تەندیس **1388**.

هەورەكان بێدەنگن/ كۆمەڵە شیعر، دەزگای ئۆردیبەهێشت **1390**.

بە كەڵەكێوییە تینووەكان چ شتێك مەڵێ/ كۆمەڵە شیعر، دەزگای ئەمرود **1391**.

بابەك سەحرانەوەرد: دۆستی هێژا، وێڕای سوپاس بۆ ئەم گفتگۆیە. ئەگەر ژیانی مەحموود مۆتەقیدی لە سەرەتاوە تاكو ئێستا چەشنی فیلمێك لێی بنواڕین، ئایا زیاتر بۆ كام دیمەن و وێنەگەلێك ئاوڕدەدەنەوە و لە پەراوێزی ئەم دیمەنانەدا چ شتێكتان پێیە بۆ ئێمەی بدركێنن؟

مەحموود مۆتەقیدی: زۆر سروشتییە هەر مرۆڤێك لە رووپەڕی ژیاندا، بە هەوراز و نشێوگەلی بەرفراواندا بەرانبەر ببێتەوە. منیش وەك هەر مرۆڤێك لە بواری ژیاندا بەردەوام بە مەسەلەگەلی جۆراوجۆر و ئاڵۆزەوە بەرانبەر بووم. چونكە لە هەر قۆناغێكی ژیانی شاعیردا سێكانسی جۆراوجۆر دێنە سەررێی ئەم بوونەوەرە پڕ لە هەستە. ئەگەر ئەم ژیانە، چەشنی فیلمێك بنواڕین، دیارە لە ئازار و خۆشی لێوانلێوە و هەر كامیان بەڕاژەیەكی تایبەتەوە گرێدراون. لەم گۆڕەپانە بەرینە، بۆ من رۆژگاری خۆشی و سەربەرزی ئەو كاتە بووە كە لە دەڤەری كەلتووریدا سەركەوتوو بووم و ئەم لەزەت و چێژە بەردەوام لە ژیانی تاكەكەسیم رەنگی داوەتەوە و قەتیش لەبیرم ناچنەوە. من هەمیشە خەریكی ئەزموون كردنم و لە كەڵكەڵەی شوناسكردنی خۆم و جیهانی دەروونم بەردەوامم. هەر چەند ئەوە ڕەخنەگرانن كە دەبێ لە سوچگەلی جیاجیاوە لەمەڕ شیعر و نووسینەكانم داوەری بكەن و بینرخێنن. بەڕای من بۆ هەبوون و ئافراندن چارەیەك نییە. دەبێ بە تێفكرین ژیان بەسەر

بەرین و قۆڵ هەڵکەین و کاری گرینگ بگرینە ئەستۆ.

بابەك سەحرانەوەرد: بەڕای ئێوە شاعیرە لاوەکان دەشێ لەگەڵ ئەدەبی کلاسیکی هەزارساڵەی ئێران ئاشنایەتییەکی چڕوپڕ بسازێنن و لە کانییە ڕوونەکەی ئەم ئەدەبە بەهرەمەندبن، یاخود بۆ بوون بەشاعیربوون پێویستیان بەم ڕێگە پڕپێچ وپەنا و ناخۆشە نییە و تەنیا خوێندنی ئەدەبی مۆدێڕن و پۆستمۆدێرن کە ئەم ڕۆژانە بووەتە دابێکی باو بەسە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم بۆشاییە؟

مەحموود مۆتەقیدی: ناساندن و تێڕوانین لە کەلتوور و ئەدەبی ڕابردوو و کلاسیك پێویستییەکە بۆ هەموو دەسپێکردنێك. بەتایبەت لە گۆڕەپانی ئەدەب و هونەردا، نووسەران و هونەرمەندان دەبێ لە بەرهەمێن دیتران و کەلتووری کۆنینە و ڕابردووی خۆیان ئاگادار بن و لێی ڕابمێنن و بە ڕوانگەیەکی بەنرخ لەم بوارەدا خۆیان تەیار بکەن، لەم دەڤەرەدا مرۆڤ بە ئاسۆگەلێکی بەرین بە شێنەیی نزیك و نزیکتر دەبێتەوە. کەواتە، شاعیرە گەنجەکان لەم بوارەدا، بەبێ شوناسکردنی ڕابردوو، بەبێ ئاشنابوون و تەیاربوون لەم ئەدەبە، ئەو تین و هێزە لەخۆیان شك نابەن کە بە یەکەم هەنگاو باز بدەنە نێو جەرگەی خەللاقیەت و هەر زوو ببنە شاعیرێکی بەناو و دەنگ. تەنیا لە ڕێی خوێندنەوەی بەرهەمی دیتران و تێڕوانین و ناسینی کەلتووری خۆماڵی و زگماگییەوە دەتوانین بچینە نێو گۆڕەپانی ئەم دنیایەوە. دیارە گوتەزاری نوێخوازی پێویستیی بە درێژەدانی ژیانی ئەدەبی و هونەریی هەیە تاکو بتوانێت هاوشان بێت لەگەڵ ئەدەبی دنیادا. بە لاسایکردنەوە تەنیا بە هەڵەدا دەچین و بەلاڕێدا دەڕۆین. ئەو شتەی کە لە فەزای ئەمڕۆی شیعردا خۆی بەرجەستە کردووە، بنە و بنەچەیەکی دیار و ڕاستەکی نییە. کەواتە بۆ هەمیشەبوون دەبێ ئەمرازەکانی ئافراندن بناسین و لەجێگەی شیاوی خۆیان بەکاریان بهێنین و لاف و لوتبەرزی بخەینە لاوە. لەئەنجامدا ئەو شتەی کە لێرەدا شیاوی باسە ئەوەیە کە فەزای شیعری هاوچەرخ هێندە باش و بەجێ نییە. شاعیرە لاوەکان دەبێ بۆ ئەمڕۆی خۆیان بە ڕیشە و ڕەگەزی ئەزموونە سەرکەوتووەکاندا بچنەوە و لە کۆکردنەوەی ئەزموونی دیتران بەردەوامبن و ڕێگاگەلێکی تازەتر هەڵبژێرن، هەروەها بە پشتکار و تەقەلای زۆرەوە لەم بوارەدا کاری





گرینگ بکەن و لە خوێندنەوە بەردەوامبن. چونکە بە شەوێك نابنە شاعیرێکی گەورە و خاوەن دەنگ.

بابەك سەحرانەوەرد: جۆرە ڕوانگەیەکی عیرفانی بەشێوەی عیرفانی ژاپۆنی و بە تایبەتیش لە پێش ڕاپەڕینی 57ی ئێران لە لای شاعیرێکی وەك سوهراب سپێهری برەوی پەیدا کرد و بووە بە خاڵ و مەرجێکی سەرەکی لە تەواوی شیعرەکانیدا. تەنانەت سوهراب بۆ ڕوونکردنەوەی شیعرەکانی پەنا دەباتە بەر بیر و بۆچوونی عارفێك بەناوی کریشنا مۆرتی. بەڵام بەر لە سوهراب شاعیرانی ئەو سەردەمە وەکو فروغ و شاملو لەم جۆرە ڕوانینە خۆیان دەپاراست، بە پێچەوانەی سوهرابەوە نیشکی شیعرەکانیان لە چەقی ناتەبایی و نالەبارییەکانی کۆمەڵگەوە ئەهێنا. ئایا هۆکارگەلی ئەم نیگا مەعریفییە لەلای سوهراب لە چ ڕوویەکەوە بوو؟

مەحموود مۆتەقیدی: بۆ وەلانانی ئەم پرسە پاش هەر شتێ دەبێ بڵێم شاعیر زادەی سەردەمی خۆیەتی. کەواتە، شاعیر بۆ دەربڕینی پەیڤ و خولیاکان و پەیداکردن و بژاری نیگای ڕخنەگرانەی خۆی ناچارە دەست بداتە هەژماردنی ڕێگەگەلی تەبا و ناتەبا و بەشێوەیەکی گشتی و جۆراوجۆر، هەروەها دۆزینەوە و کەشفی واقیعە جیهانییەکانی دەوروبەری. سپێهری لەڕووی ناساندن و هۆگرایەتی بە عیرفانی رۆژهەڵاتی، ئەو ڕێگایەکی بۆ خۆی دەستنیشان کردبوو کە جوانیناسییەکەی ڕێگەی ئەو توانایەی پێدابوو کە بچێتە نێو چەقی داهێنانەوە، تەنانەت بۆ شیکردنەوەی جیهانگەریەکەی کەڵکی لێوەربگرێت. بەواتایەکی دیکە سوهراب دەستی دابووە هەژمارکردنی واقیعەکانی پەڕانپەڕی. روانگە و نیگای سپێهری لەمەڕ جیهان، نیگایەك بوو بەتەواوەتی دڵنواڕی "شهودی" و تەژی لە دین و جەزبە و دوور لە فەزاگەلی ناساخ و هەرڕۆژەیی ژیان بوو. لەراستیدا سوهراب بەدرێژایی ژیانی بەدووی نیگایەکی تایبەتەوە بوو. سوهراب بەشوێن دۆزینەوەی ژان و کڵوڵیی و نهێنیگەلی شاراوەی مرۆڤێکەوەیە کە بەردەوام لەخۆیدا نامۆ و نغرۆیە. سوهراب نیگایەکی عیرفانی هەڵبژاردبوو هەروەها خۆش بوونەوەی زام و بێکەسی مرۆڤی دەردەداری لە گەڕانەوە و

تێڕوانین لە دوو چەمکی سەرەکیی بەناوی سروشت و سەفەردا دەبینی. سوهراب لەو بڕوایەدایە کە شیعر دەتوانێ لەم چاخە ناحەزەی ئێمەدا لە وەحشییەتی بێزاری قوتار بکات. سوهراب تا رادەیەکی زۆر ئارا و قارای مرۆڤی هاوچەرخی لە خۆ دوور خستنەوە لەم کۆمەڵگە ترسێنەر و تووڕەیەدا دەبینی. ئامانجی سوهراب ئەوەبووە کە بە شیعرەکانی ژینگەیەك بڕەخسێنێت کە نەوەکانی دوایی بتوانن تێیدا بحەوێنەوە. بەتایبەت لەم ساڵگەلە لە رووی ئەو بارودۆخەی لە ئێران سەریهەڵدابوو، لاوەکان هۆگرییەکی زۆریان بە خوێندنەوەی ئەم جۆرە شیعرانە پەیداکردووە و پێشوازییەکی بەرفراوانیان لێ کردووە، تەنانەت تاقمێك لە شاعیرە گەنجەکان لەژێر کاریگەریی ئەم جۆر زمان و روانگە و فەزایەدا قۆلیان لێ هەڵماڵیوە و لاسایی ئەم جۆر شیعرانە ئەکەنەوە. هەرچەند سوهراب بە شوێن پەیداکردنی مورید و موعجیبیندا نەبووە. سەرباری هەمموو ئەمانە ئێمە ناتوانین بۆ هیچ کەسێك نوسخە و پیلانێکی تایبەت دارێژین کە دەبێ چۆن چۆنی شیعر بنووسێت؟ بۆ شیعر وتن، پێوەرگەلی ئالۆز و دژوار هاتونەتە ئاراوە. چونکە نیگای هەر شاعیرێك، لەگەڵ شاعیرێکی تردا جیاوازە و هەر کام لە سووچ و روانگەیەکی تایبەتەوە لە چەمکی شیعر و ژیان دەڕوانێت.

بابەك سەحرانەوەرد: ئێوە کتێبێکتان بە تەواوەتی لەسەر ناساندن و لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی ئیسماعیل خوویی تەرخان کردووە. چۆن چۆنی بوو ئەم پەرتوکەتان نووسی و لەبنەڕەتەوە چ مەسەلەگەل یان کەڵکەڵەیەك بووە هۆی ئەوەی ئەم پەرتوکە بەسەردێڕی ناوی خوویی بڵاوبکەیتەوە؟

مەحموود مۆتەقیدی: لە پەنجاکاندا ئەو کاتە خوێندکاری زانستگابووم ئیسماعیل خوویی مامۆستام بوو و دواتر لەگەڵی بوومە هاوڕێیەکی نزیك، هەروەها لە ڕێکخراوی توێژینەوەکان کە سەر بە وەزارەتی زانست بوو لەگەڵیدا بوومە هاوکار. ئەم نزیکایەتییە بووە هۆی ئەوە زۆر شتی لێوە فێربم و هەڵسوکەوتی زۆرتری لەگەڵدا بکەم. بەداخەوە لە شەستەکاندا مەنفای گرتەبەر و دەرەنجام لە وڵاتی بریتانیا گیرسایەوە. من زۆر شتم لەمەڕ ئەو دەزانی بەڵام هەلێك نەدەڕەخسا تاکو بتوانم لەمەڕ شیعرەکانی بکۆڵمەوە و بیخەمە بەر ڕەخنە و لێکۆڵینەوە. تا ئەوەی کە بە پێشنیاری دەزگای





سالس و بەیارمەتی کچەکەی "سەبا خوویی" و چەند دۆست و برادەرێك هەوڵمدا کۆی نووسین و رەخنەکان و یادەوەرییەکانی ئەم شاعیرە کۆبکەمەوە. بڕیارمدا بۆ خستنەبەردەستی زانیاری زیاتر بۆ لاوەکان کتێبێك لەمەڕ شیعر و ژیانی خوویی بنووسم. خوویی نزیکەی چل کتێبی لەدەقەری شیعر و پەخشاندا نووسیوە. جەختی زۆرم کردووە تەواوی بەرهەمەکانی کۆبکەمەوە و بیخوێنمەوە و لە یەك بە یەکیان تێڕابمێنم و لەسەریان بنووسم. بەتایبەت لە بەستێنی فەلسەفەدا کە ڕەنگدانەوەی زۆری لە شیعرەکانیدا داوەتەوە. هەروەها بۆ ئەوەی بشتوانم دەستنیشانی پێگە و شوێنگەی شیعرەکانی بکەم لەناو شیعری فارسیدا. دەزانن کە خوویی لە شاعیرانی زمانی خوراسانی و لە قوتابیانی ئەخەوان سالس بووە و بە ڕەوتی شیعری نیمایی و هەروەتر غەزەلدا هۆگرییەکی سەیری پەیداکردووە و زۆریش رمووەدەی ئەم شێوازە بووە. دەرەنجام، دوای دوو ساڵ کتێبێکی **300** لاپەڕەیم نووسی و دامەدەست دەزگای سالس کە بریتییە لە لێکدانەوەی سەرجەم کتێبەکانی، هەروەتر ژیاننامە و وێنە و هەندێك وتار لە نووسەرانی تاراوگەنشین کە لەمەڕ شیعرەکانی خوویی نووسیویانە. ئەم کتێبە لەواقیعدا پشك و ڕۆڵێکی بچووکە لەبەرانبەر فێرکارییەکانی خوویی مامۆستای خۆشەویستم بۆ من.

بابەك سەحرانەوەرد: لەپەرتوکی"جیهانە لەتلەتەکانی نەسرەوتن"دا ڕەخنەیەکی بەپێزتان ئاڕاستەی شیعری شاملوو کردووە و لەسووچێکی تازەوە ئاوڕتان لێداوەتەوە. لەمن وایە شاملووی چل و پەنجاکانی هەتاوی، گەورەترین شاعیری ئەو سەردەمە بووە و شیعرەکانی بەگشتی کەوتوونەتە سەرزاری جەماوەری نوخبە و عەوام. پرسیاری من ئەمەیە کە ئایە شاملوو لەشەست و نیوەی یەکەمی حەفتاکاندا کتومت لە شیعر نوشوستی هێناوە. ئایە لەگەڵ ئەم ڕایەن کە شاملوو لە ئاخروئۆخری ژیانە ئەدەبییەکەی نەیتوانی ئیدی لە شیعردا بەو ترۆپکە دلڕفێنەی جاری جاران بگات یان ئەوەی کە شاملووی چل و پەنجاکان، لەگەڵ شاملووی شەست وحەفتاکان جیاوازییەکی نەبووە؟

مەحموود مۆتەقیدی: بەڕای من شاعیر بەردەوام لە گۆڕەپانی شوێنکاتدا بەجۆرێك لە جۆرەکان لە بارودۆخێکی شاعیرانەدایە. شاملوو بەدرێژایی نیو سەدە ژیانی شاعیرانە، لە فەزاگەلی مۆدێرن و جیاجیادا بەسەر بردووە و هیچ ئەگەر و گومانی تێدا نییە ئەویش وەك هەر کەسێك لە پانتایی شیعرەکانی بە هەوراز و نشێوگەلێکی بەرفراواندا ڕۆیشتووە. سەردەمانێ لە گۆڕەپانی شیعری نیمایی ئەزموونگەری کردووە. هێندەی پێنەچووە لەم دەڤەرە بەرینە تێپەڕیوە و گەیشتۆتە نیگایەکی ئاشقانە و سیاسی کە لەژێر پەنجەی دەسەڵاتی هەراوزەنای شۆڕشی 28ی گەلاوێژی ساڵی 32 گەیشتووەتە شێوازێکی نوێباو و گەش. پاشان لە پەنجاکاندا شیعر بۆ ئەو دەبێتە وەسفی ئەشق و دەنگدانەوەی بیروباوەڕە کەلتووری و کۆمەڵایەتییەکان. لە پەنجاکانەوە هەتا ساڵی 57 هاوکات لەگەڵ ڕاپەڕینی ئێراندا شیعرەکانی بۆن و بەرامەی رەخنەگرتن لە کەشوهەوای ئەو سەردەمە و لایەنگری لە عەدالەتی لێدێت. ئەم قۆناغە بەشێوەیەك بە وەسیەتنامەی سیاسیی شاملوو پێناسە کراوە. هۆنراوەکانی شاملوو لە دوایین ساڵانی ژیانیدا، پتر لە هەر زەمەنێکی تر لە خزمەت ئازادیخوازان و عەدالەت و سکاڵا سیاسییەکاندایە. شیعرەکانی شاملوو لە دوایین قۆناغدا تا ڕادەیەکی زۆر لە کرۆك و هەستێکی تۆکمە مەودای گرتووە و زمانەکەی بە لێشاو بە ئالۆزییەکەی ئەنقەست و تایبەتییەوە گرێدراوە. شایانی باسە شاملوو لە دواین ساڵانی ژیانە ئەدەبییەکەیدا بە فەزایەکی نائۆمیدانە و دڵتەنگی گەیشتووە. بەتەواوی نابێت ئەم شتانە فەرامۆش بکەین کە شاملوو ناوازەترین شاعیری فارسی زمانی ئەم سەردەمەیە و بنە و بنەچەی شیعرەکانی فرە مرۆڤانەیە. دۆسیە ئەدەبییەکەی چەندین تەوەری جیاجیای کەلتووری وەك شیعر، فەرهەنگی جەماوەر و وەرگێڕانی گرتۆتەوە و لەولایشەوە پێگەیەکی بەرزیان بەم کەسێتییە ناوازەیە بەخشیوە کە هەمیشە لەترۆپکدا دەدرەوشێتەوە. پیاوێك کە تووڕەیی و بوێریی لە ئاستێکدا بووە، عەدالەت و ناعەدالەتی جیا دەکردەوە و ئەم چەمکانە بوونەتە نیڤشکی زۆربەی شیعرە بەرزەکانی. بێ دوودڵی شاملوو شاعیرێکی کارتێکەری ئەدەبی ئێرانە و وەك هەر شاعیرێکی گەورە ئەشق و ژیان و مەرگی بە لێهاتوویی و زمانێکی تۆکمە وێنا و وەسف کردووە. لە لایەکەوە شیعرەکانی بوونەتە





وێردی سەر زمان و لەو لاشەوە بونێکی فیعلی و راستەقینەی بە کەسێتییەکەی بەخشیوە. جیهانی شیعرەکانی شاملوو تژییە بە جیهانێکی دەروەست، بە ئازار و سۆزمەندانە. شاملوو گوتەنی: وتە لە نیگای تۆوەوە بیچم دەگرێ.

بابەك سەحرانەوەرد: بەڕای بەڕێزتان بۆماوەیی "جیناتی" شاعیریی و نووسەریی لە زۆر کەسدا هەمیشە بوونی هەبووە، بەڵام دەبێت بیدۆزیتەوە، ئایا ئێوە لەگەڵ ویلیام فاکنەردا هاوڕان کە دەڵێت تەنیا و تەنیا بە عارەق ڕشتن دەکرێ ببینە شاعیر و داهێنەرێکی پەسەندکراو؟

مەحموود مۆتەقیدی: ئەمڕۆکە پسپۆڕانی زانست بۆهەر هەڵسوکەوت و جوڵە و کار و کردەوەی جەستەی دەرەکی لەش و دەروونی مرۆڤ چاویان بڕیوەتە مەسەلەیەك بەناوی "جین". ڕەنگە بکرێ ئەم دۆخە بە جۆرێك بە زەوق و بوێری تاکەکەسی راڤە بکەین. لە کاری داهێناندا بەتایبەت داهێنانی هونەری و ئەدەبی، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ هۆگرایەتی و پێداویستییە دەروونییەکان و بەشێکیشی بە زانیاری و خوێنەواری مرۆڤەوە پەیوەستە. بێگومان مرۆڤی هونەرمەند لە گوزەری زەمەندا هەلی هەرە زۆری بۆ دەڕەخسێت. گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بەو ئەمرازانەی کە لەخۆیدا شکیان دەبا لە یەکەمین هەنگاودا خۆی بۆ شوناسکردن و کەشفی جیهان تەیار بکات تا بتوانێت خۆی بناسێت و بگات بە زەینێکی پێکهاتەمەند لەبەردەم داهێنان و ئافراندندا.

بابەك سەحرانەوەرد: تاقمێکی زۆر پشتیان بەم بیرە ئەستوورە کە شاعیران لە تەواوی ژیانی شەخسی خۆیاندا تەنیا یەك شیعر دەڵێنەوە. نێرۆدای گەورە شاعیر دەیوت شاعیر لە هەموو تەمەنیدا جەخت دەکا هەتا قسەیەك بە باشی و لێهاتوویی بڵێتەوە؟ هەڵوێستی شەخسیتان بەرانبەر بەم پرسە چۆنە؟

مەحموود مۆتەقیدی: بەڵێ، بازنەی زەینی و جیهانی وشەکانی شاعیر بەردەوام لە بارودۆخێك و بە

شێوەگەلی جۆراوجۆردان. زۆربەی شاعیران لە تەواوی ژیانی شاعیرانەی خۆیاندا تەنیا یەك یاخود چەند شیعری بەپێز و هێزیان هۆنیوەتەوە كە پێشوازییەكی هەمەلایەنە و گشتیشی لێكراوە. ئەمەش لەواقیعدا بە هۆكارگەلێكی مێژوویی و بابەتیانەوە گرێدراوە. ئەم دیدە بۆ شیعری تاقمێكی زۆر لە شاعیرانی كلاسیك و هاونەوەی خۆمان ڕاستە.

بابەك سەحرانەوەرد: لە بەرهەمە شیعرییەكانتدا زۆر جار تیشك خراوەتە سەر چەمگەلێكی مرۆڤانەی وەك ئەشق و خۆشەویستی، ژانی هەرمانی و تەنیایی مرۆڤی هاوچەرخ، كە ئەم چەمكانە لە نوێنەرە سەرەكییەكانی شیعری سەردەمی خۆمانن و بە زۆری لەشیعری گەورە شاعیرانێكی وەك (شاملوو فروغ و بیژەن جەلالی) ڕەنگی داوەتەوە لەبەرچی هێندە خوازیاری وێناكردنی ئەم چەمكانە بووی؟

مەحموود مۆتەقیدی: ئەوەی كە وتویەتی شاعیریش ڕۆڵەی رۆژگاری خۆیەتی لەخۆڕا ئەم قسەی نەكردووە. چەمكی ئەشق و مەرگ وەكوو جیددیترین مایە و نقیشكی زەین و زمانی شاعیران دێنە ئەژمار. كەواتە ئەو شتەی لە شیعرەكانی من تیشكیان داوەتەوە دۆزینەوەی نیگای نەوەیەكە كە هەلی بەرفراوانی بۆ ڕەخساوە و لەدەستی چووە. ئەمڕۆكە دەربڕین و وێناكردنی ئەشق و هاوڕێیەتی، نزیكایەتی لەگەڵ سروشت و باسكردن و تێڕوانین لە چارەنووسی مرۆڤی هاوچەرخ، دیمەنی گرینگ و دڵگەش دەخولقێنێت كە من لە زاماوكاری سیاسەت و ئەشقدا، جەختم لەسەری كردووەتەوە، تاكو بتوانم بە ڕاوكردنی سوچگەلێكی تایبەت و دەرەوەست لە هەست و ناخی ژیانی ئەمڕۆ بەوردی بكۆڵێمەوە. ڕاوكردنی چەمكگەلێك وەكو تەنیایی، نامۆیی، ئارمانخوازی و پەرۆشیی مرۆڤ لە هەلومەرجە هەرە دژوارەكانی كەلتووری، منی خستۆتە فەزایەكی تایبەت لە بوون و نەبوون و بەردەوامیش لەم فەزایانە نزیك و نزیكتر بوومەتەوە. لەلایەكی ترەوە كاریگەریی چەند سیمای تیشكدەری شیعری ئەمڕۆ وەكو فروغ و شاملوو بەتاقی تەنیا مەبەستێكی دیكەمان لە هاوتایی و هاودڵیی شاعیران بۆدەهێنێتە ئاراوە. بەڕای من ئەمڕۆكە ئێمە پتر لە هەر زەمەنێكی تر نیازمان بە دەربڕینی پەیڤەكان و كەشفی سووچگەلێكی ئاشقانەیە. چونكە بۆ دۆزینەوەی خۆمان، بەناچار دەبێ لەسەر پێی خۆمان ڕابوەستین و لە بایەخەكان بە شێوەیەكی خۆڕسك بنوارین و هەروەتر لە كەموكوڕی و





زیانەکانی شیعری ئەم چاخە لەسوچی خەسارناسیی کولتوورییەوە تێڕامێنین و چارەسەری بکەین.

بابەك سەحرانەوەرد: چەند دەیەیەکە وەك شاعیرێکی جیددی و چالاك دەرکەوتوون، لە بواری ڕەخنەشدا چەند کتێبێکی بە پێز و هێزتان نووسیوە. لەبەرچی وەك ساڵی ساڵان رەخنەکارمان چەشنی دکتۆر بەراهەنی نەبووە. ئاخۆ ئێوەش پێتان وایە کە قەیرانێك بەرۆکی رەخنەی ئەدەبی گرتووە؟

مەحموود مۆتەقیدی: لە تەوەری رەخنەی ئەدەبیدا، ئێمە چاخێکی بەجێ و باش بەسەر نابەین. ئەو قەیرانە کولتوورییە کە ئەمڕۆکە لەئارادایە، بەرۆکی بە رەخنەی ئەدەبیش گرتووە. چونکە رەخنە بەردەوام لە پاڵ گەشەکردنی ئەدەب پەرە دەسێنێ. لەلایەکیترەوە، فەزای زانستگاکانی ئێمە لە بواری فەرهەنگ و ئەدەب هێندە نەشیاوە کە لەو ئەرکە گرینگەی خۆیان بەلێهاتویی ئاوڕنادەنەوە و بەر لە چەند کاری بەرتەسك ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەگێڕاوە. لەولایشەوە زۆربەی دامودەزگا کولتوورییەکان بەتایبەت لە گۆڕەپانی میدیاکاندا، لەم دەڤەرە کارێکی جیددی و بناغەییان نەگرتۆتە ئەستۆ. لەبەر ئەم هۆکارانە گەشەسەندنی رەخنەی ئەدەبیی پسپۆڕانە و پێگەی رەخنەکاران بۆ کۆمەڵگە نادیار و تەمومژاوییە. لەلایەکیترەوە دەبێ بڵێم ئەو کەسانەی لە دەڤەری رەخنە و فێرکاری و پەروەردەکردنی رەخنەکارانی پرۆفیشناڵدا تێدەکۆشن، پێویستییان بە فێرکارییەکی توند و تۆڵ و کاری بنەڕەتی هەیە. چونکە گەشەسەندن و تێڕامان لە کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و ئیمکاناتی ئەم بوارە، دەتوانێ تا ڕادەیەك قەرەبوی ئەو هەموو کەموکوڕیە بکاتەوە. لەم دەڤەرەدا بڵاڤۆگ و میدیا و هۆڵە فەرهەنگییەکان دیارە ئەرکێکی هەرە قورس و گرینگیان لەسەر شانە.

بابەك سەحرانەوەرد: لە کۆی رەخنەکانتان چەند وتارێکتان بۆ بەرهەمەکانی هیدایەت و ئالی ئەحمەد تەرخان کردووە. دیارە مافی خۆتانە پاش شەست ساڵی رەبەق وەك رەخنەکارێکی جیدی لێیان بکۆڵیتەوە.

بەڕای ئێوە بەرهەمەکانی نووسەرانی نەوەی یەکەم لە چیرۆکنووسیندا دەبوو لە ڕووی ڕەخنەوە قسەی لەسەربکرێت و باسگەلی تازەی دروستبکردایە، یان پێتوایە چیتر قسەیەکیان پێ نییە بیڵێن؟

مەحموود مۆتەقیدی: لە بابەتی ناساندن و ڕەخنەنووسین لەمەڕ نووسەرانێك وەکو هیدایەت و ئالی ئەحمەد و دیتران، تا ئێستە بە تێر و تەسەل دەق لەبەر دەستە و لە بەستێن و سووچگەلی جۆراوجۆرەوە ئاڕاستە کراون. گرینگ ئەوەیە ئێمە لە بەرهەمەکانی ئەم نووسەرە پێشەنگانە تێڕابمێنین، بۆ ئەوەی خاڵە سەرەکییەکان بدۆزینەوە و ڕەچاویان بکەین و لە ڕوانگەیەکی تازە و نوێباوەوە لەم بوارەدا تێبکۆشین. بەتەواوی ئەمانە لەو باوەڕەدام هێشتایش ئەم نووسەرانە قسەی زۆریان بۆ وتن پێیە. گرینگ ئەوەیە کە پێیاندا بچینەوە و لە بەرهەمە بەراییەکانی ئەوان وردبینەوە.

بابەك سەحرانەوەرد: هەروەکو ئاگادارن یەکێك لە زیان و خەسارەکانی شیعری ئەمڕۆ، ئەوەیە کە تاقمێك خۆبەشاعیرزان شێوەی سانانووسینیان کردووە بە ڕێبازێکی نووسینی شیعرەکانیان و بەناوی شیعری ڕەسەنەوە ئاڕاستەی خوێنەرانی ئەکەن. زۆرینەی ئەم دەقە شیعریانەش لاسایکردنەوەی چەند شاعیرێکی ناسراوە. بەڕای ئێوە لەبەرچی ئەم نوقسان و زیانە ئەمڕۆکە لەوێژەی هاوچەرخیی فارسیدا سەریهەڵداوە؟ ئاخۆ پێتانوایە کە ئەمە مەرجێکی سەرەکیی شیعری ئیمڕۆیە؟



مەحموود مۆتەقیدی: گومانی تێدا نییە لە هەر دەورە و ڕەوتێکدا وێژە و هونەر بەتایبەت شیعر بە هەموو وێنەگەلە بابەتیی و ناوەڕۆکیی و فۆڕمێکیەوە کراژ دەخات. لەچاخی ئێمەیشدا، شیعر بە نزم و نەویبوون، هەندێکجار لە ڕێچکە سەرەکییەکەی بە لارێدا دەڕوات و دوور دەکەوێتەوە. تاقمێك هەن کە ساناوتن و سانانووسینان لەگەڵ ساناکردنەوە و ساناخوازی بە شتێکی مانادار و هاوتا دائەنێن، بەڵام سەد مەخابن بە هەڵەدا چوون و بەم کارانە زیانێکی گرانیان لە زمانی زگماگی داوە. شاعیر ئەو کاتە دەچێتە نێو گڵ کە بۆ چەمك و پەیڤەکانی شۆڕشێکی مەعنەوی و ڕاستەقینەی نەکردبێ. ئەمڕۆکە برێ لە شاعیرە لوتبەرز و خۆبەزلزانەکان کەوتوونەتە ئەم گێژاوە و شاعیرە



لاوەکانیشیان بەشداری ئەم کارە کردووە. بە لابردن و بەکارهێنانی بنەواژە و دەستەواژە و ڕستە ناشاعیرانەکان زۆر کەسیان بەداخەوە دوای خۆیان خستووە، فەزای شیعریشیان ناخۆش و شلەژاو و بێمانا کردووە. لەم تەڕا و بەڕایەدا هەڵبەت شتاقیان ناتوانن نوێخوازی ڕەتکەنەوە. لەبیرمان بێت ئەم ڕەوتانە ئافەت و زیانێك بۆ زمان و شیعری فارسی دروست دەکەن، تا ئەو ئاستەی کە بەردەنگ و داژدارانی شیعری ئەمڕۆ لەم بزاڤە نائومێدبوون. شاعیرە گەنجەکان نابێت بەهۆی ئەم ڕەوتانەوە تووشی پەرۆشیبن بەڵکو دەبێ بەسەر نشوستی و ترسیشدا زاڵبن.

بابەك سەحرانەوەرد: بەڕای بەڕێزتان دەشێ سانانووسین لە شیعری ئەم چەند ساڵەی ئێراندا، بخەینە نێو ریزی ڕێبازە ئەدەبیەکانەوە، یاخود ئێوە هەڵوێستێکی جیاوازتان بۆ ئەم بزافە نوێیە هەیە؟

مەحموود مۆتەقیدی: شیعر گوتەزارێکی سانا نییە و درککردنی لەسەر شانی نوخبەکانی کۆمەڵگەیە. کەواتە بە سانایی ناکرێ سانای بکەینەوە. بەڕای من سانانووسین لەگەڵ ساناکردنی دەق جیاوازە و قسە و باسێك کە لەم لاو لاوە دەیبیسترێ هەرە جیددی و بەرۆژ و تازە نییە. شایانی باسە کە وشەگەلی خەڵکانی ڕەمەکی و عەوام لە شیعرەکانی دەیەکانی پێشتردا بەجۆرێك لەلای گروپ و دەستەیەك لە شاعیران ڕێزی لێنراوە و بە هەڵەشەیی و گوشارەوە بەکاربراوە، بەڵام پێگە و ئاخێزگە و شێوە نقیسیارییەکەی لەکوێوە و بەچ شێوازێك هێناوەتە ئارا ئەمە بۆ خۆی مەسەلەیەکی گرنگە. ئەمڕۆکە هەندێك وابیردەکەنەوە بەساناکردنی بابەت و نەویبوونی زمان و کەمتەرخەمی بە پێکهاتە دەرەکییەکەی شیعر کارێکی ئەوتۆیان کردووە. شیعری ڕەسەن بە جەوهەر و کرۆکی هونەریی تایبەتەوە گرێدراوە، شاعیران کەڵکیان لە سەنعەتە ئەدەبی و گێڕانەوە بە هەست و سۆزەکان و چەندان دیاردەی تر وەرگرتووە. کەواتە ناکرێ بەسانایی بەسەریدا تێبپەڕێین چونکە ئەم ڕەوتە ڕەوتێکی ساکار نییە. زۆرن ئەو کەسانە کە بەچاوێکی نەشارەزا و نەشیاوەوە بۆ ئەم مەسەلەیە دەڕوانن. سانانووسین لە دەقی پەخشانیدا زیاتر و جوانتر و کارتێکەرتر

خۆی نواندووە. بەڵام لە شیعردا پێویستیی بە زانست و بزێویی و پسپۆڕی و ئاگایی هەیە و ئەم برادەرە شاعیرانە دەبێ تەواوی کونج و قوژبنی ئەم مەسەلە ئاڵۆزە لێك بدەنەوە و بە ریشەو رەگەزیدا بچنەوە.

بابەك سەحرانەوەرد: لەبەرچی تاقمێك لە ڕەخنەکاران لەگەڵ باسی سانانووسین لەشیعردا دژبەری دەکەن و ئەمە وەك بەڵگەیەك لەبۆ لاوازیی ئەو شاعیرانە دەهێننەوە کە ناتوانن درك بە ئاڵوزییەکانی چاخی پۆست مۆدێڕنیزم بکەن؟ لەلایەکیترەوە هەندێکیش لەو بڕوایەدان کە سانانووسین بەرەنگاربوونەوەی دۆخێکە لە شیعری ئێستادا دروستبووە؟

مەحموود مۆتەقیدی: تا ڕادەیەك لە پەراوێزی پرسیاری پێشوودا وەڵامی ئەم پرسە ئاڵۆزەم دایەوە. ئەو مەسەلەی کە لێرەدا دەبێ ئاوڕی لێبدەینەوە ئەوەیە کە هیچ کەسێك نەیار و بەرهەڵستی سانانووسین نییە. هەر دەق و شیعرێك لە ئەنجامدا خوێنەر و بەردەنگی تایبەت بە خۆی هەیە. هەر شاعیرێك مافی ئەوەی هەیە ئازادانە ڕوانگە و هەڵوێستە شەخسییەکەی خۆی بخاتە ڕوو. کەواتە نووسەر و شاعیر و بەگشتی دەقنووس، بۆ ڕموودەکردنی خوێنەر دەبێ لە زەوق و سەلیقە و خوێنەواری ئەوان ئاوڕ بدەنەوە و هەمیشە ڕەچاوی بکەن. بەڵام ئەمەیش بەو مانایە نییە هەموو شتێ بۆن و بەرامەی فەرهەنگی خەڵکانی ڕەمەکیی لێبێت و بەلای عەوامانە بوون نەوی بێتەوە. خودی پرۆسەی نووسین و خوێندنەوە دیارە ڕەوتێکی ئاسایی و سانای نییە. بەشێوە پرەنسیپێکی کەلتووری و جوانیناسانەوە گرێدراوە. تێڕوانین لە مۆدێرنیزم و ئاڵۆزییەکانی لەبەرهەمی ئەدەبیدا تاڕادەیەك پەسەندکراوە. چونکە لە نێوان زمانە ڕەسەنەکەی هونەر لەگەڵ زمانی پێوەر و هەرڕۆژەیی مەودا و جیاوازییەك خولقاوە. تەواوی جوانی هونەر لە بەیانگەری و ئیهامەکەیەتی کە بەرجەستە دەبنەوە. کەواتە دەبێ شیعر لە سووچی کارکردە جڤاکی و پێکهاتە هونەرییەکەی بنواڕین. لەم ئاستەدا، بیرۆکەوانی و ڕەخنە هیچ کاتێك ناتوانن هەموو کونج و قوژبنی دەقێك بخەنەڕوو و پێیدا بچنەوە. بۆ کردنەوەی ئەم گلۆڵە ئاڵۆزاوییە دەبێ لە ڕابردوومان ئاوڕبەینەوە.





سانانووسین بەمانای بەرهەڵستی لە بارودۆخی ئێستە نییە. هەلومەرجی کەلتووری ئێران لە حەفتاکانەوە بە شێوەیەك ڕەخسابوو کە تاقمێك لە شاعیرە گەنجەکانمان دژبەرایەتی خۆیان بە نیسبەتی شیعری شەستەکان بە هۆنینەوەی جۆرە شیعریکی تایبەت نیشاندەدا. بەڵام ئەم ئەزموونانەش زوو تێپەڕ و پچڕ پچڕ بوون لە فۆرم و زماندا دواتریش شتێکی ئەوتۆیان نەهێنایە ئاراوە. لە هەشتاکانیشدا شیعر کەوتە نێو رووبەرێکەوە کە بە ڕێچکەی ئاوەزمەندی کولتوورییدا دەڕۆیشت و تەواوی ئەم زێدەڕۆیانە تێکڕا هەرەسیان هێنا و لەناوچوون. کەسانێك هەن کە وا دەزانن ئەگەر بە بیرۆکە هاوردەییەکان بەتایبەت بیرۆکەی زمانناسییەوە خۆیان تەیارکەن دەتوانن شیعری بەپێز و بەئادان بنووسن و گەمە زمانییەکانی خۆیان بەناوی شیعرەوە بە خوێنەران بفرۆشن. خۆتان دەزانن ئەمە بەهەڵەدا چوونە. دەبێ ئەم خاڵەیش رەچاوبکرێ کە لەمپەرێکی زۆر و زەوەندە بە سەردێڕی شیعری کلاسیك لەبەرانبەر ئێمەدا لەنگەری گرتووە و بۆ گۆڕانکاری دەبێ ڕێکارێکی لێهاتوو، ئەمرۆیی و بەجێ هەڵبژێرین. دیارە لاساییکردنەوە، نەرێکردنی دیتران و هەروەتر باسەری و خۆبەزلزانین، قەیرانەکان بەلای چارەسەرکردن پەلکێش ناکات و دەبینە رۆشنبیری بن دیوار کە لە ژێر سێبەرە پان و پۆڕەکەی هێزە نادیارەکاندا هەرئانوسات لە خۆماندا نغرۆ دەبین. ڕێبازگەلێکی زۆر لە گۆڕەپانی شیعری ئەم چەند ساڵەی ئێراندا سەریهەڵداوە بەڵام بە زوویی لەبیر دەکرێن چونکە خۆیان لە خانەی ڕەوتێکی زووپەڕەوە پێناسە کردووە. بۆ شاعیربوون سەرەڕای هەستی سۆزمەندانە و شەوق و زەوق، دەبێ بە زمانێکی پێکهاتەمەند و تۆکمە تەیار بین و لە هەموو کۆسپ و بەندەکان تێپەڕین. هەر دەقێکی شیعری کە بە جەوهەری شیعری و زمانی کارتێکەر و خاوەن دەسەڵات تەیار بێت دەتوانێت هەم شیعری سیاسی و هەم شیعری ئاشقانە بێتەژمار. سەرەڕای ئەمە پێویستە ئەم شیعرە تژی لە چرکەساتگەلی شاعیرانە و ڕەسەن بێت. ئەمرۆکە ئێمە نیازمان بە تێکەڵبوونی ئەشق و سیاسەت بە شێوەیەکی جەماوەری هەیە بەڵام ئەبێت لە ڕووی فیکر و ئەندێشەوە بێت.

بابەك سەحرانەوەرد: بۆ دواین پرسیار پێمخۆشە هەندێك لەمەڕ ئەدەب و شیعری کوردستان بدوێن. تاچ

ڕادەیەك بە ئەدەبی كوردستان ئاشنایەتیت هەیە. زۆر ڕاشكاوانە بیروبۆچوونتان لەمەڕ ئەدەب و ویژەی كوردستان بڵێن كە چۆنە؟

مەحموود مۆتەقیدی: نایشارمەوە لە نێوان ژانرە هونەری و كولتوورییەكانی ناوچەی كوردستاندا بە هۆكارگەلی جۆراوجۆرەوە ئێمەی فارس پتر لە هەر شتێكی تر ڕموودەی مۆسیقا خۆش و ڕەسەنەكەی ئەم نەتەوەیە بووین. چونكە بە زمانی ئەم گەلە چ ئاشنایەتیم نییە. بەر لەم هۆكارە لە فەرهەنگ و نەتەوەی كورد چ شتێكی ئەوتۆ بە زمانی فارسی وەرنەگێڕدراوە. هەڵبەت كەم تاكورت و لەملاولا لە تاقمێك شاعیری كورد، وەك شێركو بێكەس و چەند كەسێتیی دیكەی هەرێمی كوردستان بەتایبەت بە وەرگێڕانە ڕەسەن و جوانەكانی ئێوە كە دیارە بەڕاستی بەسەر كونج و قوژبنی زمانی فارسیدا زاڵن هەندێك هونراوەی بەپێزم خوێندۆتەوە، بەڵام دەبێ ئەم مەسەلەیش ئاڕاستەكەم كە كولتووری دەوڵەمەندی ئەم ناوچەیە و بوێری ئەم خەڵكە لە گوزەری زەمەن و هاودەنگیی لەگەڵ سروشتدا، هەمیشە لە گۆڕەپانی مێژووی كولتووری و كۆمەڵایەتی پێگەیەكی هەرە گرینگی هەیە. من لەگەڵ تاقمێكی زۆر لە شاعیرە گەنجەكانی ئەم گەلە هاوڕێم كە ڕوویان هێناوەتە شیعری فارسی كە ئەمەیش نیشانەی هۆگرایەتی ئەوانە بە زمانی فارسییەوە. گوتەنییە لە نێوان ئەو كەسانەی بە فارسی دەنووسن و لە ئەدەبی ئێراندا پشك و ڕۆڵێكی جیدی و هەرە گرینگیان گێڕاوە و لە دەڤەری داهێنان و وەرگێڕان كاری بەپێز و هێز و ئەوتۆیان گرتۆتە ئەستۆ و لەولایشەوە تواناكانی زمانی فارسییان پراكتیزە كردووە، دەشێ لەخوالێخۆشبوو محەممەد قازی و هەروەتر ئیبراهیم یۆنسی ناو بەرین. بەتایبەت یۆنسی كە بە مایە و جومگەی كەلتووری كوردی چەند رۆمانی ناوازەی ئاڕاستەی خوێنەرە فارسەكان كردووە.



حەوت کورتە شیعری مەحموود مۆتەقیدی

لە فارسییەوە: بابەك سەحرانەوەرد

## هێشتا



ناوت

بە دەنگی دەریاوە

دەسپێدەکات؛

با، ئاو، ئاور

لە هەراهوریای چاوانت

خۆیان شاردۆتەوە،

بەڵام لێوە ئاڵەکەت

هیچ کاتێك

زەردەخەنەی ون نەکردووە؛

لە بێشەڵانەوە

تا جۆگەلەکان

هێشتاکە

شوێن پێی تۆیە کە هەر ماوەتەوە

سروودی مەستان

لە گەرووت دا

دەزرنگێتەوە و

ئەشقێك کە

لە ئاوێنەی دڵتدا
یەخسیرە
هەرواکە
لە مەودایەکی دوورەوە
بە سەرمەستیی پێ لە عەرز دەکوتی
ئێستا
ئەوە گەشترین پەیامە
کە لە کراسەکەتدا
تێدەپەڕێت؛
ئەم جارە
لە شانەکانتەوە
بارستایی تەواوی جادەکانی جیهان
خۆی بە پرچەکانی پاییزەوە
هەڵدەواسێت
ئاخ! گوێتان لێیە
چ شلەژاوییەکی نامۆ دەبیسترێ.
وتم ناوت
لەگەڵ دەریا
دەسپێدەکات.



## هەستی بارانی

لە دەڵاقە سوورەکانی ئەڤین
تا هەستی بارانێك
کە لێمان دەبارێ



تەنیا
یەك مانگەشەوی دیكە
لەتۆ ئەدوێم.

## كەڵەكێوی

كەڵەكێوییە خەمبارەكان
لەگەڵ تۆ ڕادەكەن،
ئەم سێ شەمەیشە
لە بیری تۆدا تێدەپەڕێ
وەكو كۆڵانەكانی ئاشقی و
ژنێك كە دەنگی تۆ بوو!

## هەورەكان

هەورەكان
لەگەڵ چاوەكانت
دەگەڕێنەوە
كەمێك و هەتا كەمێكی تر
فەرامۆشم بكە
تكایە
مەترسە!
ئەمە تەواوی هەقیقەت نییە.

## بیرم

لە بیرم بێت
هەندێك جار لە تۆ بپرسم
چلۆن
قژە سپییەکانت
سپی تر دەبن!
رۆحێکی رووت و قووت
لە تۆدا چەکەرە دەکا
ئەو کاتەی
منداڵێکی ساوا بووی.

## لە خەیاڵی تۆدا

روون و تاریک دەبم
کاتێ لە حاڵی من
دەپرسییەوە
چوار رێکانی شار لە پشت چرا سوورەکان
بێدەنگ دەبن
کاتێ ئەسپە تینووەکان
لە تیشکی مانگەشەو
سڵ دەکەنەوە
ئەتۆ کەزیە پەلکە کراوەکەت
هەروا دەشاریتەوە
لە وێستگەکانی خەون و خەیاڵدا
دوایین رێبواری هیلاك





لە ڕێوە هات

خەڵك، لە نیوەشەوان

بە دەنگی باران

وەخەبەردێن

ئێمە لە قەرەباڵغیی دارەکان

پەیڤی تازە دەبیستین.

## پاییز

پاییزی وشەگەل

گۆرانییەکانت وەبیر دەهێنێتەوە

لە پاڵ پەنجەرەیەکی سەوزەوە

ژنێك

بۆ دەسەکانی تۆ

گۆرانییەکی بەسۆز دەچڕێ و

دەنگی ناگات و

بزەکانی

هەمیسان گڕ دەگرن.



# ڕێگاکانی
# ڕێبین ئەحمەد خدر
## گەڕانەوە بۆ ژوورە تاریکەکان

**ئەحمەدی مەلا**

دەسپێك:

ئەم نووسینانەی کە لەسەر شیعری دوای ڕاپەڕین دەنووسرێن، هەوڵدانێکە بۆ خستنەڕووی جیهانبینییەك، نەك گەڕان بە دوای واتاکان، بەڵکو کەشفکردنی ئاماژەکان و یەکلاکردنی ئەو جیهانبینییە کە شاعیر شیعری خۆی لەسەر بنیاتناوە، جا بە ویست بووبێت یا لە دەرەوەی ویست. خستنە ژێر تیشك، خوێندنەوەی ئاماژەکان و دواندنی ئەو جیهانە پەنهانەکانی دەکرێنە ئامانج. گەڕان بە دوای ئەو تایبەتمەتییانەی کە شاعیرێك لە شاعیرێکی دیکە جودا دەکاتەوە، کردنەوەی چەندین دەرگا و پەنجەرەن لە ڕووی ئەو دەقانە و

هەوڵدانێکیشە بۆ خوێندەنەوەیەك کە پشت بە تیۆری حازر بەدەست نابەستێت، بەڵکو هەوڵی ئەوە دەدرێت کە دەق بهێنرێتە دەنگ.

دەقەکانی "١٤ ڕێگا" (ژمارەی لاپەڕەم بۆ نموونە شیعرییەکان نەهێناوەتەوە، چونکە ئەو دەقانەی کە من کارم لەسەریان کردووە هی کتێبە چاپ کراوکە نەبوون؛ بەڵام خوێنەر بە ئاسانی دەتوانێ بچێتەوە سەریان.) ی ڕێبین ئەحمەد خدر دەکەینە سێ بەشەوە؛ بەشێکی ناو دەنێین "جیهانبینی منداڵانە" و دووەمیش "تاریکاییەکان و جیهانێکی پەنهان" و بەشی سێیەمیش " شیعر لە دەرەوەی سروشت."

### 1ـ جیهانبینی منداڵانە

جیهانی شیعریی ڕێبین، جیهانی منداڵە، هی منداڵێك کە نایەوێ گەورە بێت؛ بەڵام گەورەش دەبێ.
نایەوێ ئاوڕێکی شیعریی لە کەلەپوور بداتەوە، تەنانەت جیهانی گەورەکان ڕەت دەکاتەوە. هەندێجار هەست دەکەین خۆمان بەرامبەر بە دیمەنی وێنەی بە د ە ستکێشر ا و ی منداڵان دەبینینەوە. کاتێکیش دەڵێن منداڵان، تەواو



دەچینە نێو دونیای گەمەو یارییەکانەوە. گەمەی بێ سنوور، گەمەکانی خەون، گەمەی فڕین، گەمەی گەیشتن بە ژن، بەڵام هۆشیاریی ئەوەش شك دەبات کە ئەو لە نێو خەلقی ئەدەبیدا کار دەکات.

نووسین بۆ منداڵان زۆر جیاوازترە لەوەی نووسینی منداڵانە ئەنجام بدرێت، یەکەمیان گەورەکان لە پێناوی ئامانجێکی دیاریکراو دەینووسن کە زۆرجار پەروەردەییە، بەڵام لای ڕێبین خۆی دەبێتەوە بە منداڵ و بۆ گەورەکان دەنووسیت. ئەمە ناوەڕۆك و ناواخنی ئامانجی نووسینە لای ئەم شاعیرە.

ئەو گەمە بە وشەکان ناکات، بەڵکو گەمەیان لە گەڵ دەکات، وشەکان وەکو بەرجەستەیان لێدێت و جێگۆڕکێیان پێ دەکات. شیعر نامەیەکی دڵدارانە نییە بۆ ئەوەی دڵی خۆی پێ فێنك بکاتەوە، دڵی خۆی بداتەوە و خەونێکی ڕۆمانسیانە ببینێ و لەم دونیا جەنجاڵە دوور بکەوێتەوە، بەڵکو جیهانێك دروست دەکات و هەمووومان بۆ ئەو جیهانە داوەت دەکات.

شیعری سیاسی نین: کێشەکانی نەتەوە، نیشتیمان، خاك ببنە خەمە گەورەکانی ؛



شیعری کۆمەڵایەتی نین، ڕێگر و بەربەستەکان ڕێگە لە تاك بگرن بۆ ئەوەی ئازادییەکانی خۆی مومارەسە بکات؛ شیعری زیهنی و وجوودیش نین، گەمە ئەپستراکەکان و خۆسەپاندنی خود بە هەند وەرگرێت؛ ئەو یەکێکە لە شاعیرەکانی دوای ڕاپەڕێن خۆی لەم بەندرێژییە رزگار کردووە. ڕێگا و شەقام و فڕین و مەرگ و کتێب ئەو جیهانەی ئەو پێکدەهێنن.

لە شیعری "ڕێگاکاندا" زۆر بە جوانی ئەو جیهانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان بۆی کرد، خۆی دەردەخات. ئەو خۆکۆشتنەی کە لە نێو نەوەی دوای ڕاپەڕین زۆر باس دەکرێ، ئەو یاریی لەگەڵ دەکات، ئەمە جۆرە قاقایەکی شیعرییە کە ئاراستەی ئەو خۆکوشتنە لەفزییە دەکات کە لە ئەدەبییاتی شیعریدا دەردەکەوێت:

ڕێگاکان
هەموو ڕێگاکانی خۆکوشتنم تاقیکردنەوە
خۆفڕیدان لەسەر قەنەفە
خۆخستنە ژێر ئۆتۆمبێلێکی منداڵان
سەرخستنە نێو تەشتێکی بەتاڵ
چەقۆ چەقاندن لەسەر دڵی وێنەیەکم
عاشقبوون بە بووکەشووشەیەك
خۆخنکاندن بە پەت لە شیعرێکدا
هەموو ڕێگاکانی خۆکوشتنم تاقیکردنەوە و..هەر زیندووم..
با زیاتر بژیم .. زیاتر ،
بەهیوای ژیانێکی خۆش
لەنێو گۆڕستانی زیندووان دا.

دوا دێری ئەم شیعرەیە کە شاعیر پێمان دەڵێ من هۆشیارم بەرامبەر بەو یارییەی کە دەیکەم. گەمە جۆرە درێژەپێدانی ئەو ژیانەیە کە وەکو گۆڕستانی لێهاتووە لە لایەن گەورەکانەوە. شیعری ڕێبین شیعرێکە لە ژوورە نیمچە تاریکەکاندا دەنووسرێن، شیعری سێبەر و دەرگا و پەنجەرە داخراوەکانن. جۆرە دەقێکە بەرامبەر بە هەتاو دەوەستێت، لە دیوەکەی دیکەی هەتاو، واتە لە شەودا. بەڵام شەوی رامان و سۆفیگەرانە نییە، شەوی ناڵان و خەوزڕاندن نییە بۆ ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە و چاوی بە یار بکەێت؛ نەخێر شیعری ئەو چرپەیەکە لە نێوا تاریکاییەکانی شەو بۆ ئەوەی ئەو پەردە تاریکە بە رووی گەورەکاندا دابداتەوە و بژێ. بە واتایەکی دی، شیعری ڕێبین، شیعری ژیانە بە تەنهایی، ژیانە بە دزییەوە، ئەو لە کونی دەرگاوە سەیرتان دەکات ؛ ئەگینا جەبەرووتی گەورەکان ئەو یارییە گەورەیەی لێ تێکدەدەن.

لە بڕگەیەکی شیعری "گالێسکەوان" پەرە بەم یارییە دەدات، وەکو ئەوەی درێژکراوەی شیعرەکەی پێشوو بووبێت؛ لێرە "سەر" دەبێتە "تۆپ" و گالێسکەوانێك فڕێی دەداتە نێو خەونەوە. واتە لە دەرەوە بۆ ژوورەوە. لێرە کۆنتراستی دەرەوە/ناوەوە بەرجەستە دەبن. دەرەوە واقیعێکی دژە ئەدەب، دژە شیعر، دژە یارییە، کەچی ژوورەوە دونیای یاریی و خەونەکانە.

ئەم بەیانییە
سەرم وەك تۆپێك غلۆردەبێتەوە
ژێر تایەی ئۆتۆمبێلێکی بارهەڵگر
ئۆتۆمبێلەکە دەوەستێت و
شوفێرەکە
شەقێك لە تۆپەکە هەڵدەدا و
فڕێی دەداتەوە ناو خەونەکان.

ئەم شیعرانەن کە شاعیر مومارەسەی ژیانی تێدا دەکات. ئینسان لە ناو دەقدا دەژی، لەوێ دەمرێ، لەوێ هەناسە دەدات، لەوێ خەون دەبینێ، لەوێ گۆڕێکی بچووك بۆ خۆی هەڵدەکەنێ و چاوی لە یەك دەنێ. شیعری ڕێبین مەرجەعی ژیان و ئەزموونەکانی ژیان ناکاتە پێگە بۆ خەلقی ئەدەبی، بەڵکو یارییەکانی ئاوێنە دەبووژێنێتەوە، واتە لە نێوان ئاوێنەکاندا دەژێ، لە نێو تیشکدانەوە و ڕەنگدانەوەکاندا.

2ـ تاریکاییەکان و جیهانێکی





پەنهان

وەکو لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، شیعری ڕێبین لە لۆچی تاریکییەکاندا دەژێ. چاوشارکێیەکی شیعریی لە گەڵ دەق ئەنجام دەدا. شەوی ئەو بێ ئەستێرەیە، لە ناو ئەو تاریکایانە لە شیعر دەگەڕێ. ئەو ئینسانی شەوە، لەوێوە دەڕوانێتە دەرەوە، لە شەودا گەشتەکانی دەست پێدەکات لە پێناو ئەوەی بۆ ساتێك بڕوانێتە ژیان بەڵام هیچ نابینێ. ڕەنگدانەوەی ژیان تارماییەکە کە ئەویش لە خەوندا پەیدا بووە و بە ناو ئاگردا دەڕوا.

شەوانە لە گەشتە مردووە نەمرەکانی خۆمدا<br>
بۆ ساتێك لە ژیان دەڕوانم :<br>
تارماییەك بەسواری پایسکلێکەوە<br>
بەناو ئاگردا دەڕوا و<br>
گۆرانی دەڵێ

لە شیعری "پردەکان"دا شاعیر بە تەواوی گەیشتۆتە ئەو ڕایەی کە تەنانەت دەبێ "پەنجەرەش" لە بنەوە هەڵکەندرێ و بفرۆشرێ، چونکە ئەویش ڕێگرە لە دروستکردن و خەلقی ئەو دونیا تاریکەی ئەو بۆ ئەوەی گوزەر بە ناو خەونێکی قووڵدا بکات:

پەنجەرەی ژوورەکەم دەفرۆشم<br>
یان دەیدەم بە جووتێ پێڵاوی دڕاو<br>
گەر بۆمکرا تێر ڕادەکەم..<br>
پەنجەرەی غەمبار<br>
هەی لە من ماڵخراوتر<br>
هاوماڵی غەریبیی

تۆ بۆ هەر کوێیەك بڕۆی
کەس بە دڵ لێت ناڕوانێ
لە تۆدا هەر سەیری شتێکی تر دەکەن.

ئایا گۆڕینەوە "پەنجەرە" بە "جووتێ پێڵاوی دڕاو" لە پێناوی غاردانە؟ وەڵام: نەخێر. دەبێ لێرە ئاماژە بۆ گرینگیی پەنجەرە لە رۆژهەڵات بکەین. پەنجەرە وەکو دەرگا نییە، چونکە دەرگا ناسنامە و شوناسی خاوەنەکەیەتی: دەرگای داری نەخشراو، دەرگای تەنەکە، دەرگای ئاسنی حەوجۆش، دەرگای نزم و پەرپووت، دەرگای شلۆق، سەرجەم ئەم شێوە دەرگایانە ئاماژەیەکی کۆمەڵایەتییان هەڵگرتووە. بەڵام پەنجەرە لە رۆژهەڵاتدا قووڵایی سێمانتیکی خۆی هەیە، ئەگەر ئاوڕێك لە گشت ئەو تابلۆیانە بدەینەوە کە بەدەستی هونەرمەندانی رۆژئاوا لەمەڕ جیهانی رۆژهەڵاتەوە کێشاویانە، دەبینین پەنجەرە رۆڵێکی دیاریکراوی هەیە. پەنجەرە تابوو و موحەڕەم دەشکێنێ ؛ پەنجەرە تەماشا داپڵۆسراوەکانی تیا دەمرێ، پەنجەرە حەزە گڕ گرتووەکان دادەگیرسێنێ، پەنجەرە ئەڵقەی تابووکان دەترازێنێ. رێبین ئاماژە بۆ ئەستێتیکای فەرامۆشکراوی پەنجەرە



دەکات و دەیەوێ ئەوەمان پێ بڵێ کە کەس سەیری خودی پەنجەرە ناکات، بەڵکو سەیری ئەو دیوی پەنجەرە دەکرێت. لێرە ئاماژەیەکی ڕوونە کە ئینسانەکان کاتێك لە یەك دەڕوانن، بیر لە شتی دیکە دەکەنەوە، یا دەیانەوێ شتی دیکە ببینین. لە هەمان کاتیشدا، روانین لە پەنجەرەوە، واتە کاتێك لە دەرەوە، لە پەنجەرەی شاعیر دەڕوانین ئەو هەست دەکات ئەو دونیایەی کە خۆی پێوە مەشغوڵ کردووە، دەشێوێندرێ.

ئەم شاعیرە لاوە دەستی لە ژیان شوشتووە، گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە هیچی تر مومکین نییە ببینرێت. ئەوەی روو دەدات، رووی داوە، ژیانی کۆمەڵایەتی لە دیمەنێك پێکهاتووە کە دووپات دەکاتەوە، بۆنەکان هەمیشە هەمان دەمامکیان هەیە، هەمان دەستەواژە دووپات دەبنەوە، جێگۆڕکێ بە ئینسانەکان دەکرێ، بەڵام بەردی بناغەی ئەم دیمەنانە نەبزێو و نەگۆڕن. شاعیر بە ڕوونی پێمان دەڵێ :





چاویلکەکەم دەدەم بە کوێرێك
بەڵکو شتێکی پێ ببینێ.

لە سەر هەمان بنەما، لە شیعرێکی دیکە زۆر بە ڕوونی جەخت لەم دووپات بوونەوەیە دەکات:

تەنها یەك کەس

باپیرم خەونێکی دی
باوکیشم هەمان خەونی دی
منیش هەمان خەونە ئێستا دەیبینم

باپیرم دارێکی ڕواند
باوکیشم هەمان داری ڕواند
منیش خەریکم دارەکە دەڕوێنم

باپیرم کتێبێکی نووسی
باوکیشم بۆ ئەوەی کتێبەکەی ئەو بخوێنێتەوە،
هەمان کتێبی نووسی
منیش هەمان کتێبە ئێستا دەینووسم

باپیرم لە شەڕێکی پووچدا کوژرا
باوکیشم لە شەڕێکی پووچدا کوژرا
منیش چاوەڕێی شەڕێکی پووچم

ئەوە چ مەملەکەتێکە؟
چەند لەمێژە تەنها یەك کەس دەژی
یەك ڕوانین..یەك هەناسە..یەك مردن

ئەرێ بەڕاست ئێمە هەمووومان،
پێشتر نەژیاوین؟

ئەم دەقە، سەرەڕای ئەوەی بە سادەیی نووسراوە، تەکلیفی هونەری بەسەرەوە دیار نییە، شاعیر لە وێنەی سەمەرە و غەریب و ناوازە نەگەڕاوە، بۆ ئەوەی گوزارشت لەم حاڵەتە بکات، بەڵکو زۆر بە سادەیی لێمان دەپرسێ: "ئەرێ بە ڕاست ئێمە هەمووومان، پێشتر نەژیاوین؟" ئەمە لەو فیکرەیەوە دوورە کە باوەڕی بەوەیە کە ئینسانەکان هەمیشە لە دۆناودۆندان و هەر جارەی لە شیکڵ و شێوەیەکدا دەردەکەون، ئەویش بە پێی ئەو چاکە و خراپانەی کە لە سەر زەمین ئەنجامیان داوە، جارێکی دیکە دەردەکەونەوە و سەرهەڵدەدەنەوە.
شاعیر دەیەوێ باسی ئەو مۆنۆتۆنی ڕەتابەتە بکات کە کۆگەرا بارستاییەکانی بنیات دەنێ، کۆگەرایەکی بزوێنەر نییە، ئەنجامی چالاکی و هەرەوەزیی نییە، بەڵکو وەکو یەك کوتلە، یەك بلۆك کارە سواوەکانی ئەنجام دەدات. ئەم ڕەتابەیە کۆمەڵایەتییە دژە شیعرە لە ناواخندا، تەنانەت دژە ژیانیشە، چونکە لە کاری تاکی خەلاقانە داماڵێنراوە. بۆیە بۆنەکان وەکو خولانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا دووپات دەبنەوە و هیچ شتێکی نوێ لە ژێر هەتاو بەدی ناکرێت.
دەقە شیعرییەکانی ڕێبین، پشت لەو کەلەپووورە شیعرییە دەکەن کە گوڵ و گوڵزار، پەپوولە و بنار، پەڵکەزێڕینەی دوای وەشت بەشێکی زۆری دەقی کوردی ئێمەی غەزوو کردووە ؛ غەزوویەکە لە دوورەوە دێت، ئەویش مێژووی خۆی هەیە، بەڵام بە تێپەڕینی کات ئەمجۆرە شیعرانە ئیدی شیعری ناسك نین، گوڵەکان بۆنیان نییە، پەپوولەکان کاغەزینن، پەڵکەزێڕینە وەك زڕە خەونێك دێت و ئاوادەبێت. لە شیعری دوای ڕاپەڕین هەست بەو یاخیبوونە دەکەین، چونکە ئەمجۆرە شیعرانە وەکو گەمەیەکی ساویلکەیان



لێدێت: گوڵ لە شیعر و سروشت دەستێن.

گوڵدانەکان دەشارمەوە
ئیتر سەردەمی گوڵ و باخچە بەسەرچوو،
سەردەمی نێرگز و بەیبوون..
ئەوەندەی لایلایەمان بۆ باغەکان کرد
هەر باغەوانەکان خەونیان لێکەوت.

لای شاڵاو حەبیبەش هەستمان بەمە کرد کە گوڵ لە شیعر دەردێنێ، ئەمە تووڕەییەکە دژ بە خودی گوڵ نییە، بەڵکو دژ بە سیاقێکی شیعریی نەزۆکە کە وا تێگەیشتووە تەنها بە ناوهێنانی گوڵ شیعر لە دایك دەبێت.
ئەلیمەنتێکی سەرنجڕاکێش بەدی دەکرێ، بە تایبەت لەو شیعرانە کە لە هەولێر دەنووسرێن (بە بێ گشتگیریی) شیعری تاریکاییەکانن، شیعری سێبەرەکانن، شیعر ژێرزەمین و خۆ شاردەنەوەکانن، بە پێچەوانەی ئەو شیعرانەی کە لە سلێمانی دەنووسرێن (شیعری سووك و هەوایین، شیعری رووناکییەکانن، شیعر فەزا واز و فڕین و حەوشەکانن).
ئەگەر دیققەتی تێرمی ڕووناکی، هەتاو، ئاسمان و فەزا کراوەکان لە شیعری رێبین بدەین دەبنە بەڵگە بۆ ئەم قسانەی ئێمە:

تێدەگەم ئەم ڕووناکییە ساختە و کۆپییە،
تەنانەت ئەو خۆرەش لەبەرگیراوەتەوە و
ئێمە مانگی ئەسڵیشمان نەدیوە
یا
دوو کۆتر بووین



لە کاتی فڕیندا
بووینەوە پەڕۆیە سپییەکەی
دەستی جادووگەر.

3ـ شیعر لە دەرەوەی سروشت

دەتوانین بڵێن، سروشت بە مانا ئینتیباعییەکەی ( گۆران) بە مانا ڕۆمانسییەکی (زۆربەی شاعیرانی دوای گۆران) لای ڕێبین ون دەبێت، ئەم ونبوونە دەشێ خاوەن دەلالاتی تایبەتی خۆی بێت، ڕەنگە لە ڕێگای هۆشیاریی و ئاگاییەوە نەبێت، بەڵکو دەرئەنجامی جۆرە ژیانێك بێت، نەمەتێك بێت و دواتر لە نووسین ڕەنگبداتەوە.

کاتێك باسی سروشتیش دەکەین، باسی لە جیهانبینییەکی شیعرانەش دەکەین: ژن دەکەوێتە نێوانی سروشت و شاعیرەوە. بەو مانایەی شاعیر سروشت بەکاردەهێنێت بۆ ڕامکردنی ژن، بۆ دەستەمۆکردنی، بۆ ئەوەی زیهنییەتی خۆی لە ڕێگای شیعرەوە بۆ ژن بەیان بکات. وەکو ئەوەی شیعر داونانەوە بێت بۆ ژن، بەڵام لای ڕێبین ئەم حاڵەتە نابینرێت. ژن وجوودی نییە، سێبەرێك هەیە دێت و ئاوا دەبێ، ئارەزوویەك هەیە وەکو پەڵە هەورێك دەبارێت و نابارێت. دەیەوێ ژن بکاتە قوربانی شیعر نەك شیعر بکاتە قوربانی ژن.

گۆی زەویم بچووك کردەوە
ئاوی هەموو ڕووبار و دەریاکانم کردە پەرداخێك ـ خواردمەوە
درەختەکانم وەك سەوزە هەڵلوشین
چیاکان وەك کێك ـ ئاژەڵەکانیش،
مرۆڤەکان نا،
من لەبەر ئەوان زەمینم بچووك کردەوە!

ڕەنگە نەبوونی سروشت بۆ دوو هۆکار بگەڕێتەوە، یەکەمیان پشتکردن لە شیعری ڕۆمانسی کە ڕۆڵی ڕاژەنینی خەون و هەست و ئارەزوکانی دەبینی؛ دووەم هەستکردن بە سروشتی کوردستانی دوای ڕاپەڕین: سروشتێکی وێرانە، گوندەکان ڕاگوێزراوەنەتەوە و سروشتیش هێندە دژ ئینسان لە کاردایە، هێندە فەزا و ژینگەیەکی تەندروست نییە. لەم چەند دێڕەی خوارەوە ئەم هەستەمان لە لای بەرجەستە دەبێ:

گوندنشینان لەبری ئەوەی بڕۆنە ڕێواس و کەنگر و کاردی






لە زەوی پڕ لە ئەڵغامدا کەمێك هەوا  دەڕنن
تا ساڵ دەڕوا بەیەکەوە لە زەرفێکدا هەناسە دەدەنەوە

بە بۆچوونی ئێمە ئەمە حالەتێکی تەندروستییە لە شیعری کوردی، چونکە هەمیشە سێکوچکەی (ژن  و سروشت و شاعیر) بوونی خۆی سەپاندووە، تەنانەت هەندێجار بە بارستاییەکی زۆرەوە خۆی سەپاندووە. بارستاییەکە لە حیرمانی کۆمەڵایەتییەوە هاتۆتە بەرهەم، نەك لە رێگای ئەلشیمییەکی شیعرییەوە بووبێت.

شیعری کوردی بە دەگمەن وێنەی وەکو: "ژنە مەمك رەشەکان خۆر دەدۆشن"ی تیا دەبینیرێت، هەندەی لە تابلۆیەك دەکات، هەندە گوزارشت لە ئارەزوویەکی چەپێندراو ناکات. بۆیە گرینگە لەم دیدەوە "ژن" و "کچ" لە شیعری رێبین بخوێندرێتەوە.
گوڵدانێکی گەورە بە بەردەممدا رەت بوو:
پیکابێك دواوەی پڕبوو لە کچ،
لە کار دەهاتنەوە.
تەنانەت کاتێك دەیەوێ چیرۆکی عیشقی "شیرین وفەرهاد"یشمان بە شیعر بۆ بنووسێتەوە، تەواو لە توێژە باوەکەی دایدەماڵێ، واتە عیشق هەمیشە لە جیابوونەوە و ئازار و سوێ بوونەوە و مەرگ پێکهاتبێ. ئەو بە جۆرێکی دیکە ئەم عەشقەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

شیرین و فەرهاد بەم جۆرە

ئاو لەنێو دڵی درەخت
چیرۆکێك دەنووسێ:

بەنێو دارەکاندا ڕایاندەکرد
قا .. قا.. پێدەکەنین
بەردەبوونەوە و
عەشق هەڵیدەگرتنەوە،
بەنێو مندا پەڕینەوە
کچە شێوە فریشتەکە خلیسکا
لە مندا خنکا..
ئێستا کوڕەکە بووە بە پشکۆیەك لە دەوری ڕووبارەکە
عەشق هەروا جۆشی دەدا و گڕدەگرێ
دەمێکی تر ئەو درەختەش
دەسووتێ،
هەموو دارستانەکەش...!

شاعیر دەبێتە ئەو بوونەوەرە غەریبەی کە هەموان جێیدەهێڵن؛ بە تەنها لە رێگاوبانەکان... لە کۆتاییدا، مردن لە رێگاکاندا زۆر بەهادارترە وەکو مردن لە خەستەخانەکاندا ؛
بێ دایك و بێ کەس کەوتوومەتە ناو شەقامە تاریکەکان.

